# مێژووی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەمریکا

فریشته نورانی
و. هەورامان فەریق کەریم

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● مێژووی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەمریکا

● نووسەر: فرشته نورائی، (مامۆستای زانکۆی تاران)

● وەرگێڕانی: هەورامان فەریق کەریم

● نەخشەسازیی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی

● بەرگ: ئاسۆ مامزادە

● ژمارەی سپاردن: ٢٩٧

● نرخ: ٤٠٠٠

● چاپی یەکەم : ٢٠٠٧

● تیراژ: ١٠٠٠

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

زنجیرەی کتێب (٢١٨)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێرست

پێشەکی نووسەر ........................ ١
**بەشی یەکەم:** کۆچکردن و نیشتەجێ بوون ........................ ٥
**بەشی دووەم:** شۆڕش و سەربەخۆیی ........................ ٣٧
**بەشی سێیەم:** کۆماری تازە بونیادنراو ........................ ٥٩
**بەشی چوارەم:** دیموکراسیی و چارەنوسی یەکلاکەرەوە ........................ ٧٩
**بەشی پێنجەم:** کۆمەلایەتی و شەڕی ناوەخۆ ........................ ١٠٣
**بەشی شەشەم:** ئەمریکای پیشەسازی ........................ ١٣٧
**بەشی حەوتەم:** سەردەمی روداوە پێشکەوتن خوازیەکان ........................ ١٦٥
**بەشی هەشتەم:** : فرانکلین رۆزفلت و پلانە چاکسازیەکان ........................ ١٩١
**بەشی نۆیەم:** ئەمریکا لە نێو گێژاوی سیاسی و سەربازیدا ........................ ٢٠٩
**بەشی دەیەم:** پڕ لە ئازارو گۆڕانکایە کۆمەلایەتییەکان ........................ ٢٢٩

باتو یاد هیچ کس نبود روا

قطره دانش که بخشیری زپیش

متصک گردان به دریاهای خویش

پێشکەشی دەکەم بە:

- دایك وباوكی بەرێزو ماندوونەناسم.

- هاورێ خۆشەویستەکانم، هەروەها برای بەرێزم کاك ئەکرەم باراما کـە هەر لە منداڵیەوە وەك مامۆستایەکی دڵسۆز ئاراستەی کردووم.

* زۆر سوپاسی هەموو ئەو خۆشەویستانە دەکەم کە هاندەرو یارمەتیدەرم بوون، بە تایبەت بەرێزان دکتۆر قادر محمد، مامۆستا عەلی کەریم کەپێداچوونەوەی کتێبەکەیان گرتە ئەستۆی خۆیان و مامۆستا سروە عوسمان و مامۆستا موسلح نیروانی و مامۆسا مراد حکیم و کاك سۆران بهاو...

# پێشەکی

ئەم کتێبە کە لەناوەڕاستی سالآنی حەفتاکانی سەدەی بیستەم لەلایەن (د.فرشتە نوداتی)یەوە نووسراوەو مێژووی گۆڕانکاریە کۆمەلآیەتی و سیاسیەکانی ئەمریکا هەر لەسەرەتای سەدەی شانزدیەمەوە تا دوای ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی بیست لەخۆ دەگرێ، زانیاری بەسودی لەسەر مێژووی ئەمریکا بەتایبەت مێژووی سیاسی تێدایە، ئەم کتێبە، پێدەچێ نووسەرەکەی هەر لە ئەمریکا نووسیبێتێ و، لەنزیکەوە مامەڵەی لەگەڵ ماددەی خاوی بابەتەکەی کردووە، هەروەها سەرچاوەی جۆراوجۆری بەکارهێناوە، بەپوختی بابەتەکانی خستۆتەروو و شیکردنەوەی بۆکردوون و تێگەیشتنیان ئاسانە، هەرئەم تایبەتمەندیانەش وایان کرد، کە کتێبەکە وەربگێڕرێتە سەر زمانی کوردی.

بە زمانی کوردی لەبارەی مێژووی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەمزانیوە، هەتا بەم دواییانە، نووسراوێك چ وەرگێڕدراویان دانراو هەبێ ، کە ڕابردووی ئەو ولآتەی بەشێوازێکی دیرۆکی زانستیانە لە خۆگرتبێ وبشێ توێژەران و هەڵوەدایانی ئەو بوارە، پشتی پێ ببەستن. بۆیە وەرگێڕانی ئەم کتێبە، هەرچەندە هەوڵی بەرکوڵ و هەنگاوی بەرایی یە، بەلآم دڵنیاین بەرهەمی دیکەی ـ لەو بوارەدا ـ بەزمانی کوردی بەدوادا دێ و بابەخدەران بەمێژووی ئەمریکا لێی بەهرەمەندو لە بەرامبەرکۆششی وەرگێڕدا سوپاسگوزارو ڕەزامەند دەبن.

نێوەڕۆکی ئەم کتێبە چ گرێ و گۆڵ و کەندو لەندی وای تێدانین کە پێویستیان بەشیکردنەوەو شەت و کردن بێ و ئەقڵ لە ئاستیاندا هەڵوەداو سەراسیمەو دەربەست بێ، بەڵکو بەزوبانێکی سادەو دەربڕینێکی ڕوان و پاراو نووسراوە. ئەمە زۆرلە وەرگێڕانە

کوردیەکەدا دەردەکەوێ، کە وەرگێڕی کتێبەکە ئەوەندەی دیکە، بەرەنج و کۆششی خۆی، لە بارو لەبەر دلانی کردووە.

لەسالی خوێندنی ٢٠٠٥-٢٠٠٦ کە گەلاڵەی ئەرکەکانی خۆمان لە بەشی مێژوو دادەڕشت، لەو وەختەوە دانان وەرگێرانی کتێبی جۆراوجۆری مێژوویی کە بەتایبەتی سەرچاوەی گرنگی بابەتەکانی خوێندنی بەش بێ، ئەوا خرانە بەرنامەی کارەوە و بەئەرکی ئەکادیمیانەی خۆمان زانی کە لەو بوارەدا کاربکەین و، بۆئەوەش مامۆستایان و قوتابیانمان هانداو سەرەتای کارەکانمان خۆشبەختانە بەگەرم و گوڕی دەستی پێکردو تانهۆ هەنگاوی باشمان ناوەو ئۆبەرەی ئەو کارە بەبایەخە، ئەم کتێبەی بەردەستتانە، کە سەرچاوەیەکی بەپێزی قوتابیان وتوێژەرانی مێژووە و لەکتێبخانەی کوردیدا جێگای شیاوی خۆی دەکاتەوە.

وەرگێڕانی ئەم کتێبە کەلەلایەن قوتابی ئازیز، کاك هەورامان ئەنجام دراوە، زمانی فارسی دەزانێ و لەم وەرگێڕانەشیدا دیارە کە شارەزاییەکی باشی لە زمانی کوردی هەیە و زۆر وەستایانە و بەسەلیقەوە وشەو دەستەواژەی کوردی بەکارهێناوە، کە بۆ وەرگێڕێکی گەنجی لە کاك هەورامان، هەروا کارێکی ئاسان نەبووەو ماندووبوون و شەونخوونی ویستووە. بۆ یەئەنجامدانی کارەکەی بەسەرکەوتوویی ئومێد بەخشە و بریا زۆری دیمان هەبان و توێژەران و قوتابیانمان چاویان لێ کردباو بەهرەو شایستەیی خۆیان نەشاردبایەوە.

هیوادارم خوێندکاران و توێژەرانمان سوودی زۆر لەم کتێبە وەربگرن و ببێتەسەرەتایەکی باش بۆ بە ئەنجام گەیاندنی پرۆژەو کاری دیکەو، دڵنیاین مامۆستایان و قوتابیان و پسپۆڕانمان لەو بوارەدا قۆلی لێ هەڵدەماڵن و بناغەیەکی نوێ بۆ بەکوردیکردنی هەرچی زیاتری سەرچاوەی دیکە دادەنێن و سەرکەتن هەر لە خواوەیە.

**د. قادرمحمدحسن**

**سەرۆکی بەشی مێژوو- کۆلێژی ئەدەبیات**

**زانکۆی سەلاحەدین**

## پێشەکی نووسەر

ئەو گۆڕانکاریەی کە بە درێژایی ڕەوتی مێژوویی سی ساڵی کۆتایی پاش جەنگی دووەمی جیهانی هاتۆتە ئاراوە و ئەو رۆڵەی کە ئەمریکا لەم پێناوەدا لە بواری سیاسەتی جیهانی دا گێڕاویەتی، پێویستی بە ئاگا بوونی زیاتری ئێمە دەربارەی ئەو وڵاتە و ناسینی ئەو گۆڕانکاریانە دەسەلمێنێت. ئەم بەرهەمە خۆی لە خۆیدا بەشێکە لە زنجیرەیەك بابەتی گرنگ، لە بواری مێژوو و فەرهەنگ و کۆمەڵگەی ئەمریکاو لێکۆڵینەوە و بلاوکراوە ئەکادیمیەکان لەم بوارەدا، هەروەها گەورەترین نیشانەی دەرك کردنە بە بایەخ و هۆشیاری ئەم گۆڕانکاریە جیهانی یە. چ ئەم ڕووداوە مێژوویی یە نوێ یە بە درێژە پێدەری فەرهەنگی ئەوروپا لێك بدەینەوە، یان ناسنامەیەکی سەربەخۆو هەر هیچ نەبێت دیاری کراوی بۆ دابنێین، پێویستی لێکۆڵینەوە و بە دوا دا چوون دەربارەی ئەمریکا بە باشی هەستی پێ دەکرێت.

ئەمریکا، میراتگری شارستانیەتە جیاوازەکانە، ئەوروپا کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی لەسەر گۆڕان و پشت ڕاست کردنەوەی هەبوو، هەروەها ئەفریقا لە بتەو کردنی بونیادەکەیدا بەشداری کرد و لەماوەی چوار سەد ساڵدا، ئەمریکا لە قۆناغێکدا کە داگیرکەیەك زیاتر نەبوو، لە شێوەی زلهێزێکی جیهانی دا دەرکەوت و، کاریگەری لەسەر گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگاکانی تر و شێوازی ژیانی خەڵکی وڵاتە جۆربەجۆرەکان دروست کرد و، سیاسەتی جیهانی لە چوار چێوەی بیر و بۆچونەکانی خۆیدا ئاڕاستەو ڕێنمایی کرد.

هیچ کۆمەڵگەیەك وەك ئەمریکا، بیرۆکەی پێش کەوتنی بە بەشێك لە هزری کۆمەلایەتی خۆی و بیرۆکەی ئازادی و یەکسانی بالاتر لە ئیمتیازاتی نەریتە باوەکانی کۆمەڵگەکەی دانەناوە. لە لایەکەوە بۆتە پەناگایەك بۆ هەڵهاتن لە دەست درێژی یە سیاسی و مەزهەبیەکان و، لەلایەکی ترەوە ئارچەیەك کە مزگێنی چاکتر بوونی مەرجەکانی ژیانی ماددی و دەرفەتی پێش کەوتنی بە تاکێکی ئاسایی داوە.

فەرهەنگی ئینگلیزی بونیادی حکومەت و کۆمەڵگەی ئەمریکای ڕەنگ ڕێژی کرد و، ژینگەی جوگرافیای، بارودۆخی سروشتی، فراوانی کیشوەری، سنورە گۆڕاوەکان، شەپۆلی کۆچ کردنە یەك لە دوای یەکەکان، ئەو هەموو گۆڕانکاریە جۆراو جۆرەی لێکەوتەوە، و هێدی هێدی بناغەی کۆمەڵگەیەکی نوێ ی دامەزراند کە بە بەردەوام بوونی فەرهەنگی ئەوروپی، تایبەتمەندیەکی تەواوی ئەمریکایی وەرگرت. بزاوتی کۆمەڵایەتی، متمانە بە ئایندە، عەشق بۆ ئازادی، حەز کردن بە ئەزمون و تاقی کردنەوە، گوڕ و تین بەرەو خۆ پێگەیاندن و، هەوڵدان لە پێناو خۆشگوزەرانی ماددی بە تێکڕا کاریگەریان لەسەر گۆڕانی ئاسۆی کۆمەڵایەتی ئەمریکا هەبوو .

تێکڕای ئەم دیاردە کۆمەڵایەتیانە، واتە گرنگی دان بە زانست و پیشەسازی، باوەڕ بە پێشکەوتن و بەردو پێشەوە چوون، جەخت کردنەوە لەسەر لێهاتوویی تاك لەگەڵ ئازادی و ناسینی مافی شارستانی و، کاریگەری گروپە جۆراو جۆرەکانی کۆچبەران لەسەر یەکتر، دەستیان دایە دەستی یەکترو تایبەتمەندیەکانی کەسایەتی ئەمریکایی و فەرهەنگی تایبەت بەژیانی کۆمەڵایەتی ئەمریکایان دروست کرد. کۆمەڵگەی ئەمریکا بوویە نمونەی ئەزموونێکی گرنگ لە بواری حکومەتی دیموکراسی سیاسی دا.

شۆڕشی ئەمریکا لە جۆری بزوتنەوە ئازادی خوازیەکانی چینی مام ناوەندی کۆمەڵگەیە، لە گرنگترین بەرهەمەکانی، دیموکراسی سیاسی و چەسپاندنی (مشروگیت) ی دەسەڵاتی دەوڵەت بوو. پشت و پەنای فەلسەفەی دیموکراسی سیاسی، باوەڕ بە بونیادی تاك ، ئازادی یە کۆمەڵایەتیەکان، مافی شارستانی و، حکومەتی میللی یە، کە لە قانونی ئەساسی دا ڕەنگی داوەتەوە. سەرکردایەتی ئەمریکا هەوڵی دەدا کە قانونی ئەساسی دەرهاویشتەی ڕێسا و یاسایەك بێت کە دەسەڵات بەسەر پەیوەندیەکانی نێوان میللەت و دەوڵەت لە لایەکەوەو هەروەها سیستەمی دەوڵەت دابگرێت ـ بەو هیوایەی کە دەسەڵاتی کۆمەڵگە فراوان و بێ سنور بێت، بەڵام لێپرسراو و هەڵسوڕێنەرانی بەهێزی ملکەچ کردنیان بۆ یاسا بچوك و سنوردار بێننەوە. باوەڕ بە دەنگی زۆرینە، حکومەت لە ڕێگای هەڵبژاردنەوەو، جەخت کردنەوە لەسەر یەکسانی تاکەکان لە بەرامبەر یاسادا، بەشێك لە سیستەمی دیموکراسی سیاسی ئەمریکا پێك دەهێنێت.

دیموکراسی سیاسی له بنچینه‌دا حکومه‌تی چینی ناوه‌نده. کۆمه‌ڵگه هه‌مان ئه‌ندازه که باوه‌ڕی به بناماکانی مه‌رج داربوونی ده‌سه‌ڵاتی ده‌وڵه‌ت، حکومه‌تی یاسا و مافی کۆمه‌لایه‌تی تاك هه‌یه، به‌هه‌مان ئه‌ندازه‌ش جه‌خت له‌سه‌ر خاوه‌نداریتی تاکه‌که‌سی و داهێنانی ئابوری تاك له‌سه‌ر مایه گوزاری تایبه‌تیدا ده‌کاته‌وه.

خوێندنه‌وه‌ی مێژووی ئه‌مریکا به‌شێکی زۆر فراوانه که له ڕووی لایه‌نه جۆر به جۆره‌کانی سیاسی، ئابوری، فه‌رهه‌نگی و هونه‌ری یان به واتایه‌کی تر ته‌کنه‌لۆجی یه‌وه گرنگیه‌کی زۆری هه‌یه. هه‌ڵبه‌ت تێڕوانینی مه‌مله‌که‌ته جیاوازه‌کان بۆ ئه‌مریکا له ڕووی چییه‌تی مه‌سه‌له‌کانی ئه‌و کۆمه‌ڵگانه و په‌یوه‌ندیان له‌گه‌ڵ ئه‌و ولاته‌دا جیاوازه، تێڕوانینی کۆمه‌ڵگه‌ی ئه‌وروپای پیشه‌سازی بۆ ئه‌مریکا به‌دڵنیایی یه‌وه له‌گه‌ڵ هه‌ڵسه‌نگاندنی ئه‌و کۆمه‌ڵگانه‌ی که تازه به‌ره‌و کاریگه‌ری ته‌کنه‌لۆجیا و گۆڕانی ئابوری هه‌نگاو ده‌نێن و، یان ولاتانی ئه‌فریقی که تازه جاری سه‌ربه‌خۆییان داوه، جیاوازه .کاریگه‌ری ئه‌مریکا له‌سه‌ر کۆمه‌ڵگه‌کانی ڕۆژئاوا یان ڕۆژهه‌لات، به‌ئاشکرا هه‌ستی پێ ده‌کرێت.

بلاوکردنه‌وه‌ی کتێبه جۆر به جۆره‌کان و، لێکۆڵینه‌وه گه‌وره‌و فراوانه‌کان ده‌رباره‌ی لایه‌نه جۆراو جۆره‌کانی مێژووی ئه‌مریکا بایه‌خ و گرنگی ئه‌و دونیا نوێ یه‌مان بۆ ده‌رده‌خات.

له‌ژیانی ئه‌مرۆدا ڕووداوێکی نوێ له بواری لێکۆڵینه‌وه‌ی مێژوویی دا به‌رچاو ده‌که‌وێت و شێوازێکی زانستی دیاری کرا و بۆ گه‌یشتن به‌م ئامانجه به‌کار ده‌هێنرێت، بۆ ئه‌وه‌وه‌ی شیته‌ڵ کردن و شیکردنه‌وه‌یه‌که‌ی ڕوون و ئاشکرا له ڕابردوو بدات به‌ده‌سته‌وه.

ئه‌و کتێبه ڕه‌نگاو ڕه‌نگانه‌ی که ده‌رباره‌ی مێژووی ئه‌مریکا له‌م ساڵانه‌ی کۆتایی دا بلاو کراونه‌ته‌وه، چیرۆکێکی ڕاسته‌قینه‌ی ئه‌م گۆڕانکاریه ئه‌کادیمیه نوێ یه ده‌گێڕنه‌وه. لێکۆڵینه‌وه‌ی پسپۆڕانی ده‌ره‌کی سه‌باره‌ت به ئه‌مریکا، نیشانه‌یه‌کی دیکه‌ی بایه‌خی خوێندنه‌وه‌ی گۆڕانکاریه‌کانی ئه‌م ولاته‌یه. هه‌موویان تێڕوانینێکی پۆزه‌تیڤیان بۆ ئه‌مریکا نه‌بووه، به‌لام ئه‌م ولاته‌یان به خاوه‌نی وه‌ها عه‌جایباتێك که له باره‌یه‌وه چه‌نده‌ها لێکۆڵینه‌وه‌و سه‌رنجیان پێشکه‌ش کردووه. ((ئه‌لکسیس دۆتۆکویل)) و ((جیمس برایس)) له‌سه‌ده‌ی نۆزده‌یه‌م، ((دنیس بروگان)) و ((هارۆڵد لسکی)) له‌سه‌ده‌ی بیسته‌م، له‌و جۆره که‌سانه‌ن.

ئەم کتێبە بەرھەمی چەند لێکۆڵینەوەیەکە کە بە سوود وەرگرتن لە دەرفەتی خوێندنەوە لە زانکۆی ییل ئەنجامم داوە. لە نوسینەوەی دا سوودێکی زۆر لە نوسینەکان و بەرھەمی مێژوو نووسانی ئەمریکی وەرگیراوە. ھەوڵ دراوە کە مێژووی ئەمریکا بە لەبەرچاو گرتنی گۆڕانی ڕووداوە فکری و کۆمەڵایەتیەکان ھەڵ بسەنگێنرێت.

لە زانکۆی ییل سودێکی زۆرم لە بیر و ڕاو ڕێنمایی یەکانی مامۆستایانی ئەم بەشە وەرگرتووە و بەتایبەت پرۆفیسۆر ((جۆن بلوم)) پرۆفیسۆر ((ڕابین وینکز)) و پرۆفیسۆر((دانیەل ئارون)) مامۆستای زانکۆی ھاروارد کە زۆر سوپاسیان دەکەم. بۆ ڕێك خستنی ووردەکاریەکانی ئەم کتێبە بەڕێز غولامڕەزا شکوھی دەرچووی بەشی مێژووی زانکۆی تاران ھاوکاری یەکی زۆری کردووم و سوپاسی ئەویش دەکەم.

**فریشتە نورائی**

# بەشی یەکەم:

## کۆچکردن و نیشتەجێ بوون

لەسەدەی دەیەمی زاینییەوە گەشتکردن بەرەو قارەی ئەمریکا لە لایەن گروپە دەریاوانەکانی ((وایکینگ))ەوە کە لە باکوری ئەوروپا و ئۆقیانوسی ئەتلەسیدا نیشتەجێ بوو بوون دەستی پێ کرد، بەڵام ئەم گەشتانە زۆر سەرنج ڕاکێش نەبوون و، جگە لەوەش ئەوروپیەکان زیاتر بایەخیان بە وڵاتانی ڕۆژهەڵات دەداو شەڕی خاچپەرستەکانیش ڕۆژئاواییەکانی تاسەدەی سیانزەهەم بە خۆوە سەرقاڵ کردبوو.

﴿دەکرێ بڵێین﴾ گۆڕانکاری نوێ ی سەرمایەداری، بە هۆکارێکی کاریگەر دادەنرێ لە سەفەرەکەی ((کریستۆف کۆلۆمبز))دا بۆ بەدەست هێنانی ماڵ و سامانێکی فراوان ـ کە دۆزینەوەی نابوری و ڕامیاری کیشوەری ئەمریکایی بە دواوە بوو. شەڕی خاچپەرستەکان، هۆکاری ئاشنا بوونی ئەوروپیەکان بوو لەگەڵ ژیان و ژیاری ڕۆژهەڵاتدا. هەروەها شارەکانی تری ئیتالیا خاڵی پەیوەندی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوون لە ڕووی بازرگانیەوە. سەفەری بازرگانەکانی ئیتالیا بەرەو ڕۆژهەڵات بەتایبەت سەفەرەکەی ((مارکۆ پۆلۆ)) بەرەو چین، سەرنجی وڵاتانی ئەوروپای بۆ لای خۆی ڕاکێشا. مەبەستی سوود و بەرژەوەندی، بیر کردنەوەی سنور داری سەدەکانی ناوەڕاست و ترسانیان لە ژینگەی نامۆ، ئەوروپیەکانی بەرەو ڕووداو خوازی دۆزینەوەکان زیاتر هاندەدا. پێویستی ڕۆژئاوا بۆ شتومەکی ڕۆژهەڵات، هۆکاری سەرەکی دروست بوونی ئەم پەیوەندیانە بوو. ڕێگاکانی هاتووچۆی بازرگانی کە لە ماوەی چەند سەدەیەکدا پێداویستی یەکانی ڕۆژئاوای لە کەرستەکانی ئاوریشم و بەهارات و بەرهەمەکانی تری ڕۆژهەڵات پڕ دەکردەوە، بەهاتنەکایەی عوسمانیەکان و ڕووخانی ئیمپراتۆیەتی بیزەنتی لە ساڵی ١٤٥٣ دا، داخران. ئەوروپیەکانیش بە مەرامی دەست بە سەرا گرتنی سەروەت و سامانی ڕۆژهەڵات، بە دووی ڕێگایەکی دەریای نوێدا دەگەڕان و پورتوگاڵ، یەکەم وڵاتی

ئەورووپی بوو کە بۆ پەرەپێدان بازرگانی و بەدەست هێنانی بەرهەمی ڕۆژهەلات، دەستی دایە دۆزینەوە دەریاییەکان و، لە هەمان کاتدا کۆتا ولاتیش بوو، کە بەو پەڕی حەسرەتەوە زەویە بەدەست هێنراوەکانی بەجێ هێشت.

شازادە (( هێنری ))، ناسراو بە دەریاوان، یەکێك بوو لە هاندەرانی دەریاوانی و دۆزینەوە جوگرافیەکان . ناوبراو، ناوەندێکی بۆ توێژینەوەی ئەستێرە ناسی و لێکۆلینەوەی جوگرافی و دروست کردنی کەشتی دامەزراند.

[لەهەنگاوێکی تردا] ((بارتلمو دیاز)) لە گەشتێکدا کە دەوری ئەفریقای دایەوە لە ڕێگەی لوتکەوی هیوای چاکە وە،کە بە هیوای چاك ناسراوە، لە سالی ١٤٨٦ ڕێگایەکی نوێ ی بۆ پەرەپێدانی بازرگانی دەریایی پورتوگال دۆزیەوە و، پاش ئەو ((ڤاسکۆ دۆگاما)) لە سالی ١٤٩٨ بەسوود وەرگرتن لەم ئەزموونانە توانی خۆی بگەێنێتە زەویەکانی هیندستان.

ئیسپانیاش پاش جێگیرکردنی هێزی سیاسی ولاتەکەی، لە لایەکەوە بە دروست کردنی پەیوەندی ژن و ژنخوازی نێوان دوو بنەمالەی پاشایەتی و، لەو لاشەوە بە زال بوونی بەسەر موسلمانانذا، توانی بارودۆخی ناو خۆی ولات هێور کاتەوە و، دواتر بۆ فراوانکردنی بازرگانی ولاتەکەی دەستی بە دۆزینەوە دەریاییەکان کرد . شکستی موسلمانان و پاشە کشێ کردنیان لە خاکی ئیسپانیا، هاوکات بوو لەگەل گەشتە مێژوویەکەی ((کۆلۆمبز))دا کە لە سالی ١٤٩٢ بە ئەنجامی گەیاند. لە لایەکی ترەوە ئەو گۆیە جوگرافیەی کە ((بی هایم)) لە سالی ١٤٩٢ دروستی کرد، ماوەی نێوان ئەورووپاو ئاسیای لە ڕووی ڕۆژئاواوە نزیکتر کردەوە هەر ئەمەش هانی ((کۆلۆمبز)) و دەریاوانەکانی تریدا ،کەلە ڕێگەی ڕۆژئاواوە دەستیان بگەێننە هند و زەویەکانی ڕۆژهەلات.

پورتوگال و ئیسپانیان، کە تا ماوەیەکی زۆر بە حەسرەتەوە بینەری چالاکیەکانی ئیتالیا لە بازارەکانی ڕۆژهەلاتدا بوون، بە سوود وەرگرتن لە ئامێرە پێشکەوتوەکانی دەریاوانی بیریان لە ڕێگایەکی کورت تر بەرەو هندستان دەکردەوە.

((کریستۆف کۆلۆمبز)) و هاوەلەکانی چوار گەشتیان بەرەو ئەمریکای مەرکەزی ئەنجامدا و، زۆربەی دوورگەکانی دەریای ((کاریبی)) و کەنارەکانی باکوری ئەمریکای باشور لە هندۆراسەوە تا پەنەمایان کەشف کرد. ئەم گروپە وا هەستیان دەکرد کە توانیویانە بەشێك لە ئاسیا بدۆزنەوە و، دانیشتوانەکەیان بە هێندی پێناسە کرد و تەنانەت بەشێك لە دورگەکانی دەریای ((کاریبی)) یان بە هندی ڕۆژئاوا ناو دەبرد.

بەم شێوەیە گەشتە یەك لە دوای یەكە دەریاییەكان پاش سەفەرەكەی ((كۆلۆمبز)) شێوازێكی نوێ یان بە خۆوە گرت. كەسێكی خەڵكی فلۆرانس بەناوی ((ئەمریكۆ فسپۆچی)) كاتێك كە لە ساڵەكانی نێوان ١٤٩٧ ـ ١٥٠٥ دا سەفەرێكی بۆ ئەم ناوچانە كرد بوو، دڵنیا بوو لەوەی كە ناوچەیەكی نوێ ی دۆزیوەتەوە، كە لە هەموو ڕویەكەوە لەگەڵ هندا جیاوازی هەیە ، پاشان ووتارێكی بە ناوی ((دونیای نوێ)) بڵاو كردەوە و، دواتر لە لایەن جوگرافی ناسی ئەڵمانی (( ڤالدرز مولەر)) هوە چاپكرا و، هەر ئەویش بوو پێشنیازی كرد، كە وا ناوچە تازە دۆزراوەكە بەناوی (( ئەمریكۆ فسپۆچی ))ەوە ناو بنرێت.

دەستەی دۆزەرەوەی ئیسپانی بەرابەرایەتی ((ماجەلان))، لە ساڵی ١٥٢٠ لە ئۆقیانوسی ئەتلەسیەوە خۆی گەیاندە ئۆقیانوسی ئارام و، بە ئارامیشدا گوزەری كرد و لە كۆتاییدا توانی پێ بخاتە نێو دورگەكانی فلیپینەوە، هەرچەندە [ ئەم سەفەرە كۆتایی بەتەمەنی ماجەلان هێنا] بەڵام ئەندامانی گروپەكە لەسەر گەشتەكەیان هەر بەردەوام بوون و دواتر لە ڕێگەی ئۆقیانوسی هیندیەوە گەڕانەوە بۆ ئیسپانیا. بەم شێوەیە دەریا وانەكان توانیان بۆ یەكەم جار بە دەوری گۆی زەویدا بسوڕێنەوە و هەر ئەم زانیاریە نوێ یانەش یارمەتیدەرێكی باشبوون بۆ جوگرافی ناسان، بۆ ئەوەی بتوانن نەخشە كانیان بە شێوەیەكی ڕاستر و وێنە بكێشن.

هەرچەندە ((كۆلۆمبز)) و هاوەڵەكان، لەم بەشە گرنگەی جیهاندا شتێكی پایە بەرزو مەزنی وەك زەویەكانی ڕۆژهەلاتیان نەدۆزیەوە، بەڵام ئەم ناوچانە لە هەموو ڕویەكەوە بۆ ئیسپانیەكان جێگەی سەرنج و بایەخ بوون. پیاوە ئایینیەكان زەویە دۆزراوەكانیان كردە شوێنێكی تازە بۆ بڵاو كردنەوەی ئایین و بانگەیشت كردنی خەڵكی بۆ ئایینی مەسیحییەت. حكومەتی ئیسپانیا [هەر لە سەرەتاوە] ئەم زەویانەی بەسەر چاوەیەكی نوێ بۆ پڕكردنی خەزێنەی دەوڵەت لە زێڕ و زیو لێك دەدایەوە و، پیاوە گەورەكان، كەشەر و شۆڕیان كرد بووە پیشەی هەمیشەی خۆیان و بەتاڵ و وەتاڵ مابوونەوە، بە مەرامی بەدەست هێنانی سەروەت و سامان بەرەو ئەم ناوچانە شۆڕ بوونەوە، بەم شێوەیە فراوان خوازە ئیسپانیەكانیش ڕوویان كردە زەویە تازە دۆزراوەكان و سەروەت و سامانی ناوچەكەیان لە نێوان خۆیان و پورتوگالیەكاندا دابەش كرد. پاپا ئەلێكساندەری شەشەم بەناوی كلێسەوە داوای تێكڕای زەویە كە شفكراوەكانی كرد، بۆ ئەوەی بیانخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوە، بەڵام لە ساڵی ١٤٩٢ بەرەسمی دانی بە دەسەلاتداریتی ئەو ولاتانە بە سەر ئەم زەویانە دانا، پورتوگال ناوچەی ڕۆژهەلاتی ئەمریكای باشوری ـ كە بە بەرازیل ناو دەبرا ـ بەركەوت و، ئەوەی مایەوە درایە پاڵ ئیسپانیا.

ولآتی فەرەنساش کەتا ئەم ساتە وەختە هیچ سودێکی لەم دەفەتە وەرنەگرتبوو، (( ژاك کارتیە)) ناوێکی بۆ (( دونیای نوێ )) نارد و، ئەویش توانی سەرەتای کەنداوی سن لۆران بەناوی فەرەنساوە کەشف بکات. لە لایەکی ترەوە (( هێنری حەوتەم)) پادشای بەریتانیا ئیتالیایی یەکی بەناوی ((جان کابوت)) رەوانەی کەنارەکانی زەریای ئەتلەسی کرد و ئەویش بەشێك لە لابرادۆر تا کەنداوی چزاپیکی کەشف کرد و، بەریتانیا دەست بەسەر راگرتنی ئەم ناوچانەی لەسەر بنچینەی دۆزینەوەکانی (( کابوت )) راگەیاند.

یەك ئەوە دوای((کۆلۆمبز)) چەند رووداوێك لەو ئەوروپا روویاندا، کە کارگەریەکی راستەو خۆی لەسەر (( دنیای نوێ )) هەبوو، ئەویش راپەرینی ریفۆرم و چاکسازی مەزهەبی لە سالی ١٥١٧ و، دامەزراندنی کلێسەی پرۆتستانت بوو.

هەرچەندە (( جان کابوت )) لە سەردەمی ( هێنری حەوتەم )) دا کە نارەکانی رۆژهەلاتی ئەمریکاری باکوری دۆزیەوە و بەلآم کۆچکردنی ئینگلیزەکان بۆ ئەم کیشوەرە یەك سەدە دواتر بە ئەنجام گەیەنرا. ئەو فاکتەرانەش کە کارگەریەکی راستەو خۆیان لەسەر دورست کردنی داگیرگەکانی بەریتانیا هەبوو بریتی بوو لە :

-گۆرانکاری تیجارەت و شۆرشی بازرگانی.

-گۆرانکاری لە کشتوکالدا.

-چاکسازی مەزهەب.

گەشە سەندنی بازرگانی ئینگلیز و دامەزارندنی کۆمپانیا بازرگانیەکان لە سەدەی شانزدەدا ، کارگەریەکی راستەوخۆیان لە سیاسەتی فراوانخوازی ئەو ولآتەدا هەبوو. دەستەی ئکتشافی بەریتانی کە بە دوای رێگایەکی گونجاو تر لە باکوری رۆژهەلآتی ئەوروپادا دەگەران، لە سالی ١٥٥٣ توانیان دەریای سپی لە کەنارەکانی روسیا بدۆزنەوە و، بازرگانانی ئەو وولآتە سەفەرکردنیان لەم رێگەیەوە بەرەو روسیا دەست پێ کرد و، لە رۆژەوە ((ئارخانگل)) وەك بەندەرێکی بازرگانی لە کەناری زەریادا ناوبانگی دەرکرد. بۆ زیاتر پەرە پێدانی بازرگانی، حکومەتی ئینگلیز ((کۆمپانیای بازرگانی مۆسکۆی)) دامەزراند و بە مەبەستی جێگیر کردنی بازرگانیەکەی لە رۆژهەلاتی دەریاری ناوەراست، سالی ١٥٩٢ (( کۆمپیانیای بازرگانی لوانت))ی خستە کار و، دوای ئەو دامەزراندنی ( کۆمپانیای هیندی رۆژهەلات ))لە سالی ١٦٠٠ بوو بە فاکتەرێکی سەرەکی لە پەرەسەندنی بازرگانی حکومەتی ئینگلیز لە هندستاندا. هەر ئەم گۆرانکاریە بازرگانیەش هۆکاری سەرکەوتنی بازرگانانی ئەو ولآتە بوو

بەسەر بازرگانە ئەڵمانی و ئیتاڵیەکاندا. لە ئەنجامدا خوری بەریتانیا کە تا ئەم ماوەیەش وەك کەرەستەیەکی خاو بەرەو وڵاتی فلاندەر دەنێررا، بە زیاد بوونی سەرمایەی گەورە بازرگانەکان توانیان سودێکی زۆر باش بۆ بەرهەم هێنانی پارچە لەم دەرفەتە وەربگرن و لەبری ئەوەی خوریەکە وەك ماددەیەکی خاو ڕەوانەی وڵاتی فلاندەر بکەن، خۆیان ببنە مەڵبەندێکی ناردەنی شتومەکی بەرهەمهێنراو بەرەو وڵاتانی دەرەوە.

گۆڕانێکی دیکەی ئابوری ئینگلیز، لە بواری کشتوکاڵ کردندا بوو. لە سەدەی شانزەیەمدا ڕاپەڕینێکی نوێ لەو وڵاتە سەری هەڵدا. کە بووە هۆی زیاد بوونی دەسەڵاتی سەرمایەدارەکان. چینی دەسەڵاتدار کە هێزی پەرلەمانی ئەو کاتەیان پێك دەهێنا، چەند یاسایەکیان دەرکرد کە بە هۆیەوە زەوی یە کشتوکاڵیەکانی سەرمایەدارە گچکەکانیان بە پێدانی بڕێك پارە دەکڕی و، خۆیان دەبوونە خاوەنی ئەو زەویانە. ئەم یاسایە بە یاسای (چەپەمە) ناوبانگی دەرکرد. یاسای (چەپەمە) هاوکات لەگەڵ پەرەسەندن و پێشکەوتنی ئامێرەکانی بەرهەمهێنانـدا دوو ئەنجامی گرنگی لێکەوتەوە، لە لایەکەوە بووە هۆی زیاد بوونی ڕێژەی بەرهەم هێنان لە بواری کشتوکاڵدا و لە لایەکی ترەوە ژمارەیەکی زۆر لە کۆلکە جوتیارەکانی ئاوارەی شارەکان کردوو، ئەمەش دەبوویە هۆی زیاد بوونی ڕۆژ لە دوای ڕۆژی ژمارەی دانیشتوان لە نێو شارەکاندا. لە ژێر کاریگەری ئەم بارودۆخەدا ئەم بیرۆکەیە سەری هەڵدا کە بە دروست کردنی ژمارەیەك داگیرگەی نوێ ڕێگا بۆ بەشێکی زۆری ئەم جوتیارانە خۆش بکرێت بۆ ئەوەی بتوانن بەرەو ((دونیای نوێ)) کۆچ بکەن و، بەم شێوەیە ڕێگە لە پەرەسەندن و زیاد بوونی ناهاوسەنگی دانیشتوانی وڵاتەکەیان بگرن. لە کاتێکدا کە ئیسپانیا ئەو پەڕی مەرجی تایبەتی لەسەر کۆچبەران دادەناو تەنها ئەو کەسانە بۆیان هەبوو کۆچ بکەن کە لە لایەن دەربارەوە هەڵدەبژێران، حکومەتی ئینگلیز سیاسەتی هاندانی بێ کۆسپ و تەگەرەی بۆ کۆچ کردنی هاوڵاتیان پەیڕەو کرد.

هۆکارێکی دیکەی دامەزراندنی ئەم داگیرگانە لە ئەمریکای باکوور شۆڕشی مەزهەبی ئەوروپای سەدەی شانزەیەم بوو، کە ئەنجامەکەی بە دامەزراندنی کڵێسەی پرۆتستانت کۆتایی پێ هات. لە بەریتانیا پاش ئەوەی (( هێنری هەشتەم )) بە پشت بەستن بە دەسەڵاتی پەرلەمان لە یاساکانی کڵێسەی کاتۆلیکی سەرپێچی کرد و لەگەڵ دام و دەزگاکانی ڕۆم دا پەیوەندی یەکانی بچڕاند. لە ساڵی ١٥٣٤ پەرلەمان یاسایەکی دەرکرد، کە بەهۆیەوە پادشای ئینگلیزی بە بەرزترین سەرچاوەی دەسەڵاتی کڵێسەو بالاتر لە پیاوە ئاینیەکان دادەنا و، هەرچی

سەروەت و سامانی کاتۆلیکەکانیش بوو لە بەرژەوەندی دام و دەزگای حکومەتدا دەستی بەسەردا گیرا. لەسەردەمی دەسەلاتی ((ئیلیزابێتی یەکەم)) دا، کلێسە شکڵ و شێوازێکی نوێ ی بەخۆوە گرت و، پێك هاتەی کلێسەی پرۆتستانتی لۆتەری هاتە کایەوە و، کلێسەی ئینگلیزی بوو بە کلێسەیەکی نێو دەوڵەتی و ژمارەیەکی زۆری خەڵك بەدووی کەوتن، چەند یاسایەکی قورسیش بەسەر ئەو کەسانەی کە سەرپێچی فەرمانەکانی کلێسەیان دەکرد، سەپێنران.

جیا بوونەوە لە کلێسەی کاتۆلیکی دوو ئەنجامی گرنگی هەبوو : بووە هۆی سەرهەڵدانی چەندین بیرو باوەڕی نوێ و چەند دەستەیی لە بنەماکانی دیانەتدا و جگە لەمانەش دەسەلاتی بێ سنووری حکومڕانی کەوتە ژێر گومانەوە. هەموو ئەم بیرکردنەوانە لەگەڵ کۆچبەرە تازە هاتووەکاندا بۆ ((دونیای نوێ)) گوازرانەوە.

ئەم گۆڕانکاریانە لەئەنجامی پێشکەوتنی ئابوری و سەرمایەداری لە ئەورووپادا هاتنە کایەوە و هۆکاری سەرەکی ئەم گۆڕانکاریانەش بۆ پەرەسەندنی بازرگانی بەهۆی دروست کردنی ڕێگای هاتو چۆی بازرگانی دەریایی، دەست بەسەرا گرتنی زەویە دۆزراوەکان و پشتوانی و هاندانی بازرگانەکان دەگەڕێتەوە. سیاسەتی بازرگانی دەوڵەتان لەم سەردەمەدا بریتی بوو لە پشت گیری کردنی بازرگانەکان و دانانی هەندێك یاسا و ڕێسای تایبەت بە ئاڵ و گۆڕکردنی بازرگانی کە ئەمەش دەرگای بۆ هێنانە ناوەوەی زێڕ و زیو لە ولاتە ئەورووپیەکانەوە والا دەکرد.

بیرۆکەی کۆکردنەوەی زێڕ و زیو هێدی هێدی شوێنی خۆی بۆ قوتابخانەیەکی ئابوری سەربەخۆ و بەهێز چۆڵ کرد کە ئەویش دواتر ناوی قوتابخانەی ((مەرکانتالیزم))ی لێنرا ئەم شێوە بازرگانی کردنە بەم جۆرە ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد : بازرگانی هۆکاری زیاد بوونی ماڵ و سامانەو برەو دان بە بازرگانی تەنها فاکتەرێکی بەهێز بوونی حکومەتە. بۆ بەهێز کردنی دەسەلاتی سیاسی، دەوڵەتان پێویستە لایەنی بازرگانی گەشە پێ بدەن، بۆ ئەوەی زەوی یە کۆنترۆڵ بکەن و، هەوڵی زیاد کردنی ناردەنی و پیشەسازی بدەن و لەبەرامبەریشدا ناردەنی کەرەستەی خاو و سەرەتایی کەم بکەنەوە و بە پێچەوانەشەوە هاوردەنی خۆیان تەنها بە هاوردەی کەرەستەی خاو تایبەت بکەن، بەم شێوەیە دەتوانن هاوسەنگی بپارێزن و ولاتان ناچار بکەن کە قەرزەکانیان بە زێڕ بۆ بگێڕنەوە. بەپێی ئەم سیستەمە، حکومەت بە پشیوانی و پارێزگاری کردنی چینی بازرگانان هەرجۆرە دەست تێوەردان و چاودێری کردنێکی ڕاستەوخۆی خۆی لەنێو کاروباری ئابوری دا بەڕەوا دەزانێ و لەگەڵ ئەمانەشدا بەهەموو شێوەیەك هانی دامەزراندنی کۆمپانیا بازرگانی یە جۆر

بەجۆرەکان دەدات. بەناوبانگترینی ئەم کۆمپانیایانە ، کۆمپانیای ((هیندی ڕۆژهەلاتی))یـە، کـە ئینگلیزەکان لـە سـەرەتای سـەدەی حەڤدەیەمـدا دایانمەزرانـد. لەگـەڵ ئەوەشـدا هەریەکـە لـەم کۆمپانیایانە جۆرێك لە دەست تێوەردان و قۆرخ کاریان تێدا پەیڕەو دەکرا. بە واتایەکی تر تـەنها کۆمپانیا تایبەتەکان بوون کە مافی کارکردن و ناڵ و گۆڕ کردنی بازرگانیان پێ درابوو. پێویـست بوو لەسەر ئەم کۆمپانیایانە کە بۆ فرۆشتنی شتومەکی ناوخۆی ولات، بازاڕێك پێکەوە بنێن و لە بەرامبەردا زێڕ و زیو بهێننە ناو ولاتەوە.

سـەرمایەداری بازرگـانی تـا کۆتـایی سـەدەی هەژدەیـەم بـە گـرنگترین و بـاوترین جـۆری سەرمایەداری ئەو کاتە دەژمێررا، بە تایبەتی پاش ئەوەی کە توانیان هێزی ئـامێر لـە بـواری بەرهەم هێنێندا بەکار بهێنن، ئەم سیستەمە زیاتر لە جاران بایەخی پـێ دراو دواجـار گـۆڕانی بەسەردا هاتو و گۆڕرا بەسەرمایەداری پیـشەسازی . بەیارمـەتی ئـەم کۆمپانیـا بازرگانیانـە، سیاسەتی ئیستعماری ولاتانی ڕۆژئاوا لە ئەمریکا و ئاسیادا گەشـەیەکی بەرچـاوی بـە خـۆوە بینی و هەریەکێك لەم کۆمپانیایانەش بوو کە یەکەمین داگیرگەی ئینگلیزی لـە سـاڵی ١٦٠٧ بەناوی ڤیرجینیا لە ئەمریکای باکوردا دامـەزارند. کۆمپانیای ((بازرگانی لەندەن)) سـەد و چـل کۆچبەری بەفەرمانی ((جیمزی یەکەم)) پادشای ئینگلتەرا بەرەو ڤیرجینیا نارد کـە سـی و نـۆ کەسیان پێش ئەوەی بگەنە کەنارەکانی ئـەمریکا گیـانیـان لەدەسـت دا ئەوانـەش کـە مانـەوە شارێکیـان بەناوی جیمز تاون بۆخۆیـان دروسـت کـرد و تیـایـدا نیـشتەجێ بـوون. کۆمپانیـای ((پلیمۆت))یش ئیمتیازێکی دیکەی لەلایەن دەسـەلاتی ئینگلیـزەوە بەمەبەسـتی پەرەپێـدانی بازرگانی پێ بەخشراو، ئەویش لەبەرامبەردا هەوڵەکانی خۆی بۆ هاندانی کۆچ کردن بەرەو ئـەو داگیرگەیە چـڕ کـردەوە. لـەو بڕیـارەدا کـە ((جیمـزی یەکـەم)) بـەناوی کۆمپانیاکانـەوە بـۆ دامەزراندنی داگیرگـەکان و فـراوان کردنـی بازرگـانی لـە ئـەمریکا دەری کـرد، هـاتووە : (( بەنابەرانی ئێمە کە بە مەبەستی نیشتەجێ بوون بـەرەو داگیرگـەکان کـۆچ دەکـەن دەبێـت لـە مافەکانی ئازادی و پارێزگاری یاسایی وەك هەموو هاوڵاتیـەکی ئینگلیـزی بەهرەمەنـد بـن و منداڵەکانیشیان کە لە ئەمریکادا لە دایك دەبن پێویستـە هەمان مافی ئازادیان بۆ دەستە بـەر بکرێتەوە.))

لە ساڵەکانی سـەرەتادا، ژمارەیەکی زۆر لە کۆچبەران بەهۆی برسێتی و نەگونجانیان لەگـەڵ ئەو بارو دۆخە نوێ یەدا بوونـە قوربـانی. لـە سـاڵی ١٦١٩ و بـە مەبەسـتی زیـاتر هانـدانی کۆچکردن لە لایەن کۆمپانیا بازرگانیەکانـەوە، هەنـدێك ئاسـان کـاری لـەبارەی گواسـتنەوەی

خاوەندارێتی زەوی کشتوکاڵی بۆ کۆچبەرە تازە هاتووەکان ئەنجام درا. هەروەها کۆچبەران مافی بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆی خۆیان و پێك هێنانی ئەنجومەنی ناوچەکان و جگە لەوەش بەکارهێنانی مافی ڤیتۆیان لە بەرامبەر بڕیارەکانی کۆمپانیاکاندا پێ درا، کە ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ دامەزراندنی جۆرە حکومەتێکی مەحەللی لەسەر بنەمای ڕاوێژ و ڕاگۆڕینەوە لە داگیرگەکاندا.

کۆچبەرە بەریتانیەکان بەپێچەوانەی بۆچوونی کۆمپانیاکان نەیانتوانی هیچ جۆرە زێڕ و زیوێك لەم ناوچەیەدا بدۆزنەوە، بەلام توانیان هەرچیچ نەبێت چاندنی توتن لە دانیشتوانە ڕەسەنەکەیەوە (ئەمیتڤەکان) فێربنن و، چاندنی ئەم بەروبوومە بەخێرایی لە ناوچەکەدا بلاو بوەوەو بووە هۆی برەو سەندن و ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکە، هەرچەندە کۆمپانیای بازرگانی لەندەن لەسەر بنەمای ئەم ڕووداو خوازیە وەرشکست بوو، بەلام ساڵی ١٩٢٤ ڤیرجینیا شێوەی داگیرگەیەکی خانەدانەکانی بەخۆوە گرت.

پەرەپێدانی چاندنی توتن پێویستی بە کرێکارێکی زۆر هەبوو، بۆ ئەوەی بە بەردەوامی و بە ڕێك و پێکی کاری تێدا بکەن. بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی ١٦١٩ کۆمەڵێك ڕەش پێست لە لایەن کەشتیەکی هۆڵەندی یەوە بەرەو زەوی یەکانی ڤیرجینیا گوازرانەوە، هەر لەو کاتەوە بازرگانی کردن بە کۆیلەو بەکارهێنانی لە چاندنی توتن دا ڕەواجێکی زۆری پەیدا کرد هەرچەندە ئەم گۆڕانکاریانە هێواش و لەسەر خۆ ئەنجام دەدران . لەسەدەی حەڤدەیەمدا، ژمارەی هەموو ئەو ڕەش پێستانەی کە لەم زەوی یانەدا جێگیر بووبوون ئێجگار کەم بوو و ڕێژەیان لە ٤٪ ی کۆی دانیشتوانی ناوچەکە تێپەڕی نەدەکرد، بەلام پاش پێشکەوتن و برەو سەندنی چاندنی توتن لە ناوچەکەدا، وردە وردە ژمارەی کۆیلەکان ڕووی لە زیاد بوون کرد، تاوەکو گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە لەسەردەمی شۆڕشی ئەمریکی دا ژمارەی ڕەشەکان لە ٢٤٪ ی تێکڕای دانیشتوانی ئەمریکایان پێك دەهێنا.

ڤیرجینیا شێوەی جۆرێك لە ئیستعماریەتی بازرگانی لەژێر چاودێری حکومەتی ئینگلیزی لێ هاتبوو. لە ساڵی ١٦٢٠ لە بەشی باکوری ئەمریکادا جۆرێکی نوێ لە کۆچ نشینی بەریتانی هاتە ئاراوە. ئەم کۆچبەرانە گەشتیارانی نێو کەشتیەکی بەناوبانگ بوون کە ناوی ((می فلاوەر)) بوو، ئەمانە لەبەر هۆکاری جیاوازی مەزهەبی لە کڵێسەی ئینگلیزی جیا ببوونەوە و بەرەو هۆڵەندا هەڵ هاتبوون و، لەساڵی ١٦٢٠ مۆڵەتی کۆچکردنیان بەرەو ئەمریکا پێ درا. ئەم گروپە دوای ماوەیەکی دوورو درێژ لە سەرگەردانی لەنێو ئۆقیانوسی ئەتلەسی دا،

له کۆتایی ساڵی ١٨٢٠ له کەنارەکانی ((نیو ئینگلاند)) کە شاری ((پلیمۆت))ی لەسەر دروست کراوە دابەزین و، تەنانەت ئەو تاشە بەردەی کە ئەم کۆچبەرانەی لەسەر دابەزیون ئێستا له شوێنی خۆیدا ماوەتەوە.

ژیانی سەرەتایی ئەم گروپە مەزهەبی یە کە سەر بە گروپی ((پیوّرتینەکان)) بوون ئەوپەڕی سەخت و دژوار بوو، بەڵام ئەوان باوەڕیان وابوو کە لە پێناو خزمەت کردنی خودا و بەرگری کردن لە بیر و باوەڕی مەزهەبی خۆیان و بەهێز کردنی بنەماکانی ئاینی مەسیحی دا لەسەر ئەم ژیانە سەخت و دژوارە ئارام دەگرن و، سووریش بوون لەسەر ئەوەی کە ڕوو بەڕووی دژواریەکانی ئەم سەر زەوی یە نوێ یە ببنەوە تاوەکو حکومەتێکی سەربەخۆ بە دڵی خۆیان دابمەزرێنن. ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی ئەم گروپە لە ساڵەکانی ١٦٣٠ ـ ١٦٤٠ بە سەرکردایەتی قەشە (( جۆن وینترۆپ)) بەرەو ماساچۆسێت کۆچیان کردوو و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆش فەرمانێکیان لە لایەن پادشای ئینگلیزەوە بۆ پێك هێنانی کۆمپانیای بازرگانی و بەڕێوە بردنی ناوچەکە لەگەڵ خۆیاندا هێنا کە جۆرێك لە سەربەخۆیی ناوخۆیی پێ دەبەخشین.

ئەم گروپە، سووربوون لەسەر ئەوەی کە حکومەتێکی جێی متمانەی خۆیان لەسەر ئەساسی بنەماکانی ئاینی مەسیحی دابمەزرێنن و وتەکانی ((جۆن وینترۆپ)) ڕابەری گروپەکە نیشانەی هیمەتی بەرز و هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوامی ئەوان : سوورین لەسەر ئەوەی کە ((شارێکی نمونەیی بەسەر لوتکەی بەرزایەکانەوە دروست بکەین کە سەرنجی هەموو جیهانیان بۆلای ئێمە ڕاکێشراوە .)).

حکومەتی ئینگلیز، تەنها مافی وەبەرهێنان لە زەوی یە کشتوکاڵیەکانی تایبەت نەکردبوو بە کۆمپانیا بازرگانی یان گروپە جۆر بەجۆرە مەزهەبیەکان، بەڵکو ئەم تعبارەی وەك پاداشت بە تاکەکانیش دەبەخشی. لۆرد ((بالتیمۆر)) یەکێك بوو لەو کەسانەی کە خاوەنداریێتی زەوی یەکی بەرفراوانی لە ناوچەی ڤیرجینیا گرتە ئەستۆ، کە دواتر ناوچەکە بەناوی خێزانی پادشای ئینگلیزەوە بە مری لەند ناوبانگی دەرکرد . یەکێکی تر لەو کەسانە ((ولیەم پن)) بوو، کە ئەویش سەر بەگروپی مەزهەبی کواکرەکان بوو، پاش وەرگرتنی فەرمانێکی تایبەت ناوچەیەکی بەرفراوانی بەناوی خۆیەوە ـ پەنسیلڤانیا ـ ئاوەدان کردەوە.

پاش شکانی کەشتی گەلی هۆڵەندی لەلایەن هێزەکانی ئینگلیزەوە ئەو زەویانەی کە هۆڵەندا خۆی بەخاوەنیان دەزانی، بەناوی برای پادشای ئینگلیزەوە دەستیان بەسەردا گیراو، ناوی نیۆیۆرکی لێ نرا. خاوەن پشکەکانی کۆمپانیا بازرگانی یەکان بە مەبەستی پەرەپێدانی

چاندنی توتن، چەند نشینگەیەکی نوێیان لەناوچەکانی باشورر بۆ کۆچبەران دروست کرد، یەکێك لەو نشینگانە کارۆلینای باشور بوو. هەروەها لە پێناو ڕاکێشانی زۆرترین ژمارەی کۆچبەران، ((جۆن لۆك)) فەیلەسوفی ئینگلیزی یاسایەکی تایبەتی بۆ بەڕێوەبردنی ئەم نشینگەیە دانا.

مەبەستی سەرەکی ئەم کۆچبەرانە کە پاڵی پێوە دەنان بۆ ئەوەی نیشتمانەکەیان بەجێ بهێڵن، سود و قازانج بوو، کە هەندێك جار لەگەڵ هۆکاردکانی تری وەك حەز کردن بە ئازادی، هەڵهاتن لە دەست درێژی مەزهەبی و سیاسی و یان گیانی ڕووداوخوازی دا یەکانگیر دەبوو.

لە سەدەی حەفدەیەمدا بەهۆی ئەو بارودۆخە سیاسی یەی کە وولاتی بەریتانیای پێدا تێدەپەڕی، کۆچبەرانی ئەو وڵاتە زۆرینەی ڕێژەی کۆچبەرانی نێو ئەمریکایان پێك دەهێنا، کە کاریگەریەکی ڕاستەوخۆیان لە گواستنەوەی فەرهەنگی ئینگلیزی بۆ ناو خاکی ئەمریکا هەبوو.

### کۆچکردن بەچەند ڕێگایەك ئەنجام دەدرا :

١- لە ڕێگەی دام دەزگا تایبەتەکان و خاوەن بەرژەوەندی یە بازرگانیەکان، کە هەندێك جار پارەیەکی ئێجگار زۆریان دەدایە کەشتیوانەکان بۆ ئەوەی هانی کۆچ کردن بدەن. تەنانەت هەندێك جار دەستیان دەدایە ڕفاندنی هاولاتیان، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە بتوانن بە ئەندازەی پێویست هێزی مرۆیی لە کۆچنشینەکاندا نیشتەجێ بکەن.

٢- شێوازێکی دیکەی هاندانی کۆچکردن ئەوەبوو، کە حکومەت دەسەلاتێکی تایبەتی بە دادوەر و لێپرسراوی گرتووخانەکان دەبەخشی کە لە جیاتی ئەوەی تاوانبارەکان ماوەی سزاکەیان لە گرتوخانەکاندا بەسەر بەرن، ڕەوانەی کۆچنشینەکانی ئەمریکایان بکەن و لەوناوچانەدا جێگیریان بکەن.

٣- کارگەکان ،خاوەن زەوی یە کشتوکاڵیەکان، یان خێزانە دەسەلاتدارەکانی دانیشتووی ئەمریکا بەشێوەیەکی جودا و سەربەخۆی لەگەڵ ژمارەیەکی دیاری کراو لەو کەسانەی کە ئامادەبوون کۆچ بکەن بڕیارێکیان لەنێوان خۆیاندا مۆر دەکرد کە لەبەرامبەر کرێ ی سەفەر کردنەکەیاندا، کۆچبەرەکان ماوەی چوار تا حەوت ساڵ بۆ خاوەن بڕیارەکە ئیش بکەن و پاش ئەوەی ماوەی بۆندەکە کۆتایی پێ هات زەوی یەکی کشتوکاڵی بە ڕووبەری پەنجا هەزار مەتری

چوارگۆشەیان پێ دەدرێت و دەتوانن بە شێوەیەکی سەربەخۆ کشتوکاڵی تێدا بکەن. ئەم کۆچبەرانە بە کرێکاری بۆندی ناوبانگیان دەرکرد.

٤ــ شێوازێکی دیکەی کۆچکردن لە لایەن کۆمەڵە کەسانێکی خوێندەوار و خۆشگوزەرانی ئەوروپییەوە بە ئەنجام دەگەیەنرا، کە زۆرجار لەبەر هۆکاری مەزهەبی و جیاوازی بیر وباوەڕ لەگەڵ کڵێسەی ئینگلیز یان حکومەتەکەیاندا ناچار بە کۆچ کردن دەبوون. ئەم کۆمەڵەیە کە لە چەسپاندنی فەرهەنگ و ژیانی کۆمەڵگەی ئەمریکیدا ڕۆڵێکی سەرەکی و کاریگەریان گێڕا، هەمان ((پیۆرتینەکان)) بوون.

کۆمەڵگەی ئەمریکی وردە وردە لەژێر کاریگەری هۆکارە کۆمەڵایەتی و سروشتی یەکانی ئەو سەردەمەدا گەشەی کرد: کۆچکردنی خەڵکانی ئەوروپی بە تایبەتمەندی یە نەتەوەیی یە جیاوازەکانیانەوە، هەروەها کاریگەری ئەو ژینگە نوێ یەی کە داب و نەریت و فەرهەنگی ئەوروپیای هەماهەنگ و پشت ڕاست کردەوە. بارودۆخی تایبەتی جوگرافی زەوی یە نوێ یەکان و کاریگەری گروپە جیاوازەکانی کۆچبەران لەسەر یەکتری، کۆمەڵێك گۆڕانکاری نوێیان هێنایە کایەوە کە وردە وردە بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەیان ڕەنگ ڕێژی کرد و بە مانەوەی بەردەوامی فەرهەنگی ئەوروپا ئەم گۆڕانکاریانە بەسیمای و تایبەتمەندی یەکانی کۆمەڵگەی ئەوروپی ڕووپۆش کرا.

## سەردەمی کۆچنشینی:
## زەمینەی فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری

شارستانیەتی ئەمریکا درێژە پێدەری فەرهەنگ و کولتووری ئەوروپایە، سەدەی هەفدەیەمیش سەدەی گۆڕانکاری فیکری و سەرهەڵدانی کۆمەڵگەیێکی نوێیە لە کیشوەری ئەمریکادا.

لەم سەدەیەدا هەرچی بیرو باوەڕ و بیر و بۆچوونی پێشیینان هەبوو، گومانیان تێدا کرا و بنچینەی بیر کردنەوەی زانستی لەسەر بنەمای زانیاری ڕاستەقینە کە مرۆڤی لە وەهم و بیر کردنەوەی هەڵە دەپاراست، باڵی بەسەر فەرهەنگی ئەوروپادا کێشا.

((گالیلە)) ، ((دیکارت)) ، ((نیوتن)) ، ((هاروی)) و ((بۆیل)) بناغە و ئەساسی زانستی نوێیان دامەزراند . ((دیکارت))، کە یەکێکە لە بونیادنەرانی بیر کردنەوەی زانستی نوێ، باوەڕی وابوو کە بە بەکارهێنانی شێوازی عەقڵی دەتوانرێ (( ڕێسای بیرکاری)) جیهانی

سورشتی بناسێنرێت. لێکۆڵینەوەکانی ((نیوتن)) ڕۆڵێکی کاریگەریان لە گۆڕانی بنەماکانی فەلسەفەی سروشتی دا گێڕا. شارەزایی ئەو لە سیستەمی میکانیکی چەسپاوی سروشتدا، ئەم بۆچوونەی بەهێز تر کرد، کە دەتوانرێ سیستمی کۆمەڵگەش بخرێتە ڕیزی هەمان یاسا میکانیکیەکەوە.

یەکەمین بیردۆزە سیاسیە نوێیەکان لەسەر بنەمای بیر و باوەڕە دیموکراسیەکان، لە سەدەی حەڤدە یەمدا سەری هەڵدا. شەڕی ناوخۆی بەریتانیا لەسەر دابەشکردنی بەرپرسیاریەتی دەوڵەت لە نێوان دەسەڵات و پەرلەمان، گۆڕانکاری سەرمایەداری نوێ، هاوکات لەگەڵ ڕاپەڕینی چاکسازی مەزهەبی، لە هاتنەکایەی ئەم گۆڕانکاریانەدا کاریگەربوون. ڕاپەڕینی ڕیفۆرم، سوڵتەی مەزهەبەکانی بەسەر ڕۆح و فیکری کۆمەڵگەدا خستە ژێر گومانەوە و، دوابە دوای چەند ڕوو بە ڕووبونەوەیەکی خوێناوی دامەزراوەکانی ئاینی پرۆتستانت بەرەسمی دانی پێدانرا. بیرکردنەوەی زانستی لەسەر بنچینەی ئەزمون و تاقیکردنەوە، زانیایەکانی مرۆڤی بۆ جیهانی سروشت پەرەپێداو حکومەتیش لەسەر بنەمای پەیمانی کۆمەڵایەتی بایەخێکی زۆر پێدا.

ئەم واتایانە کەڵێنێکی گەورەیان لە بنەماکانی بیرکردنەوەی پێشاندا دروست کردو، گۆڕانێکی ((ژهنی)) نوێ، بە ئاراستەی بیرکردنەوەی عەقلی سەری هەڵدا و، باوەڕ بە زانیاری تحققی ـ زانستێك کە بناغەکەی لەسەر ئەزموونی عەینی ڕاوەستا بوو و پەیوەندی مرۆڤی بە جیهانی بوونەوەرەوە لەسەر بنەمای کردار و ئختیار دیاری دەکرد.

دنیای نوێ مزگێنی پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی نوێی لەسەر بناغەی ئەزمونی ڕابردوو بە کۆمەڵگا دەدا. شارستانیەتی ئەمریکا درێژەکراوەی شارستانیەتی ئەوروپا بوو، کە لەگەڵ بارودۆخی ئەم ژینگە نوێیەدا تێهەڵکێشن کراو فۆرمێکی دیاریکراوی وەرگرت.

زەویە بە پیتەکانی کیشوەری ئەمریکا، بەرەخساندنی زەمینەیەکی لەبارو گونجا و دەستەبەرکردنی پێداویستی و دەرفەتی مادی فراوان، پێشوازی لە گروپە جۆراو جۆرەکانی کۆچبەران دەکرد. لەبەرئەوە بەهەزارەها کەس لە وڵاتانی ئەوروپیەوە، هەریەکەو لەبەر هۆکارێك ، توێشووی سەفەریان ساز کردو بەرەو ئەمریکا کەوتنە ڕێ. بەڵام پاش سەدان ساڵ ڕوو بەڕووبونەوەو جیاوازی مەزهەبی، قات و قڕی و وشکەساڵی و، دەرکەوتنی چەندین نەخۆشی ترسناکی وەك تاعون، کە دەستە دەستە گیانی ئەم کۆچبەرانەی دەکێشا ، دونیای نوێ موژدەی ژیانێکی نوێ ی بە میوانەکانی دەدا. فراوانی ڕووبەری زەوی، ژمارەیەکی زۆر لە خێزانە هەژار و بێ دەرامەتەکانی ئەوروپای بەرەو ئەمریکا پەلکێش دەکرد. زەوی کشتوکاڵی

زیاتر بوو لە هێزی مرۆیی، کە ئەمەش رۆڵێکی سەرەکی لە بەرزبوونەوەی رێژەی دانیشتوان و پێکهێنانی کۆمەڵگەی ئەمریکی دا دەگێرا. ئەم سەر زەوی یە پان و بەرینە ئامێزی بۆ هەموو ئە کەسانەی کە بەدەست گرفتەکانی ئابوری و دەسەڵاتی خانەدانەکانەوە دەیان ناڵاند کردبوویەوە و، بەرەخساندنی هەل و مەرجی لەبارو فراوان بە ئاسانترین شێوە تینویەتی ئەوانی بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان دەشکاند.

ئەو هەوڵانەی کە بۆ چەسپاندنی سیستەمی فیودالیزم بە ئەنجام گەیەنران، لەبەر فراوانی زەوی یە بە پیتەکان و زۆری سەرچاوە سروشتی یەکان بێ ئاکام بوون. لۆرد ((بالتیمۆر)) وەك یەکێك لە خانەدانە دەسەلات دارەکانی بەریتانیا کە توانی بە یارمەتی پادشای ئەو ولاتە ناوچەیەکی بەرفراوانی دونیای نوێ بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە و کۆچ نشینی مەری لەند دابمەزرێنێت، ئەو لە هەوڵەکانی دا بۆ چەسپاندنی سیستەمی خانەدانی ئینگلیز سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. ئەو کرێکارانەش کە بە ((کرێکاری بۆندی)) ناودەبران لەپاش تەواو بوونی ماوەی بۆندەکە دەیان توانی ببنە خاوەنی پارچە زەوی یەکی دیاری کراو بەنرخێکی داشکاو و بۆ ئەوەی ژیانێکی سەربەخۆی تێدا بەسەر بەرن. هەر ئەم بەرفراوانیەی ناوچەکان بوون کە گەورەترین کۆسپی لەبەردەم چەسپاندنی سیستەمی خانەدانی ئەورووپی دا لەم کیشوەردا دروست کرد. جگە لەوەش. لەبەر ئەوەی ئەم کۆچبەرانە هەریەکە بیرو باوەڕێکی مەزهەبی جیاوازیان هەبوو هەروەها بەسەر چەند گروپێکی جۆراو جۆری ئایینی پرتستانتی دا دابەش دەبوون، دامەزراندنی کلێسەیەکی یەکگرتوو بەهێز و کاریگەر لەم کۆمەڵگەیەدا زۆر ئەستەم بوو.

بۆیە هەردوو لایەنە سەرەکیەکەی سیستەمی چینایەتی ئەورووپا : خانەدان و کلێسە، بەهیچ شێوەیەك نەیان توانی رەگ و ریشەی خۆیان لەنێو خاکی دونیای نوێ دا دابکوتن و پەروەردەی بکەن. تەنها هۆکارێك کەدەستی لە پشت خەڵکی دەدا بۆ ئەوەی بەرەو دونیای نوێ کۆچ بکەن، کۆکردنەوەی سەروەت و سامان بوو و، هەر ئەم ماڵ و سامانەش تاکە پێوەر بوو بۆ ئەوەی پێگەی کۆمەلایەتی تاکەکانی پێ دەست نیشان بکرێت. ئەو پلە وپایە کۆمەلایەتیەش کە گەورەکان بە میرات و لەرێگەی خزمایەتیەوە بۆیان مابوویەوە، بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەو بارودۆخ و کۆمەڵگە نوێ یە دا سازگار نەبوو. ناوچەی ((نیو ئینگلەند)) هەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە خاوەندارێتی (موڵکایەتی) زەوی یەکانی لەسەر بنەماکان دابەش کردنی زەوی و زار و وورده سەرمایە داری دیاری کرد. کۆکردنەوەی ماڵ و سامان لە جیاتی بەدەست هێنانی شانازی یە خێزانیەکان، بە تەنها فاکتەری بەرەو پێش چوونی ژیانی کۆمەلایەتی دانرا.

پانتایی ڕووبەری زەوی یەکەشی، دابەش کردنی یەکسانی و هاوسەنگی سامانی وولاتی لێکەوتەوە.

هاوکات لەگەڵ ڕوودانی ئەو هەموو گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیانە، بیر و باوەڕە سیاسیەکانی سەدەی حەڤدەیەمیش بڵاو بوونەوە. بیردۆزە سیاسیەکانی ((جۆن لۆك )) فەیلەسوفی بەناوبانگی ئینگلیزی، ڕەگ و ڕیشەی بیرکردنەوەی لیبرالیزمی ئەمریکایان دامەزراند. ڕەوشی ژینگەی کۆمەڵایەتی، پشت بەستن بە سیستەمی سەرمایەداری، بڵاو بوونەوەی بیر و باوەڕی لیبرالیزمی، کە جەختی لەسەر توانای تاکەکان و باوەڕ بە ئازادی و مافی شارستانی دەکردەوە، لەگەڵ هەموو ئەو ئاسان کاریانەی کە لەڕووی مەزهەبیەوە دەکران و، کۆسپ دانان لەبەردەم چەسپاندنی سیستەمی خانەدانی و چینایەتی، بیری یەکسانی و ڕەخساندنی دەرفەتی بۆ پێش کەوتن و چاك کردنی ژیانی مادی پەروەدە کرد. بەدەست هێنانی ماڵ و سامان بوو بە پیشەی سەرەکی زۆرینەی خەڵك و، بڵاو بوونەوەی بیر و ڕاکانی ئایینی پرۆتستان، ڕێز و پلەو پایەیەکی تایبەتی بەم تێڕوانینە بەخشی بیر کردنەوەی سەرمایەداری ئەوروپا کە کۆمەڵناسی بەناوبانگ ((ماکس ڤیبەر)) لە ئایینی پرۆتستانتەوە وەری گرتبوو، لە لایەن هەردوو گروپی بەناوبانگ ((پیۆرتین)) و ((کواکرەکان))ەوە بۆ ئەمریکا گوازرایەوە.

جەخت کردنەوە لەسەر پێك هێنانی کۆمەڵگەیەکی خۆشگوزەران و، هەوڵ و کۆشش لە پێناو چاك کردنی ژیانی هاوڵاتیان، بەیەکێك لە کۆڵەکەکانی ئایینی پرۆتستانت دەژمێررا. بەدەست هێنانی سەروەت و سامان وەك پیشەیەکی بەڕێز و شکۆدار سەیر دەکرا ، ئیدی سەردەمی جوامێری و شانازی خانەدانەکان بەسەر چوو بوو هەروەها کۆمەڵگەی بۆرژواری پرۆتستانت، پلە و پایەی کۆمەڵایەتی خۆی لەسەر بنەمای کۆکردنەوەی ماڵ و سامان دانابوو.

ئەو کۆچبەرانەی کە ڕوویان لە ناوچەی (( نیو ئینگلەند )) کرد پرۆتستانت و شوێنکەوتوانی کالڤن و لایەنگرانی ڕێبازێك بوون کە بەهۆی ئارامگرتن لەسەر ئەو هەموو ڕەنج و ماندوو بوونەی لە پێناو جێ بەجێ کردنی بنەما مەزهەبیەکاندا دیانکێشا، بە (( پیۆرتینەکان)) ناوبانگیان دەرکرد. ((پیۆرتیانیزم)) لەنێوان چینە مامناوەندەکانی کۆمەڵگەی ئینگلیزدا ڕەواجێکی زۆری هەبوو، زۆرینەی کۆچبەرەکانیش سەر بەم چینەی کۆمەڵگە بوون ئەمانە لە حکومەتی ئینگلیزی بێزار بوون و لەسەر ئەوەی کە باوەڕیان پێ ی هەبوو، بەچاوێکی سووك سەیر دەکران. ئومێدی سەرکەوتنی ڕێباز و بیر و باوەڕەکەیان لە کۆچ کردنەکانیاندا ڕەنگی دابوویەوە. بەو پەڕی ئیمان و باوەڕەوە، سوور بوونی خۆیان بۆ

دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی خۆشگوزەران و ڕێکوپێك پشت نەستور بە بنەما ئاکاری و مەزهەبی یەکان دوویات دەکردەوە. باوەڕ و بەندایەتی لە ڕوانگەی ئەوانەوە، تەنها لە ڕووی مەزهەبی و مەعنەوی یەوە نەبوو، بەڵکو ئامانجیان ئەوەبوو کە سەرەتا پەیوەندی یە کۆمەڵایەتی یەکانی خۆیان ڕێك بخەن و دواجار کۆمەڵگەیەکی خۆشگوزەران کە پشت بە بنەماکانی سیستەمی سەرمایەداری ببەستێت پەروەردە بکەن.

بەپێ ی ئەو یاسا سەرەتای یانەی کە ((پیوریتینەکان)) لە (( نیو ئینگلەند)) دا پەیڕەویان کرد، هەموو جۆرە بێکاری و تەمەڵی و خۆدزینەوەیەك لە کار و کۆشش بۆ کۆکردنەوەی ماڵ وسامان قەدەغەکرا. کەسە بێکارەکان بە توندی سزا دەدران بە کەسانێکی داماو ناوزەد دەکران کە شەیتان ئەوانی لەسەر ڕێگای ڕاست کە کۆکردنەوەی ماڵ و سامانە هەڵە کردووە.

پەرستش و خۆپارێزی، تەنها بریتی نەبوو لە گوێڕایەڵی کردنی فەرمان و پەیرە و کردنی بنەما ئاینی یەکان، بەڵکو کەسی خۆپارێز ، کەسێك بوو، کە بە هەوڵ و کۆشش لە پێناوی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگە و چاککردنی ژیانی تایبەتی خۆی تێبکۆشێت. خۆ خەریك کردن بە ئیش کاری دنیایی بەشێك بوو لە عیبادەت و ئەرکە مەعنەویەکانی تاکەکەس. کەسێکی مەزهەبی ، ئەو کاتە دەبوویە خاوەنی کەسایەتی یەکی سەربەخۆ و ڕێز لێگیراو، کە ئەو پەڕی هەوڵ و تەقەلای خۆی لەپێناو چاك کردنی ژیانی ماددی خۆیدا بخاتەگەڕ. ڕەزامەندی پەروەردگاریش تەنها لەم ڕێگایەوە بەدەست دەهێنرا. لە لایەکی تریشەوە، قەشەکان، ئامۆژگاری و هانی خەڵکیان دەدا بۆ ئەوەی ژیانێکی ماددی خۆشگوزەران بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن و، دەیانووت ئیش و کار و هەوڵ و کۆشش جۆرێکە لە پەیمان و لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی. ئیمان بە خودا بە واتای باوەڕ بە توانای تاکەکەس لە کار و چالاکی کۆمەڵایەتی دا لێك دەدرایەوەو، لە ئەنجامدا لەسەر کەسی باوەڕدار و خۆپارێز پێویست بوو، کە کەسێکی سەرکەوتوو بێت لە ژیانی ماددی دا.

لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەیەمدا، ڕەونەقی ئابوری ماساچۆسێت و سەروەت و ئاوەدانی ناوچەکە، شاهیدی سەرکەوتنی ئەو ئیدعایە بوو، کە ئیمانی مەزهەبی و باوەڕ بە ژیانی خۆشگوزەرانی ماددی بەلای (( پیۆرتینەکان))ەوە یەکسانن و [دەتوانیرێت هەریەکە و لە تای یەك تەرازوودا دابنرێن].

گروپێکی دیکەی مەزهەبی پرۆتستانتی، ((کواکرەکان)) بوو، کە ئەمانیش ئەو پەڕی هەوڵ و تەقەلای خۆیان بۆ بەدەست هێنانی کۆشش لە پێناو چاککردنی ژیانی ماددی دا، خستبوویە

کار ئەم گروپە لە لایەنگرانی ((ویلیام پن )) بوون، کە بە فەرمانێك لە لایەن پادشای ئینگلیزەوە، دەستیان بەسەر داگیرگەیەکدا گرت و دواتر ناوی پەنسیلڤانیایان لێنا. ئامۆژگاری ((پن)) بۆ لایەنگرەکانی ئەوەبوو، کە ئەرك و مەسرەفی کەمتر و پاشەکەوتی زیاتر چاکترین شێوازی بەڕێوەبردنی ژیانە. ژیانێکی سادە و دوور لە هەموو جۆرە ڕازاندنەوەیەك، پشت ئەستوور بەکار، سادە پۆشی و بەبێ هیچ جۆرە ڕابواردنێك، ڕێنوێنیکەری ((کواکرەکان)) بوو. ئەم گروپە ئەوەندە حەزیان لە سادە پۆشی بوو کە پاش مردنیش هیچ جۆرە ناونیشانێکیان بەسەر بەردی گۆڕەکانیانەوە بەجێ نەدەهێشت. تەمەنیان لە ئیش و کار و هەوڵ و کۆشش پاشەکەوت و کەمترین ئەرك و مەسرەف و چاککردنی ژیانیان کورت دەکرایەوە، کۆکردنەوە و زیادەڕەوی نەکردن، بەوتای خۆپارێزی و تەقوا لێك دەدرایەوە. ((کواکرەکان)) هەر لە سەرەتای نیشتەجێ بوونیانەوە، بە کەسانێکی لێهاتوو، زیرەك و، سەرکەوتوو ناوبانگیان دەرکرد. ئامۆژگاری یەکانی ((بنجامین فرانکلین)) لە سالنامەی ((ریچاردی هەژار)) دا ـ هەرچەندە دوورە لەهەر جۆرە بابەتێکی مەزهەبی ـ لەسەر ئەو بیر و باوەڕە ڕاوەستاوە کە ئیش و کار و کۆشش لە ژیانندا بەهیچ شێوەیەك عەیب و نەشیاو نیە، هەموو ئیش و کارێك بۆ خۆی مەزن و پیرۆزە‌و، مرۆڤی بەڕێز و گەورە کەسێکە کە خۆی بەئیش و کارێکی تایبەتی یەوە سەرقاڵ کردووە، کۆکردنەوەی ماڵ و دارایی لەگەڵ زیادەڕەوی نەکردندا هاوتایەو، بەختەوەری لە زیادەڕەوی نەکردندایە. جەخت کردنەوەو گرنگی دان بە ماددە، کە پیشەی سەرەکی ئەمریکی یەکانە، لەژێر کاریگەری هەمان بۆچوونەکانی سەرەتای دامەزراندنی داگیرگەکانەوە هاتووەتە ئاراوە.

((پیۆرتینەکان)) هەمان ئەندازە کە جەختیان لەسەر کار و کۆشش و چاککردنی ژیانی ماددی دەکردەوە، بەهەمان ئەندازەش، خێزان و ژیانی ژن و ژنخوازی بەلایانەوە بەڕێز و پیرۆز بوو. ئافرەت کە لە ڕوانگەی کاتۆلیکەکانەوە بە بەلایەکی زەروری و وەسوەسە گەری پیاو دەژمێررا، بە بۆچونی ((پیۆرتینەکان)) مەوهیبەیەکی ئیلاهی بوو، کە بەبێ بوونی ئەدەتوانرا ژیانێکی خۆشگوزەران دەستەبەر بکرێت. بەچاوی ڕێز و حورمەتەوە سەیری ژن و ژنخوازی و پێکهێنانی خێزان دەکرا. ژن و پیاو ناوکی سەرەکی کۆمەڵگەیان پێك دەهێنا. کە بەهاوبەشی یەکتر، هاوکاری و ڕێزلێگرتنی بەرامبەر، بۆ بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگە کاریان دەکرد. تێکۆشان بۆ گەیشتن بە بەختەوەری پێویستی بەهاوکاری و پشتیوانی هەردوولا هەبوو. ڕێزگرتن لە پلە و پایەی ئافرەت لەم کۆمەڵگە نوێ یەدا بە بەراورد لەگەڵ ئەوروپا، زۆر زیاتر بوو و، لەم

ڕوانگەیەوە ((پیۆرتینەکان)) بیرکردنەوەیەکی پێشکەوتووتریان هەبوو، لەهەمان کاتیشدا خەڵکانێکی خاوەن ڕەوشتی بەرز بوون و، ڕێڕەوی ژیانیان لەسەر بنەمای پێوەرە ئاکاریەکان و پابەند بە بنەما مەزهەبی یەکان، لەگەڵ سڵ کردنەوە لەهەر جۆرە گوناه و تاوانێك کە ببێتە مایەی تیگەرانی کڵێسە، ڕەنگ ڕێژی کردبوو. لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەوان (( هەڵبژێرراوانی)) خودان، بۆنە مەزهەبی و وتارەکانی خۆیان بە بە بەرز و باڵاتر لەخەڵکانی تر دەزانی. ڕێگای ووروژاندنی هیچ جۆرە پرسیار و شك و گومانێکیان بە لایەنگرانیان نەدەدا و، بەهیچ شێوەیەکیش ئامادە نەبوون، گوێ لە بچوکترین ناڕەزایی و ڕەخنەیەکی شوێنکەوتوانیان بگرن و، هەر ئەم سەختگیریەیان بووە مایەی دووبەرەکی لە نێوانیاندا. کەسێکی وەك ((ڕاجێر ولیامز))، پاش ئەوەی ڕەخنەیەکی توندی ئاراستەی کڵێسە کرد و ڕەفتاری کڵێسەی بەرامبەر بە خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە [ئەیتڤەکان] بەڕەفتارێکی نامرۆڤانە و پێچەوانەی ڕەوشت وەصف کرد، لە کڵێسە دەرکرا و، دواتر ئاوبراو ویلایەتێکی بچوکی بەناوی ((رد ئایلەند)) بۆ لایەنگرەکانی دامەزراند. (( ئان ها چینسۆن ))یش کە یەکێك بوو لە ئافرەتە بلیمەتەکانی ئەو سەردەمە، لەبەر ئەوەی کە تێگەیشتی بنەما مەزهەبیەکانی لە گفتوگۆ و گوێ ڕایەڵی نەکردنی کوێرانەی فەرمانەکانی کڵێسەدا دەبینی، لەنێو لیستی دوور خراوەکاندا بوو.

((پیۆرتینەکان))، بەو وورەیەکی پۆڵاین، ئیمانێکی بەهێز و، باوەڕ بە لێپرسراوێتی مەعنەوی، توانیان گۆڕانێکی گەورەش لە بنەما سیاسیەکاندا بکەن. بەهێزی باوەڕەکەیان، لێك هەڵوەشانی کڵێسە، تەفر و تونا بوونی دەسەڵاتی دیکتاتۆری ـ لەڕوداوێکدا ـ لەسێدارەدانی پادشای لێکەوتبوویەوە (سەردەمی کرامۆڵ و کوژرانی چارلزی یەکەم لە ئینگلتەرا ).

لەم لاشەوە، پرۆتستانتەکان، دەسەڵاتداریێتی ڕەهای قەشەکانی کاتۆلیکیان لە ئاراستەکردنی بابەتە مەزهەبی یەکاندا بەهەموو شێوەیەك ڕەتکردەوە و ڕاشیان گەیاند، کە کەسی باوەڕ دار بەبێ ئەوەی پێویستی بە هیچ نێوەنجیەك هەبێت، دەتوانێت لەم بنەمایانە تێبگات. لە ئەنجامدا، لە پەیوەندی نێوان تاکەکەس لەگەڵ خواوەندا، ئەرکی سەرەکی کەوتەسەر شانی خودی کەسەکەو، تەنها مرۆڤەکە خۆی دەیتوانی ڕێگای ڕزگاری و سەرفرازی بۆ خۆی دیار بکات. دەرەنجامی وەها گریمانەیەك، جەخت کردنەوە لەسەر هێز و ئازایەتی خودی کەسەکە بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوەی گیروگرفتەکان بوو، لەو ڕووەوە زۆر ئاسایی پێشوازیان لەو هەموو ڕەنج و ماندوو بوونە دەکرد کە لەم کیشوەرە نوێ یەدا دووچاریان دەبوو. هەر گرنگی

دان بەو تاك گەراییەبوو، کە بووە هۆی یاخی بوون و ڕاپەڕینی کەسانێکی وەك ((ڕاجێر ولیامز)) و ((ئان ها چینسۆن)) لەناو گروپی پیۆریتنەکاندا. وورده وورده و بەتێپەڕبوونی کات (( پیۆرتیانیزم )) بووە مایەی پشت ڕاست کردنەوەی ئەم شێوازە. بەلام جەخت کردنەوە لەسەر توانی تاك و، ئەرکی تاك لە هەولّ دان بۆ بەدیهێنانی ژیانێکی چاکتر، هەروەکو خۆی مایەوە و وەك یەکێك لە خەسلەتە سەرەکییەکانی ڕۆحییەی ئەمریکایی ڕەنگی دایەوە.

لەوەها هەل و مەرجێکی فیکری دا، مەزهەب و مەنگق وەك یەك گرنگییان پێ دراو لە کەسی باوەڕدار چاوەڕوان دەکرا کە عەقلی خۆی بکاتە ڕێنیشاندەر [لەکارەکانی دا]

شێوازی بەلگە هێنانەوەی عەقلی، ڕێنمایی کەری بیرکردنەوەی سەدەی حەڤدەیەم بوو، لەلایەن ئایینی پرۆتستانتەوە جەختی لەسەر کرایەوە و، پەیوەندی تاکەکەس لەگەل جیهانی هەستی لەسەر بنەمای کردار و ئیختیار دانی پێدا نرا.

باوەڕ بە هێزی عەقلّ هۆکارێکی سەرکی پەرە سەندنی فێرکردن و پەروەردە بوو. (( پیۆریتنەکان ))، ئەزانیان بە ((دایکی کوفر)) ناودەبرد ئەوانەش کە زاناو خوێندەوار بوون تەنها پیاوە ئاینی یەکان بوون. هەر بۆ پارێزگاری کردن لەم ئەریتە بوو کە هەولی دروست کردنی زانکۆیان دەدا. تێکڕای چالاکیەکانیان لە بازنەیەکدا دەسوڕایەوە، کە لە لایەن کلێسەوە بڕیاری لەسەر درابوو. لەسالّی ١٦٣٦ کۆلێژی هاروارد لە ماساچۆسێت کرایەوە. بەسەدان قوتابی دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆرد و کمبریج، پێش ١٦٤٠ لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوو بوون و هەر لەو سەرەتایەوە فێرکردنی زانستەکانی ئەدەبیاتی یۆنانیی و لاتینی و فەلسەفەیان دەست پێ کرد. بیرۆکەی خوێندنی بالا لە سەرتا سەری داگیرگەکاندا بلاو بوویەوە. کۆلێژەکانیییل لە ١٧٠١ ، ولیام و میّری ١٦٩٣ ، کۆلۆمبیا ، دارتموپ، پرینستۆن و، پەنسیلڤانیان لەماوەی کەمتر لەیەك سەدەدا دامەزراند. بە بەراورد لەگەلّ ولاتێکی وەك ئینگلیز، کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا ئەوجا توانی سێ یەم زانکۆ لە ولاتەکەیدا بکاتەوە، ئەو گرنگیەی کە ئەم کۆچبەرانە بە خوێندنی بالایان دەدا و ئەو کاریگەریەی کە ئەوان لەسەر پەرەسەندنی فەرهەنگی ولاتەکەیان هەیانبوو، زیاتر ڕوون دەبێتەوە. لە ڕاستیدا ((پیۆرتیانیزم)) هۆکاری پەرەسەندنی فەرهەنگ و ئازادی بوو.

لە پێشەکی ئەو کۆمەلە یاسایەی کە بە مەبەستی دروست کردنی چەند قوتابخانەیەك لە سالّی ١٦٥٠ دەرکران، هاتووە : (( لەبەرئەوەی کە شەیتان دوژمنی مرۆڤایەتیە، بەهێزترین چەکی خۆی لەنەزانی تاکەکانەوە بەدەست دەهێنێت. جێگای بایەخ و گرنگی پێدانە، کە

ئەهێڵین گرنگی ڕوناکی و زانستی باوباپیرانمان لەگەڵ تەرمەکانیاندا لەژێر خاکدا بنێژرێن، لەبەرئەوە پەروەردەو فێرکردنی منداڵەکانمان بە گرنگترین بابەت و بەرژەوەندی یە نیشتمانی یەکان دادەنرێن.)) دروستکردنی قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لەکۆمەڵگەدا زۆر پێویست و زەرورە، بۆ ئەو ناوچانەی کە زیاتر لە پەنجا خێزانیان تێدا دەژی، قوتابخانەی سەرەتایی و، ناوچەکانی دیکە کە زیاتر لە سەد خێزانیان تێدا نیشتەجێ دەبوون، دامەزراندنی قوتابخانەی ناوەندی پێشنیاز کرا. هەرکاتێك بەخێوکەرانی منداڵ ڕێگریان دەکرد لە چوونی منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە، لە لایەن حکومڕانی شارەکەوە سزا دەدران و جەریمەشیان لێ دەسەنرا و دواتریش خۆی ئەرکی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکەی دەگرتە ئەستۆ. پلانی پراکتیك کردنی خوێندنی بەخۆڕایی و ئیجباری، بۆ قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندی، کە لە سەدەی نۆزدەیەم دا لە سەرتاسەری ئەمریکادا پەیڕەوکرا، پاشماوەی کەلەپووری فەرهەنگی ((پیوّرتینەکان))بوو.

دامەزراندنی ئەم قوتابخانەو کۆلێژانە، هۆکاری پێگەیاندنی ئەوەیەکی لاوی خوێندەوار بوو کە ڕۆڵێکی کاریگەریان لە پەرپاکردنی شۆڕشی ئەمریکادا گێڕا. ئازادی مەزهەب، جیاکردنەوەی دین و دەوڵەت ، دەرەنجامی بیرکردنەوە ئازادی خوازی یەکانی کیشوەرێك بوو، کە لەگەڵ فەرهەنگی ئینگلیزی دا بەرەو داگیرگەکان گوازرایەوە .

میرات و کەلەپوری حکومەتی ئینگلیز، لە دروست کردنی پەیکەری دیموکراسی ئەمریکا دا، زۆر کاریگەر بوو. لە لایەکی ترەوە، ڕێگە گرتن لە دەست تێوەردانی ئینگلیز لە کارو باری ناوخۆی داگیرگەکان، گەشە سەندنی سیاسی و هۆشیاری و بەدەست هێنانی ئەزموونی لە ڕووی بەڕێوەبردنی سەربەخۆیی کاروباری داگیرگەکان لێکەوتەوە. لە واقعیشدا سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەمریکا، بۆ پاراستنی ئەم سەربەخۆیی یە بوو، نەك گۆڕانی ڕەوش و باری کۆمەلایەتی کۆمەڵگە. گۆڕانکاری یە کۆمەلایەتیەکانی سەدەی حەقدیەم، کاریگەری فەرهەنگی پیوّرتینەکان و پێشکەوتنی بازرگانی، حکومڕانی چینی ناوەڕاستی بەسەر کۆمەڵگەی ئەمریکادا بەرجەستە کرد.

کۆمەڵگەی ئەمریکا لەسەر بنەمای ئابووری سەرمایەدارانی سەردەمی (( مەرکانتالیزم)) دا پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی. پەرەسەندنی بازرگانی و بلاوبوونەوەی بنەماکانی سەرمایەداری ئەوروپا، هاوکات لەگەڵ دروست کردنی کۆچنشینەکانی ئینگلیز لە ئەمریکا، بنەماکانی ئابوری سەرمایەداریان لەم ناوچەیەدا چەسپان. بژێوی ژیانی زۆرینەی خەڵکی داگیرگەکان لە ڕێگەی کشتوکاڵ کردنەوە بەدەست دەهێنرا، بەلام هاندان و گرنگی دان بە

بازرگانی و کرینی شتومەك لە ئەستۆی حکومەتی ئینگلیزی دا بوو و، ئەمریکی یەکان کە لە ئاڵوگۆرکردنی شتومەکی بازرگـانی دا پـشتیان بـە شـوێنە سـتراتیجیەکانی وەك بەنـدەرەکانی کـەنارەکانی رۆژهـەلات دەبەسـت، وورده وورده چـینێکی تایبـەتیان لەبازرگانـەکانی نێـو شارەگرنگەکانی وەك بۆستۆن، نیۆیۆرك، فیلادلفیا، چارلستۆن و نیوپۆرت پێك هێنا و تـەواوی کارو بارەکانی کرین و فرۆشتن و ئاڵگۆری بازرگانییـان بـۆ خۆیـان مۆنۆپـۆل کـرد و، تەنانـەت خاوەنی زەوی یە بەپیتەکانی باشووریش بە مەبەسـتی گواستنەوەی بەروبومی تووتن پشتیان بە بازرگانەکانی باکور دەبەست.

بایەخی لایەنی بازرگانی و پەیوەندیـەکان، حکومەتی ئینگلیزی بە رێکخستنی کاروباری کەشتیوانی و ئامادەکردنی کەل و پەلی پێویـست بۆ گەشتە دەریایـەکانی نێو داگیرگەکان ناچار کرد. گواستنەوەی پۆستی، پەرەیەکی زیاتری پێدراو ئامێرەکـانی تایبـەت بـە پەیوەنـدی کـرد لەنێو شارە جیاوازەکاندا رێك و پێك کران. زۆربەی خێزانـە دەوڵەمەنـدەکان لـەنێو شـارەکاندا دەیانتوانی پەیوەندی بەیەکەوە بکەن، پەرەسەندنی لقەکانی فراماسۆنەری لەسەرتاکانی سـەدەی هەژدەیەم و ژن و ژنخوازی نێوان خێزانـە دەسـەڵاتدارەکان، هۆکـاری بەرقـەرارکردنی پەیوەنـدی نێوان ئەم گروپە بوو. پەرەسەندن و گەشەکردنی بازرگانی، پلـەو پایەیـەکی تایبـەتی بـە رۆڵ و پیشـەی مافپەروری لە کۆمەڵگەدا بەخشی. کاروباری مافی بازرگانەکان لە ئەستۆی کەسانێکدا بوو کە لە نێو شارە گرنگەکاندا بە پیشـەی وەکالەتـەوە خۆیـان سـەرقاڵ دەکـرد و زۆرجـاریش بەهۆی دەسـەڵاتی ماددی خۆیان و زەماوەند کردن لەگەڵ خێزانە خاوەن پلەو پایەکان، دەچـوونە ریزی دەسـەڵاتدارانی کۆمەڵگەوە. چینی بازرگان و مافپـەروەرەکان، لە راستی دا کارتێکەرترین گروپە کۆمەڵایەتی یەکانی ئەم سەردەمە بوون. پەیوەندی نێوان گروپە رووناکبیرەکان لە رێگەی (( ئەنجومەنی ئەمریکی فەلسەفە)) وە کە لە ساڵی ١٧٤٥ و لە لایەن ((بنجـامین فـرانکلین)) ەوە بونیاد نرا، دەستی پێکـرد. جگـە لـەوەش بلاوبونـەوەی چـاپەمەنی هۆکـارێکی دیکـەی بەرقەرار کردنی پەیوەندی نێوان ئەم گروپانە بوو. لە نێوان ساڵەکانی ١٧١٣ ـ ١٧٤٥ نزیکـەی بیـست و دوو بلاوکراوەی هەفتانە لە نێو کۆچنیشنە جۆراوجۆرەکاندا، دەخرانە بازارەوە. چەندین چاپخانەی جۆراوجۆر بە مەبەستی بلاوکردنەوەی کتێب دەست بـەکار بـوون و، شـاری بۆسـتۆن پاش لەندەن، پلەی گرنگترین شاری ژێر دەسـەلاتی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیـای بـۆ بلاوکردنـەوەی کتێب بەدەست هێنا.

ئەم پەیوەندی و هاوکاری کردنە، تایبەت بوو بە چینی مام ناوەند و خوێندەوارەوە. لە ئینگلیز و فەرەنسا و کۆمەڵگەی داگیرگەکانی ئەمریکا، چینی ناوەراستی خۆشگوزەران و خوێندەوار لە رێگەی بلاوکراوەکان، ئەنجومەنە زانستی یەکان، دامەزراوەکانی فراماسۆنەری و باروودۆخی ژیانی کۆمەلایەتی یەوە پەیوەندیان بە یەکەوە دەکرد و ئەم هەنگاوەشیان کاریگەریەکی بەهێزی لەسەر شێوازی سەرکردایەتی سیاسی و کۆشش لە پێناو ریفۆرم و چاککردنی ژیانی کۆمەلگەدا هەبوو.

هاوکات لەگەڵ رەخساندنی دەرفەت بۆ پێشکەوتنی ماددی، باوەر بە یەکسانی و هاوتایی ئیمکانات و باروودۆخی کۆمەلایەتی لە ئارادا بوو. هۆکارە سەرەکی یەکەشی بۆ فراوانی و بەپیتی زەوییەکانی دەگەرایەوە. هزری کۆمەلایەتی، لەسەر بنەمای خاوەنداریتی تایبەتی، هەوڵدان لە پێناو چاککردنی ژیانی ماددی، جەخت کردنەوە لەسەر مافی یەکسانی بەبێ پەیرەو کردنی سیستەمی خانەدانی ئەورووپی، بزاوتێکی کۆمەلایەتی نویّ ی هێنایە کایەوە و گەشە سەندنی بیری ئازادی و مافی یەکسانی و مافی خاوەنداریتی تاکەکانی بە دوادا هات.

باوەر بە یەکسانی مرۆڤەکان، زەمینەیەکی لەبار و گونجاوتری بۆ ئافرەتان رەخساند. ژمارەی ئافرەتانی کۆچبەر لەچاو پیاواندا زۆر کەمبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەلگە پێویستییەکی زۆر بەهاوکاری کردنی ئەوان هەبوو. لەکاتی رووبەرووبونەوەی گیر و گرفتە سروشتیەکاندا، بۆ دروست کردنی خانوو، لە ئیش و کاری نێو کیلگەکان و دابینکردنی ماددە خۆراکیەکان، شان بەشانی پیاوان بەشداری دەکرد. ژیانی ئاسایی و ژینگەی کۆمەلایەتی و پێویستی بەدەستی کار، تا رادایەك پێگەی ئافرەتی لەگەڵ پیاواندا یەکسان کرد. ئەو ژنانەی کە وەکو ئافرەتی کارەکەر بەرەو ئەمریکا کۆچیان دەکرد، بە تەواو بوونی ماوەی خزمەتەکەیان دەیانتوانی سوود لەو ئیمکاناتە ماددیانە وەربگرن کە دەخرایە بەردەم پیاوان. کەمی کرێکار، هەلێکی لەباری کارکردنی بۆ ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتان رەخساند و، هەندێکیشیان توانیان لە چالاکی یە بازرگانییەکاندا بەشداری بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا نابێت وابیربکەینەوە کە بیروبۆچونی پیاوانی ئەمریکی لە بنچینەدا لەگەڵ کۆمەلەکانی دیکە جیاوازی هەبووە، چونکە تا ئەوکاتەش ئیشوکارە سەرەکییەکانی وەك پیشەی پزیشکی و خزمەتکردنی کلێسە و پارێزەری مافەکان لە گەمارۆی پیاواندا بوون و، تەنانەت کاروبارەکانی بواری فێرکردن کە دواتر خرایە ئەستۆی ئافرەتان، بەبەشێك لە ئەرکەکانی پیاوان دەژمێررا، بەلام هەل و مەرجی ژینگەی سروشتی،

پێویستی بەدەستی ئیشکەر و، ڕووبەڕووبونەوەی گرفتەکان، کە پێویستی بەهاوکاری هەردوولا هەبوو بایەخی هێزی کاری ئافرەتانی لە داگیرگەکاندا زیاتر کرد.

ژن لەکاتی ئامادەنەبوونی پیاوەکەیدا، تاکە لێپرسرا و بریاردەر لە بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی خێزانەکەی بوو. هەڵبەت ئەم ئازادیی یە لەمافی خاوەندارێتی دا سنوردار بوو، پیاوی ماڵەوە دەیتوانی داوای موچەی ڕۆژانەی ژنەکەی بکات. لە هەندێك کۆچنشینەکاندا، یاسا مۆڵەتی بە ئافرەتان دەدا، بۆ ئەوەی بتوانن لە دادگاکاندا ئامادە ببن و شاهیدی دژ بە پیاوەکانیان بدەن و، دەبوو بە دواداچوون و لێکۆڵینەوە لەسەر سکالاکانیان بکرێت و لەهەندێك حاڵەتدا، ئەو ئافرەتەکەی کە مێردەکەی کۆچی دوایی کردووە و لە وەسیەت نامەی هاوسەرەکەیدا بە مافی یاسایی خۆی نەگەیشتووە، لە لایەن یاساو دادگاوە پشتیوانیەکی تەواوی لێدەکرا. بارودۆخی ژینگەی کۆمەلایەتی ئەمریکا، پێویستی بە هاوکاری و هاودەنگی ئافرەتان لە هەموو بوارەکاندا هەبوو، ئەمەش هۆکاری سەرەکی بەرز بوونەوەی پێگەی کۆمەلایەتی ئافرەتان بوو لە کۆمەڵگەدا.

حکومەتی داگیرگەکان هاوشێوەی حکومەتی ئینگلیز پێك هێنرا. حکومڕانی ئینگلیزی لەلایەن پادشای ئەو وڵاتەوە بۆ بەڕێوەبردنی داگیرگەکان دەستنیشان دەکرا. سیانزە کۆچنشینی سەرەتا هاوشێوەی حکومەتی ئینگلیز خاوەنی دوو ئەنجومەنی دووانی بوون. تەنها کەسانی خاوەن سەرمایە، مافی دەنگدان و بەشداری کردن لە کاروباری سیاسییان پێ درابوو ـ وەك ئەو شێوازەی کە لە ئینگلیز پەیڕەو دەکرا ـ بەلام ژمارەی سەرمایەدارەکانی ژێر کاریگەری بارودۆخی ژینگە و پێداویستیەکانی ژیان بە بەراورد لەگەڵ ئنگلیزدا تا ڕادەیەك زیاتر بوو. لە کۆچنشینی ماساچۆسێت دا، مەرجەکانی بوونی ماڵ و دارایی بۆ بەشداری کردن لە کاری سیاسی زۆر ئاسان و زیاتر لە ٨٠٪ ی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بەشداریەکی بەرچاویان لەم پرۆسەیەدا دەکرد. هەرچەندە لە داگیرگەکانی تردا مافی بەشداری لە سیاسەتدا بەو ڕادەیەی ماساچۆسێت نەبوو، بەلام بە بەراورد لەگەڵ خودی ئینگلیز یان وڵاتانی تری ئەورووپا تا ڕادەیەك پێشکەوتوتربوو.

لەڕووی پێکهاتە سیاسیەکانەوە، ئەنجومەنی ویلایەتەکان بەهەمان شێوەی پەرلەمانی ئینگلیزی بەڕێوەدەچوو، بەلام تا کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەم، هەریەکە و ڕێگایەکی جیاوازیان گرتەبەر. پەرلەمانی ئینگلیز لەپێناو بەدەست هێنانی دەسەلاتی زیاتر و کۆنترۆڵ کردنی کاروباری سیاسی وولات، سنورێکی بۆ سوڵتەی

ولاتەکەی دانا و، خۆی وەك هێزی سەرەکی ناساند. قانونی ئەساسی ئینگلیز، بریتی بوو لە کۆمەڵێك یاسا و دابونەریت و ڕێ و شوێن کە بەشێوەیەکی گشتگیر باڵی بەسەر کۆمەڵگەدا کێشا. لە داگیرگەکاندا، ئەنجومەنی ویلایەتەکان شێوازێکی نوێیان بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکان گرتە بەر، کە ئەویش بریتی بوو لە شێوازی خۆ بەڕێوە بردن ( خود مختاری ) و جیا بوونەوە لە حکومەتی. قانونی ئەساسی وەك بەڵگەیەکی نوسراو کە بنەما و بنچینەکانی حکومەتی دیاری دەکرد، نوسرایەوە. لە هەندێك لە کۆچنشینەکاندا، ئەم بەڵگەنامە یە بریتی بوو لە فەرمانێك کە لە لایەن دەرباری ئینگلیزەوە داوای دروسکردنی داگیرگەکانی کردبوو. بارودۆخی جوگرافی و دووری داگیرگەکان لە ولاتەوە و، ئەو تەنگژە سیاسیەی کە حکومەتی ئینگلیزی لەسەدەی حەفدەیەم دا تێ کەوتبوو، وای کرد کە ئەو وولاتە دەستێوەردانەکانی لەنێو کاروباری داگیرگەکان و ئەنجومەنی ویلایەتەکاندا کەمتر بکاتەوە، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی لەسەر گەشەکردنی سیاسی و ئەزموونی حکومەتی سەربەخۆی ئەمریکا هەبوو. فەرمانی دامەزراندنی کۆچنشینی نوێ، هۆکارێکی دیکەی دامەزراندنی ئەنجومەنی ویلایەتەکان بوو. ساڵی ١٦١٩، حکومەتی ئینگلیز بڕیاری دامەزراندنی داگیرگەیەکی نوێ ی دەرکرد کە ناوی ڤیرجینیای لێنرا و بەهۆیەوە ئینگلیزەکانی دانیشتووی نێو داگیرگەکە بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری ناوخۆیان سەربەخۆیەکی تەواویان پێدرا و پاش دەرچوونی بڕیاری ناوبراو، بەڕێوەبردنی کاروباری ڤیرجینیا خرایە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی حکومەتی ئینگلیزەوەو دانیشتوانی ڤیرجینیایش دانیان بە دامەزراوەکانی ئەنجومەنی ویلایەتی دا ناو جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە، کە دانانی هەرجۆرە باجێك لە ناوچەکەدا، پێویستە ڕەزامەندی ئەم ئەنجومەنەی لەسەر بێت. لەساڵی ١٦٣٧ ئەنجومەنی ویلایەتی ڤیرجینیا پاش دامەزراندنی دەرباری ئینگلیز، بە ڕەسمی لەلایەن دادگاوە دانی پێدانرا. داگیرگەکانی دیکەش دەستیان بە دامەزراندنی ئەنجومەنی هاوشێوەی ئەم ئەنجومەنە کرد.

لەناوچەی ماساچۆسێت، کاریگەری (( پیوریتنەکان)) لەسەر کاروباری کۆمەلایەتی بەهۆکاری سەرەکی پێشکەوتنی سیاسی دادەنرێت. ئەم گروپە بەوپەڕی ئیمان و بیرو باوەڕی خۆیانەوە، سوربوون لەسەر ئەوەی کە پەیوەندی یە کۆمەلایەتییەکانی خۆیان زیاتر پەرە پێبدەن و کۆمەڵگەیەکیش پێکبهێنن کە لەسەر بناغەیەکی ڕێك و پێك و دیاریکراو ڕاوەستابێت. بۆ ئەم مەبەستەش لە پەیمان نامەیەکدا کە لەلایەن یەکەمین دەستەی کۆچبەرانی ماساچۆسێتەوە ڕێك و پێك کرا، جەختیان لەسەر بونیاد نانی کۆمەڵگەیەکی سیاسی یەکگرتوو کردەوە و،

بەڵێنیاندا کە ((چەند یاساو رێسا و کۆڵەکەیەك دەست نیشان بکەن و هەوڵی دروست کردنی چەند دادگایەك بدەن و گوێڕایەڵی و رەخنەکانی خۆیان لە بەرامبەر بڕیارەکانی ئەم دادگاییانەدا)) رابگەیەنن.

رێزگرتن لە سیستەمی کۆمەلایەتی و بڕیارەکانی یاسا بووە هۆی ئەوەی کە لە ((نیو ئینگلەند)) یەکەمین نیشانەکانی دروستکردنی ئەنجومەنێکی ئازاد و پشت ئەستوور بە توانا و لێهاتوویی تاکەکان سەرهەڵبدەن. ئەو ئەزموونە سیاسییەی کە لە ئەنجامی پێکهێنانی ئەنجومەنی ویلایەتەکان و بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆ ـ بەپشت بەستن بە دەسەلاتی یاسادانان هاتە ئاراوە ـ بونیادی حکومەتی ئەمریکا ی دامەزراند.

باوەڕ بە گریمانەی سیاسی پەیمانی کۆمەلایەتی، کە بوونی دەوڵەتی لەسەر بنەمای ڕەزامەندی گەل دەستنیشان دەکرد، لەسەدەی حەڤدەیەمدا گەشەی کرد. لە ئەمریکا، گریمانەی پەیمانی کۆمەلایەتی بەتەواوەتی دەستی بەسەر پەیوەندییە سیاسییەکاندا گرت. ((تۆماس هوکر))، وەك یەکێك لە نوێنەرانی داگیرگەی کنکتیکت، پەیمانی کۆمەلایەتی و رێککەوتنی دوولایەنەی بە بنچینەی هەر حکومەتێکی شەرعی دەزانی.

باوەڕ بەخۆبەڕێوەبەری، هەریەکە لە حکومەتە مەحەللییەکانی وەك یەکەیەکی سیاسی سەربەخۆ لێکرد.

((تۆکۆیل))، کە یەکێکە لە بیرمەندە فەرەنسی یەکان لە (( شیکردنەوەی دیموکراسی ئەمریکا )) دا، ئەم سەربەخۆیی و خۆکارگێرییەی حکومەتە مەحەللییەکان، بە سیاسەتێکی پۆزەتیڤ و بنەمای سەرەکی دیموکراسی سیاسی دەزانێت : (( لەنێوان زۆربەی وولاتە ئەوروپیەکاندا ژیانی سیاسی لە کۆمەلگەدا، لە چینەکانی سەرەوەوە سەرچاوەی گرتووە و هێدی هێدی و بەشێوەیەکی ناتەواو کاری لە چینەکانی دیکە کردووە و بۆناو ئەوان گوازراوەتەوە، بەلام لە ئەمریکادا، دەتوانین بلێین بەپێچەوانەی ئەوروپا ژیانی سیاسی لادێ پێش ناحیە و ناحیە پێش شارۆچکە و شارۆچکە پێش ویلایەت و لەکۆتاییدا ویلایەت پێش حکومەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە دەستی پێکردووە.)) ناوبراو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە (( بنچینەی سەربەخۆیی لادێ )) بنەمای ئازادی ئەمریکا پێك دەهێنێت.

[وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد]، میراتی حکومەتی ئینگلیز لە چەسپاندنی دیموکراسی ئەمریکادا کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی هەبوو. [بەپێچەوانشەوە]، ئەمانی دەست تێوەردانی ئینگلیز لە کاروباری ناوخۆی داگیرگەکان، گەشەسەندنی سیاسی، هۆشیاری کۆمەلایەتی و

ئەزموون لە بەڕێوەبردنی سەربەخۆیانەی داگیرگەکانی لێکەوتەوە. هاوکات لەگەڵ ئەم ئەزموونە سیاسییانەدا، مافی ئازادی چاپەمەنیەکانیش چەسپا. لەکاتی دادگایی کردنی ڕۆژنامەوانێکدا، بەناوی ((زنگر)) لەساڵی ١٧٣٥، کە چەند بابەتێکی دژ بە حکومرانی ناوچەی نیویۆرك نوسیبوو، پارێزەری ناوبراو، دادگاکەی ڕاسپارد کە چاپەمەنیەکان لەکۆمەڵگەی ئازاددا بەرپرسیارن لەبەرامبەر گواستنەوەی ڕاستییەکان و ئاگادار کردنەوەی گەلەکەیاندا و، هەر هەنگاوێکیش لە پێناو ڕێگە گرتن لە بلاو کردنەوەی ئەم ڕاستییانە، بە دڵنیاییەوە سنوور دارکردنی ئازادی یە کۆمەلایەتیەکان دەسەلمێنێت. ئازاد کردنی ((زنگر)) و بەرگری کردنی زیرەکانەی پارێزەرەکەی، هەنگاوێکی دیکە بوو لەپێناو پشتیوانی کردنی مافە کۆمەلایەتییەکان و ئازادی بلاو کردنەوەکاندا. ئەو یاسایەش کە بە ئامانجی ڕێگە گرتن لە بلاو کردنەوەی بابەتی ڕەخنە ئامێز دژ بە سەرۆك کۆمار و ئەندامە پایە بەرزەکانی دەوڵەت دەرچوو بوو، بە هەوڵ و کۆششی (( جفرسۆن )) لەغوو کرایەوە و لەساڵی ١٧٩١ بە دەرکردنی برگەی زیادکراوی یەکەمی قانونی ئەساسی، لە پێناو دابینکردنی ئازادی بلاوکراوەکان و مافی ڕادەربڕین و پێکهێنانی کۆبوونەوە سیاسییەکان، بنەماکانی ئازادییە تاکەکەسیەکان چەسپێنران.

بیری ئازادی و یەکسانی مافی تاکەکان، لەسەردەمی دەسەلاتی ئینگلیز بەسەر داگیرگەکانەوە گەشەی کردو، بیروڕاکانی سەردەمی ڕۆشنگەری و فەلسەفەی مافی سروشی، کە توخمە سەرەکییەکانی بریتین لە ئازادی و یەکسانی و دەسەلاتی گەل، لەماوەی یەك سەدەو نیو ئەزمونی سیاسی و حکومەتی خۆبەڕێوەبەری دا، کاریگەریەکی ئیجگار زۆریان لەسەر پەروەردە کردنی بیری شۆرشگێرانە و سەربەخۆیی ئەمریکا هەبوو. ئەو کاتەی کە حکومەتی ئینگلیز سوربوونی خۆی لەسەر بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆی داگیرگەکان ڕاگەیاند، ڕوبەڕووی نارەزاییەکی سەرسەختانەی ئەمریکییەکان بویەوەو، کە لەئەنجامدا بەجیابوونەوە و سەربەخۆیی کۆتایی هات.

**سەفەرە ئیکتشافەکان بەرەو کیشوەری ئەمریکا ١٤٩٢-١٦١٠**

نەخشەی ماجەلان لە ساڵی ١٥٢٢

نەخشەی جیهان لە ساڵی ١٦٧٦

**کۆچنشینەکانی ئینگلیز لە ئەمریکا**

## بەشی دووەم:

## شۆڕش و سەربەخۆیی

شۆڕشی ئەمریکا، لە دوو ڕوانگەوە بە وەرچەرخانێکی گرنگ و مێژوویی دەژمێررێت، لەو ڕۆژگارەدا. هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر لە ولاتە زلهێزەکانی ئەوروپا، چەندەها داگیرگەیان لەم کیشوەرەدا بۆ خۆیان دامەزراندبوو، بەلام تا ئەو کاتەش هیچ جۆرە شۆڕش و یاخی بوونێك لە لایەن دانیشتوانی داگیرگەکانەوە دژ بەم هێزە کۆلۆنیالیزمانە ئەنجام نەدرابوو. بەلام لەماوەی یەك سەدە ـ پاش شۆڕشەکەی ئەمریکاـ زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئیسپانیا و پورتوگال، دژ بەم هێزانە ڕاپەڕین و سەربەخۆیشیان بەدەست هێنا.

لەگەل ئەوەشدا ئەمریکا، بەسوود وەرگرتن لە بیرو ڕاکانی سەردەمی ڕۆشنگەری و فەلسەفەی مافی سروشتی، لە بونیادنانی دیموکراسی و چەسپاندنی ( مشروطیت) ی دەسەلاتی دەولەتدا، سەرکەوتنی بەدەست هێنا. سەرکردەکانی ئەمریکا، خۆیان بەشێك بوون لەسەردەمی ڕۆشنگەری و، بەتێکڕا باوەڕیان بەئازادی، یەکسانی و حوکمی گەل و جیاکردنەوەی کاروباری دین لە کاروباری دنیایی هەبوو.

لەم لاشەوە، داگیرگەکانی ژێر کۆنترۆلی بەریتانیا، بەپێچەوانەی دانیشتوانی داگیرگەکانی تر، کۆمەلگەیەکی خاوەن داب ونەریت و فەرهەنگێکی شکل گرتوو تایبتی نەبوون و، زۆربەشیان لە خودی ئینگلیزە هاتبوون و، لە پێناو دروست کردنی ژیانێکی خۆشگوزەران لەسەر بنەمای سەروەری یاساو ڕێزگرتن لە مافی تاکەکان کۆچیان کردبوو. بەووتەی ((جۆن ئادامز)) دووەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا و یەکێك لە ڕابەرانی شۆڕش، کۆمەلگەی ئەمریکا بە بەراورد لەگەل ئەوروپا، لاو و سادە و چالاکتر بوو، کە پەیکەرەکەشی لەسەر بناغەی باوەڕ بە عەقل و مەنگق و یاسای سروشت ڕاوەستابوو، هەروەها ((بیرۆکەی شۆڕش و سەربەخۆیی لە بیر و دلی خەلکەکەیدا گەشەی کردبوو.)) ئەو گۆڕانکاریانەی کە بە درێژایی یەك سەدەو نیو ئەزموونی سیاسی، لەبیر و

باوەڕ و ڕێباز و ڕای گشتی خەڵکدا سەری هەڵدا، بیری سەربەخۆ بوونیشی لەگەڵ خۆیدا پەروەردە کرد.

یەکێکی تر لە ڕوداوە هەرە گرنگ و کاریگەرەکان لەسەردەمی شۆڕشی ئەمریکادا، بریتی بوو لە نوسراوەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری. سەردەمی ڕۆشنگەری باوەڕی وابوو کە خودی عەقڵ پێوەرێکی منگقی تەواوە بۆ هەڵسەنگاندنی چاکی و خراپی ڕەفتارە کۆمەڵایەتیەکانی مرۆڤ و بونیادە شارستانیەکانی. بایەخدان بەم بیرۆکەیە، ڕەتکردنەوەی حکومەتی ڕەها، بەمەی هێنانی یەکسانی یاسایی و دەستنیشان کردنی مافی تاکەکان و ئازادی کۆمەڵایەتیەکان بوو لەگەڵ بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتی یاسا دانان لەگەڵ جێبەجێ کردندا. سەردەمی ڕۆشنگەری باوەڕی بە فەلسەفەی مافی سروشتی هەبوو: تاك بەئازادی دێتە دونیاوەو چەمکی ئازادیش بریتی یە لەوەی کە تاك تا دەتوانێت لە فشار و کارتێکردنی دەوڵەت پارێزراو بێت، پەیوەندی تاك و دەوڵەت لەسەر بنەمای ماف و لێپرسراوێتی گۆڕانکاری تێدا بکرێت، حکومەتیش لەسەر بناغەی یاسایەکی دیاری کراوی عەقڵی دامەزرێت، تاوەکو هەلومەرجێکی لەبار بۆ پەروەردەکردنی بەهرەو تواناکانی مرۆڤ بڕەخسێت و هەروەها لێهاتویی و شایستەیی تاکەکان ببێتە تاکە پێوەر بۆ دیاری کردنی پلەی کۆمەڵایەتیان. ئەم بیرۆکانە بەگشتی جەختیان لەسەر منگقی چاکسازی یەکانی لیبراڵ دەکردەوە.

بیرمەندانی سەردەمی ڕۆشنگەری ئەمریکا، لەوانە ((بنجامین فرانکلین))، ((جۆن ئادامز))، ((تۆماس جفرسۆن))، لەگەڵ ئەوەی کە چەندین لێکۆڵینەوەی ووردیان لەسەر بیروڕا فەلسەفیەکانی سەدەی هەژدەیەم بەئەنجام گەیاند، هەوڵێکی زۆریشیان بۆ چەسپاندنی مافی سروشتی و هەڵوەشاندنەوەی بنەماکانی ڕژێمی پێشووی وڵاتەکەیان دەداو لەسەم کارو چالاکیانەشیاندا خۆیان بەتەنها نەبوون.

بیرو ڕاکانی بیرمەندانی سەردەمی ڕۆشنگەری ئەوروپا، وەك (( ڤۆلتێر))، ((ڕۆسۆ))، ((بکاریا)) و یان بیرو ڕاکانی ((مۆنتسکیو)) لەنێو داگیرگەکاندا بڵاو دەکرانەوە و لە شێوەی نامیلکەی سیاسی و وتاری ڕۆژنامەکاندا ئاڵ و گۆڕیان پێدەکرا. بۆچونەکانی ((جۆن لۆك)) لە بواری مافی سروشتی و پەیمانی کۆمەڵایەتی، ((مۆنتسکیو)) دەربارەی کۆمەڵگەی ئینگلیزی و ئیمکانی دامەزراندنی دام دەزگایەك کە بتوانێت ئازادی تاکەکان بپارێزێت. نوسراوەکانی ((ڤۆلتێر)) سەبارەت بە پیاوە ئاینیەکان، کە تەنها هۆکاری مانەوەی بیری دیکتاتۆری بوون، ((بکاریا)) لە پێناو چاکسازی یاسای سزادان و،((گرۆتیوس)) و ((پۆفندۆرف)) دەربارەی یاسا

سروشتی یە نێودەوڵەتیەکان و جەوهەری بونیادە شارستانییەکان، بەشێوەیەکی بەربڵاو لەنێو داگیرگەکاندا تەشەنیان کرد. گروپە جۆراو جۆرەکان، چ ئەوانەی داوای جیابوونەوە و سەربەخۆییان لە ئینگلیز دەکرد، چ ئەوانەش کە لایەنگری پاراستنی یەکگرتنەکەیان بوون، لە نوسینەکانیاندا یان لەکاتی گفتوگۆکردندا [ و بۆسەلماندنی بۆچونەکانیان ] پشتیان بە بیروراکانی بیرمەندانی سەردەمی رۆشنگەری دەبەست.

یاسا دەرکراوەکانی ئینگلیز، وەك سەرچاوەیەك بۆ تێگەیشتن لەم رووداوە مێژوویانە، لەگەڵ بیرکردنەوە عەقلانیەکانی سەدەی هەژدەیەم، لەسەر بۆچوون و شێوازی بیرکردنەوەی ئەوەی شۆرشگێری ئەمریکی دا رەنگی دایەوە. بیروباوەرە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی ((پیۆرتینەکان))، لەسەر بنەمای پەیوەندی مەعنەوی نێوان تاك و پەروەردگار، لەگەڵ چەمکەکانی دادپەروەری و یەکسانی و مافی تاکەکەسی دا لێکدەدرانەوە و هەموو ئەو واتایانە کاریگەریەکی گەورەیان لەسەر بلاوبوونەوەی شۆرشگێریەکان هەبوو.

بناغە و بنچینەی ئەم بیرکردنەوانە، بیرورا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بوون، کە لە سەردەمی شەری ناوخۆی ئینگلیز و سەردەمی ((کرامۆڵ))ەوە، سەرچاوەیان دەرگرت. بیروراکانی دژ بە حکومرانی ئەم پیرۆیتنانەی کە لایەنگری کرامۆڵ بوون و داوای فراوانی دەسەلاتی پەرلەمانیان دەکرد لە سەدەی هەژدەیەمدا و، بۆچوونی چاکسازی خوازانی ئینگلیز دژ بە حکومەتی ((ڤالپۆڵ))، بە بیانووی ئەوەی کە پەرلەمانی ناچار کردووە، تەنها ئەو یاسانە پەسەند بکات کە بەدڵی خۆیەتی و دەیەوێ بە بلاوکردنەوە و پەرەپێدانی فەساد، دژ بە بەرژەوەندییەکانی میللەت هەنگاو بنێت، لە داگیرگەکانی ئەمریکادا لایەنگرێکی زۆر زۆری پەیدا کرد.

لەنێو داگیرگەکانی ئینگلیزدا، فراوانبوونی خاوەندارێتی زەوی و سەرهەڵدانی چینی کۆلکە سەرمایەدار، ناوەندەکانی هەڵبژاردنی پەرەپێدا و ژمارەی نوێنەرانی ئەنجومەنە مەحەللییەکانیشی زیاتر کرد. ترسان لە دەسەلاتی جێبەجێکردنی حکومەتی ئینگلیز، لەبەکارهێنانی زەبر و زەنگ لەپێناوو لەناوبردنی خۆبەرێوەبردن و ئازادی داگیرگەکان، گرنگی و بایەخی ئەم ئەنجومەنانەی زیاتر کرد.

هێز و دەسەلات، بەواتای دەسەلاتی کەسێك یان چەند کەسێك بەسەر گیان و ماڵی زۆرینەی خەڵك دا لێك دەدرایەوە، کە دەرەنجامەکەشی بریتی بوو لە زەوت کردنی ماف و ئازادی و پشتگوێ خستنی یاسا، ئەمە و جگە لەو گەندەڵیە ئیداریەی کە پێشکەش بە کۆمەڵگەی دەکرد. کەسی دەسەلاتدار، هەرچەندە دەیتوانی ببێتە مرۆڤێکی شەریف و پاك لە ژیانی تایبەتی خۆیدا،

بەڵام لەکاتی بەڕێوە بردنی کارەکانیدا، وەك کەسایەتیەکی ستەمکارو زۆردار خۆی دەناساند. هێز و دەسەلات، مرۆڤەکانی مەست دەکرد و ئەوانیش لەبەرامبەریدا چۆکیان دادەدا و خۆیان دەدا بەدەستەوە. ئەم دەسەلاتە لە داگیرگەکاندا بەشێوەی هێزی سەربازی ئینگلیز ڕەنگی دایەوە ن کە بە ووتەی ((جفرسۆن)) لە جیاتی ئەوەی ببێتە بەشێك لە حکومەتی مەدەنی ئەو سەردەمە، دەبووە هۆی بەهێزتر بوونی ئەو دەسەلاتە.

لەنێو چوارچێوەی ئەم بۆچون و بیرکردنەوانەدا، واتە بۆچونەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری، ((پیۆرتینەکان)) و ڕێ و شوێن و داب و نەریت و ترسان لە دەسەلاتی جێبەجێکردن ـ بیردۆزمیەکی دیاری کراوی سیاسی لە دایك بوو، کە داوای مافی خۆ بەڕێوبەری (خود موختاری) و پاراستنی مافی تاکەکانی نێو داگیرگەکانی ئەمریکای دەکرد. پاش زاڵبوونی هێزەکانی ئینگلیز بەسەر فەرەنسادا، لە ساڵی ١٧٦٣ و، بڕیاری پەرلەمانی ئەو وڵاتە بۆ بەکارهێنانی تۆپزی لە داگیرگەکاندا و، ترسانی دانیشتوانی داگیرگەکان لەو پیلانانەی کە حکومەتی ئینگلیز دژ بە داگیرگەکان دایڕشتووە ـ کە بە واتای بەهێز بوونی ئەو وڵاتە و لەسێدارە دانی ئازادی و خۆبەڕێوەبردنی داگیرگەکان لێکدەدرایەوە ـ بیری شۆڕش و سەربەخۆیی ئەوەندەی تر گەشەی کرد.

ئینگلیز، بەزاڵبوونی بەسەر فەرەنسادا، ئالای زەهێزێکی جیهانی لەنێوان وڵاتنی ئەورووپی دا بەرز کردەوە. بە مۆر کردنی رێککەوتننامەی ئاشتی پاریسی ساڵی ١٧٦٣، توانی داگیرگەکانی ژێر دەسەلاتی فەرەنسا بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، هەرچەندە ئەرك و مەسرەفی شەڕەکەو ئەو زیانانەی بۆ فراوانکردنی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتەکەی لێی کەوتەوە، زۆر قورس و گران بوو. هێزە دەریاییەکانی ئینگلیز، کە خەرجیەکانی لە ڕێگەی خەزێنەی باج و قەرزەکانەوە دابین دەکرا، فەرەنسیەکانیان ناچار بە بەجێهێشتنی خاکی ئەمریکا کرد. جگە لەوەش لەبەر ئەو هەموو شەڕە یەك لە دوای یەکانەی کە ڕووبەڕووی وڵاتەکەی دەبونەوەو و ئەو ئەرکە نوێیانەی کە دەکەوتە سەرشانی، وەرگرتنی باجی قورسی لە لایەن بەتەنها ڕێگا چارەیەك بۆ قەرەبوو کردنەوەی خەرجیەکانی دەزانی و تا ئەو ساتە وەختەش ئەمریکییەکان تەنها باجی مەحەللی و گومرگیان دەدا و، دەرامەتەکەشی ڕاستەوخۆ ڕەوانەی خەزێنە دەکرا، ئەم باجانە بەشێوەیەکی گشتی لە پێناو جێبەجێ کردنی یاسا بازرگانی و دەیاوانیەکان دیاری کرابوون، بۆ ئەوەی بتوانن کارو باری بازرگانی کۆنترۆڵ بکەن و، ئامانجیشیان کۆکردنەوەی دەرامەت بوو. دەرامەتی گومرگی، ئەوەندە نەبوو کە تەنانەت مووچەی کارمەندانی گومرگەکەشی پێبدرێت . لەبەرامبەریشدا کۆچبەران تەنها ئەو باجەیان دەدا کە ئەنجومەنی یاسادانان بۆ خەرجە مەحەللییەکان دایئابوو.

بەدەرکردنی یاسای دەرامەت لە ساڵی ١٧٦٤، دەوڵەتی ئینگلیز لە کاتێکدا کە باجەکانی گومرگی لەناو ئەمریکادا کەم کردەوە، دەستی بەجێبەجێ کردنی بەرنامەیەکی نوێ بە پێی چەند بنەمایەکی دیاری کراو بۆ کۆکردنەوەی باج کرد. دوای ساڵێك هەوڵی دا ، باجێکی دیاری کراو بەسەر پەنابەرانی خۆی لە ئەمریکادا بسەپێنێت، کە بەناسانی پەسەندیان دەکرد. باجی ئاماژە پێکراو بەسەر هەرجۆرە کاغەز و بەڵگەنامەیەکدا دەسەپێنرا، کەسوودی لێوەربگیرێت، لەوانە ڕۆژنامەکان و بەڵگەنامە بازرگانی و حقوقیەکان. لەسەر تاك پێویست بوو، کە بڕێکی دیاری کراو پوول بەوەرەقە یان بەڵگەنامەکەی خۆیدا بلکێنێت.

یاسای پوول جۆرێك دارێژرابوو، کە تەنها یەك لەسەر سێی خەرجی یەکانی پاراستنی هێزە سەربازییەکانی ئینگلیزی لەئەمریکا دا بۆ داگیرگەکان تەرخان دەکرد و، ئەم بارودۆخەش هیچ کات ئەمریکییەکانی نیگەران نەدەکرد، بەدەر لە هەموو ئەو باجە قورسەی کە دەکەوتە سەر شانی داگیرگەکان، بەڵام تەنها شتێك کە مایەی بێزاری و نارەزایی ئەوان بوو، تازەیی ئەو یاسا و فەرمانانە بوو کە ئەوانی زیاتر دەبزواند.

ئەمریکییەکان، پاش سەرکەوتنی ئینگلیز بەسەر فەرەنسادا، چاوەڕوانی بەردەوام بوونی سیاسەتی پێشووی ئەو وڵاتەیان دەکرد، واتە حکومەتی ئینگلیز دەست لە کاروباری ناوخۆی داگیرگەکان وەرنەدات، وازیان لێ بهێنێت و لەکاتی تەنگانەدا پارێزگاری لە بەرژەوەندیەکانیان بکات. لە بەرامبەریشدا ئەمریکا لەسەر پەیوەندی یە ئابوری و سیاسیەکانی لەگەڵ ئەو وڵاتەدا بەردەوام بێت.

یاسای پوول، ڕووبەڕووی نارەزاییەکی زۆر بوویەوە، بەتایبەت چینی بازرگان ، مافپەروەر و سەرنوسەرەی ڕۆژنامەکان، کە لەنێو خەڵکدا نفوزێکی زیاتریان هەبوو. یاسای ناوبراو لە ساڵی ١٧٦٦ هەڵوەشایەوە. لە ١٧٦٧، پەرلەمان بەبێ ئەوەی لایەنەکانی پرۆژەکە هەڵبسەنگێنێت، بیری لە سەپاندنی چەند باجێکی نوێ بەسەر کاڵاکانی وەك پەڕاو و شیشە و مس و چای کە لە ئینگیزەوە بەرەو داگیرگەکان دەهات، کردەوە. ئەم باجانە لە لایەن ((تاونزەند)) سەرۆکی خەزێنەی ئینگلیزەوە پێشنیازکرا، بەڵام جارێکیتر ڕووبەڕووی ڕەخنە بوویەوەو جگە لەسەر بەرو بوومی چای لەسەر شتومەك و کەرەستەکانی تر لابرا. ئەمریکییەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، کە پەرلەمان مافی ئەوەی نیە کە باجیان لێوەربگرێت، چونکە ئەوان لەپەرلەمانی ئینگلیزدا نوێنەریان نیە.

وەلامی ئینگلیزیش ئەوەبوو، کە پەرلەمان بە هەمان ئەندازە، کە نوێنەری بەریتانیایـە، بـەو ئەندازەیەش نوێنەرایەتی داگیرگەکانی ئەمریکا کە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتەکـەی پێـك دەهێـنن، دەکات و، دەرکردنی یاسایەکیش کە لـە پێنـاو بەرژەوەنـدی ئیمپراتۆریـەت دابێـت ، دەکەوێتـە چوارچێوەی ئەو ئەرکانەی کە لە ئەستۆیدایە. ژمارەیەك لە ئینگلیزەکان، کە پشتگیری ڕاپـەڕینی چاکسازیان لە پەرلەماندا دەکرد، هاودەنگی خۆیان لەگـەڵ دانیـشتوانی داگیرگەکانـدا دەربـڕی و سنوری دەسەلاّی پەرلەمانیان خستە ژێر دوودڵی و گومانەوە.

گۆڕانکاریـەکانی پەرلەمانی ئینگلیز دوای ١٦٨٨، هێز و دەسـەلاتی پادشایەتی ئەو وڵاتەیان سنوردار کرد. داگیرگەکانیش کەتا ئەوکاتە لەژێر کۆنترۆڵی پادشـا یـان لـەژێر چـاودێری ئـەودا، بەڕێوە دەبران، ئێستا بە پەرەسەندنی دەسەلاتی پەرلەمان و پێویـستییەکانی ئـەو وڵاتـە لـەڕووی دارایـیەوە شێوازێکی تایبـەتیان بەخۆوە گرت.

لەلایەکی ترەوە، داگیرگەکان لە ڕووی بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسـییانەوە چـالاکتر بووبـوون. دووری ماوەی نێوان داگیرگەکان و وڵاتی ئینگلیز، جیاوازی داخوازی یە سەرەکیـەکانی خـەڵکی و ترسانیان لە دەسەلاتی جێبەجێ کردنی ئەو وڵاتە، بووە هۆی ئەوەی زنجیرەیەك یاسای مەحـەللی تایبـەت بەناوچـەکە بڕیاریـان لەسـەر بـدرێت. ئەمریکییـەکان باوەڕیـان وابـوو، کـە خـەڵکی داگیرگەکانیش هەروەکو پەنابەرانی ئینگلیزی، ئازادن و خاوەنی مافی دیاریکراوی خۆیانن، بـەلاّم هیچ کاتێك لە پراکتیـك کردنـی سیاسـەتێکدا، کـە پەیوەنـدی بـە بـەڕێوەبردنی داگیرگەکانـەوە هەبوبێت، بەشـداریان نـەکردووە.((جفرسـۆن)) لەنامەیەکـدا بـۆ ((جـۆرجی سـێیەم)) پادشـای ئینگلیز، کورتەی بیروڕای ئەمریکییەکانی دەربارەی مافی پەنابەرانی ئینگلیز لـە ئـەمریکا بـەم شێوەیە دەربڕی:((ئێوە بە ڕاوێژکارانی ئینگلیـزی گـەمارۆ دراون، هـیچ وەزیـر و ڕاوێـژکارێکتان تایبەت بە کاروباری ئەمریکا لە بەردەستدا نیە، چونکە هیچ کام لـە ئێمـەتان بـۆ ئـەم ئـەرك و لێپرسراوێتیە بانگهێشت نەکردووە.)) بە کردەوەش ئەمریکییەکان سـەلماندیان، کە نایانـەوێت بـاج بدەن و پەرلەمانیش ئەیتوانی بەو شێوەیە کە دەیویـست دەسەلاّتەکەی بەکار بهێنێت.

ساڵی ١٧٧٣، بەهۆی ڕوداوێکەوە ناڕامی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا، کە ئەویش بە هۆی دەرکردنی یاسایەکی نوێ ی تایبـەت بە بەروبومی چـای بـوو، بـەم هۆیـەوە کۆمپانیـای هینـدی ڕۆژهەلات ڕووبەڕووی دژواریـەکی بازرگانی گەورە بوویەوە. چونکە ڕێژەیەکـەی زۆر چـای چـینی بەبێ داوخواست لە خەزێنـەکانی حکومـەتی ئینگلیـزدا مابوویـەوە. پەرلـەمانیش مۆڵـەتی بـە کۆمپانیاکە دا، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی کارمەندەکانی خۆیەوە و بەشێوەیەکی مۆنۆپۆڵ (ئنحـصار)ی

چایی یە ئەنبار کراوەکە بفرۆشێت. چای، لەو سەردەمەدا، بەیەکێك لە گرنگترین بەرهەمە بازرگانیەکان دەژمێررا. بازرگانە ئەمریکییەکان، کەتا ئەو ساتە وەختە، پردی پەیوەندی شتومەکی خستنە بازاڕ و داوخواست بوون، لەو مافە بێبەش کران. لەبەر ئەوە لە هەموو بەندەرەکانی ئەمریکادا، کڕینی چای کۆمپانیای ناوبراویان قەدەغەکرد. لەشاری بۆستۆن، ئەمریکییەکان، بۆ ئەوەی نەهێڵن، کرێکارانی کۆمپانیاکە بارە چایی یەکانی نێو کەشتییەکان دابگرن، شەوانە پەلاماری کەشتی یە بارهەڵگرەکانیان دەدا و هەموو سندوقەکانیان دەرژاندە نێو ناوەکەوە. حکومەتی ئنگلیزیش، لە هەڵبەستێکی نابەرامبەردا، هەموو چالاکییە بازرگانییەکانی شاری بۆستۆنی وەستاند و، هەر لەبەر ئەم هەنگاوەی حکومەت بوو، کە ئەو شارە ڕوو بەڕووی مەترسی وەرشکست بوون بوویەوە. حکومەتی ئینگلیز، هەڵبژاردە مەحەللی یەکان و کۆبوونەوەی شارەکانی قەدەغە کرد و بە پێدانی دەسەلاتی زیاتر بە نوێنەراکانی خۆی، خەڵکی ناوچەکەی زیاتر خستە ژێر فشارەوە. لەم کاتەدا و لە ساڵی ١٧٧٤، پەرلەمانی ئینگلیز یاسای ((کوبك)) ی دەرکرد، کە بەهۆیەوە ناوچەی فەرەنسی نشینی کەنەدا توانی، لەمافی ئازادی یە شارستانی و مەزهەبی یەکانی خۆی بەهرەمەند ببێت، لەهەمان کاتیشدا سنوورەکانی کوبك بە شێوەیەك دیاری کران، کە تەواوی زەویەکانی باکوری ڕووداهایۆ واتە ویلایەتەکانی ئێستای ویسکۆنسین، میشیگان، ئیلی نوا، ئیندیانا و ئۆهایۆ دەکەوتنە نێو چوارچێوەی سنورەکانی کوبکەوە. بەڕای ئەمریکییەکان ئەم یاسا نوێ یە بەربەستێك بوو لەبەردەم پێشڕەوی کردنی ئەواندا بەرەو زەوی یەکانی ڕۆژئاوا و کردارێکیش بوو بۆ پشتیوانی کردنی فەرەنسییە کاتۆلیکەکانی دانیشتووی کەنەدا. ئەم هەنگاوەشیان بە داخستنی بەندەری بازرگانی بۆستۆن و دەست تێوەردانی پۆلیسی ئینگلیزی لەنێو کاروباری داگیرگەی ماساچۆسێتەوە دەبەستەوە. یاسای ئاماژە پێکراو بە یەکێك لەو یاسایانە دەژمێررا، کە خەڵکی ئەمریکای زۆر نیگەران کردو بەڵێنیشیان دا بە هەموو توانایەك لەبەرامبەریدا ڕاوەستن. سیاسەتی ئینلگیز، ڕق و کینی خەڵکی ئەمریکای گەیاندبوویە بینەقاقە و ئەوانی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە ئامادە دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا تا ساڵی ١٧٧٤، هێشتا بیرۆکەی سەربەخۆیی و جیابوونەوە نەگەشتبوویە قۆناغی کردەیی و، هەموو هەوڵ و کۆششەکانیان لە پێناو پاراستنی سەربەخۆیی ناوخۆدا چڕ کردبوویەوە.

پاش دەرکردنی ئەم یاسایانە، کۆچنشینە جۆراوجۆرەکان پشتیوانیان لە داگیرگەی ماساچۆسێت کرد و چەند نوێنەرێکیان بەمەبەستی بەشداری کردن لە ((کۆنگرەی کیشوەری)) ڕەوانەی فیلادلفیا کرد. ئەم کۆنگرەیە لە ساڵی ١٧٧٤، بە ئامادەبوونی نوێنەرانی سیانزە

کۆچنشینی سەرەتایی بەسترا، لە ئەنجامیشدا کەمارۆ خستنە سەری کالای ئینگلیزیان پەسەند کرد و، هەڵوێستی حکومەتی ناوبراویش تەنها پەنابردنە بەر زەبرو زەنگ بوو. بەیەك سال دوای بڕیارەکە، پاش ئەوەی حکومڕانی ئینگلیزی شاری بۆستۆن، ژمارەیەك سەربازی بۆ دەست بەسەردا کرتنی ئەنبارێکی چەکی نایاسایی بەرەو کۆنکۆرد لەماساچۆسێت نارد، ئاگری شەڕ هەڵگیرساو تەقە لەنێوان سەربازانی ئینگلیز و هێزی ڕاپەرینی بەرگری دا دەستی پێ کرد. لە کۆبوونەوەی دووەمی ((کۆنگرەی کیشوەری)) داو بۆ هەمان مەبەست، بڕیاری کۆکردنەوەی تێکڕای هێزە سەربازیەکانیان داو ((جۆرج واشنگتۆن))، یەکێك لە نوێنەرانی ڤێرجینیای بۆ پلەی فەرماندەیی سوپای داگیرکەکان هەڵبژارد. کۆنگرە هێشتا ئامادە نەبوو پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ ئینگلیزدا بپچڕێنێت. ئەو شتەی کە ئەمریکیەکان دەیانویست، بریتی بوو لە هەڵسوڕاندنی کاروبارەکان، وەکو ڕابردوو،واتە بەرقەرار کردنی ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوانیاندا هەبوو، لە مافی خۆ بەڕێوەبەری، هەڵوەشانەوەی یاساکانی باج، چاکسازی کردن و پشت ڕاستکردنەوەی چاودێری ئنگلیز لە ڕووی ئالوگۆڕی بازرگانییەوە، دامەزراندنی سیستەمی دادوەری و پێکهێنانی دادگایەك کە دەستەیەکی سوێندخواردنی هەبێت ـ کەتا ئەو کاتەش بەهۆی دروست کردنی دادگا سەربازیەکانەوە پشتگوێ خرابوو ـ و لابردنی هەرجۆرە تەنگ و چەڵەمەیەك کە ڕێگربێت لەبەردەم پێشڕەوی کردنی ئەمریکییەکاندا بەرەو زەویەکانی ڕۆژئاوا. هەر لەبەر ئەوەش، نوێنەرە بەشدار بووەکانی نێو دووەمین فیلادلفیا، ڕایانگەیاند، ئەمریکییەکان خۆیان پرچەك کردووە، بۆ بەرگری کردن لە ئازادی، کە مافێکی دان پێدانراوی سروشتی خۆیانە و تا ئەو کاتەش لێی بەهرەمەند بوون. ئەم خەڵکانە لەگەڵ شێوازی حکومەتکردنی ئینگلیز لەسەدەی حەڤدەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەمدا، بۆ بەڕێوەبردنی داگیرکەکان ڕاهاتبوون و بەم دەسەڵاتەش ڕازی بوون. لەڕاستی دا ئەوان شۆڕشگێڕانێکی ڕازی بوون، تا بزوتنەوەیەکی شۆڕشخواز.

کاتێك پەتی پەیوەندی نێوان حکومەتی ئینگلیز و خەڵکی داگیرکەکانی ئەمریکا پچڕا، کۆمەڵگە پێویستی بە بونیادێکی حقوقی نوێ هەبوو. بەشارەزا بوونی خەڵکی لە فەلسەفەی حکومەتی((جۆن لۆك)) ، مافی سروشتی و بیرکردنەوەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری، ئەم ئامانجە دەکرا بێتەدی. بەسوود وەرکرتن لە نوسراوەکانی((لۆك))، جفرسۆن هۆکاری کردەیی شۆڕشەکەی، بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە ڕاگەیاندنی سەربەخۆییدا بلاو کردەوە. لە مانگی جینیوەری سالی ١٧٧٦،((تۆماس پین)) بەبلاوکردنەوەی ئامیلکە بەناوبانگەکەی خۆی((عەقلی تەندروست)) بەرگی کەسایەتییەکی شۆڕشگێڕی لەبەرکرد. ناوبراو دوو سال پێش ئەم ڕووداوانە بە

گیانێکی ڕاپەڕیو لە ئینگلیزەوە هاتبوو و لە دەوڵەتەکەشی، بەهۆی ئەو زوڵم و ستەمەی کەلەکەسانێکی هاوشێوەی ئەوی دەکرد، زۆر بێزار بوو. لەنامیلکەکەیدا، بەدەربڕینێکی زۆر توند، پێویستی سەربەخۆیی داگیرگەکانی شیکردەوە و، سەربەخۆیی لەگەڵ ئازادی تەواوی مرۆڤایەتی دا هاوتا کرد و حکومەتی ئینگلیزی بەهێمای زوڵم و ستەم ناوبرد. زۆر بە توندی هێرشی کردە سەر((جۆرجی سێیەم)) و سیستەمی حکومڕانی بۆماوەیی، دایە بەر ڕەخنەو ڕوونیشی کردەوە کە نرخی کەسێکی داوێن پاك، چاکەکارو زەحمەتکێش بۆ کۆمەڵگە، لە هەموو(( تاج بەسەرە هەرزەکانی ئینگلیز)) زیاترە.

((پین)) وتی:((خەیاڵێکی خاوە وابیربکەینەوە کە هەتا هەتایە دورگەیەك بتوانێت کیشتوەرێك بەڕێوە ببات. هیچ بەڵگەیەك لەبەردەستدا نیە، کە سروشت مانگەکان لە هەسارەی سەرەکی گەورەتر دروست کردبێت و لەبەر ئەوەش کە ئینگلیز و ئەمریکا لە بەرامبەر یەکتری دا، پێچەوانەی یاسای ئاسایی سروشت ڕاوەستاون، ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو دووانە سەر بە دوو سیستەمی جیاوازن، ئینگلیز هی ئەوروپایە و ئەمریکاش هی خۆی.)) کاریگەری نامیلکەکەی((پین)) بە ئەندازەیەك بوو، کە لە ماوەی چەند مانگدا هەزاران هەزار ژمارەی لێ بلاوکرایەوە. هەروەها ئابراو ئاماژەشی بەوە کرد، کە خۆبەدەستەوەدان لە بەرامبەر جەورو ستەم و، گوێڕایەڵی بۆ دابونەریت نی یە کە مرۆڤ بەرەو پەستی و دۆگمابوون دەبات، بەڵکو پەستی و خوار و خێچی ئەو کاتە پەیدا دەبێت کە مرۆڤ خۆی لەبەرامبەر هێزێکدا بدات بەدەستەوە، کە بەلای خۆیەوە نارەوایەو بەئەزانی گوێڕایەڵی کەسانێك بکات کە دەستدرێژیکەر و داگیرکەرین. بەم هۆیەوە پێشنیازی دەکرد: یان خۆ بەدەستەوەدان و ڕازی بوون لەبەرامبەر حکومەتێکی ستەمکارو ڕزیو، یان بەهرەمەند بوون لە ناز و نیعمەتی ئازادی و بەختەوەری لە ژێر ڕۆشنایی کۆمارێکی ئازاد و سەربەخۆدا. لە ڕۆژی چوارەمی جولای ساڵی ١٧٧٦ کۆنگرەی فیلادلفیا، ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکای ئاشکرا کرد و بەهۆیەوە ویلایەتە یەکگرتوەکان توانی لە نێوان وڵاتانی گۆی زەوی دا بەمافەکانی یەکسانی و سەربەخۆیی خۆی شاد ببێت.

فەلسەفەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە((جۆن لۆك)) فەیلەسوفی بەناوبانگی ئینگلیزییەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەو ڕستەیەی کە سەرەتای ڕاگەیاندنەکەی پێ دەست پێدەکات، بەڕوونی کاریگەری بیروڕاکانی ((لۆك))ی لەسەر بەرجەستە بووە:((لەبەرئەوەی لە ڕێڕەوی ڕووداوە مرۆڤایەتیەکاندا، لەسەر کۆمەڵێك خەڵك پێویست دەکات کە مامەڵەو پەیوەندی سیاسی خۆیان لەگەڵ میللەتانی دیکەدا بپچڕێنن و پێگە و پلەوپایەیەکی یەکسان و جودا لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا

بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن، کە یاساکانی سروشت و خودای سروشت ئەو مافانەی پێبەخشیون، کەواتە ڕێزگرتنی شیاوی بیروباوەڕی خەڵکان وا دەخوازێت، کە ئەم خەڵکە، ئەو هۆکارانەی کە ئەوانی ناچار بەجیابوونەوە کردووە بەئاشکار ڕابگەیەنن، پاشان ئاماژە بە گریمانەکەی ((لۆک)) دەربارەی مافی تاکەکەس و پەیمانی کۆمەڵایەتی دەکرێت.((ئێمە دان بەو ڕاستیانەدا دەنێین، کە تەواوی مرۆڤەکان بە یەکسانی دروست کراون هەرتاکێکیش خاوەنی مافێکی ئینگاری نەکراوی خۆیەتی، لەوانە مافی ژیان و ئازادی و هەوڵ و کۆشش بۆ گەیشتن بە بەختەوەری. بەمەبەستی پاراستنی ئەم مافانە بۆ خۆیان چەندەها حکومەت دادەمەزرێنن و بەویست و ئارەزووی خۆیان هێز و دەسەلات بەم حکومەتانە دەبەخشن، هەرکاتێکیش ئەم حکومەتانە لە ئامانجەکەی خۆیان لایاندا، مافی سروشتی ئەو خەڵکەیە، کە حکومەتەکە بگۆڕین یان بڕوخێنن و حکومەتێکی نوێ بهێننە ئاراوە کە بتوانێت بە دەرکردنی یاسای لەبارو گونجاو بەکارهێنانی دەسەلاتی خۆی ئارامی و خۆشگوزەرانی بۆ خەڵکەکەی دابین و بپارێزێت.))

ئەگەر واز لە بنەما گشتییەکانی ڕاگەیاندنەکە بهێنین، [دەبینین] ئەوەی لە ناوەڕۆکی ڕاگەیاندنەکەدا ماوەتەوە، زیاتر لایەنێکی دیاری کراو بەخۆوە دەگرێت. واتە بریتی یە لە پێڕستێك لەو ڕەخنە و نارەزاییانەی کە لەلایەن دانیشتوانی داگیرگەکانەوە بەرەو ڕووی حکومەتی ئینگلیز بەرز کراوەتەوە . کۆتایی ڕاگەیاندنەکەش دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی، کە لەبەر ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی کە لێیان کراوە ئەمریکا جیابوونەوەی خۆی لە ئینگلیز ڕادەگەیەنێت و جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەبێت ئەو سیانزە کۆچنشینە، ئازاد و سەربەخۆ بن و ن لەهەموو کۆت و بەندەکان ڕزگاریان ببێت و وەك میللەتێکی سەربەخۆو ئازاد ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێت.

نوێنەرانی کۆنگرە بە هاوکاری و هاودەنگی ، یەکتریان بە ئەمریکایی ناوبرد و ، سەربەخۆیی خۆیان ئاشکرا کرد و بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئینگلیز ئامادەیی خۆیان ڕاگەیاند . یارمەتی سەربازی دەرەوەش فەراهەم کرابوو. لەساڵی ١٧٧٨ لەنێوان((بنجامین فرانکلین)) باڵوێز و نوێنەری ئەو ویلایەتانەی کەتازە سەربەخۆییان وەرگرتبوو، لەگەڵ ((لویی شانزەیەم)) پادشای فەرەنسادا، ڕێککەوتننامەیەك مۆرکرا و بەپێی ڕێککەوتنەکە فەرەنسا بە فەرمی دانی بە سەربەخۆیی ئەمریکادا ناو بەکەیەکی سەربازی هێزە دەریاییەکانی خۆی بۆ یارمەتی دانی سەربەخۆیی خوازان ڕەوانەی ناوچەکە کرد. جگە لەوەش ئەجیب زادەیەکی فەرەنسی کەناوی ((مارکی دولافایت)) بوو، توانی ڕەزامەندی پادشا بۆ ناردنی شەش هەزار سەربازی دیکە بەرەو ناوچەکە بەدەست بهێنێت.

بەم شێوەیە، بەشداری کردنی هێزەکانی فەرەنسا لە جەنگەکانی سەربەخۆیی و شکان و خۆ بەدەستەوەدانی هێزەکانی ئینگلیز بەدەست سوپای ((واشنگتۆن))ەوە، کاریگەریەکی ئێجگار زۆری هەبوو . یارمەتی و هاوکاری کردنی حکومەتی فەرەنسا، زیاتر لەبەر دوو هۆکار بوو: یەکەم، لێسەندنەوەی داگیرگەکانی خۆی کە پێشتر حکومەتی ئینگلیز دەستی بەسەردا گرتبوو. دووەم، بەمەبەستی لاواز کردنی دەسەڵاتی ئینگلیز لە ئەمریکای باکور، کە دواتر ئەنجامێکی زۆر قورس و گرانی بۆ((لوی شانزەیەم)) بنەماڵەکەی لێکەوتەوە و، بۆماوەی دەساڵ ئاگری شۆڕش فەرەنسای داگرتەوە و کۆتایی بە حکومەتی پادشایەتی ((بۆربۆن)) هێنا.

جەنگەکانی سەربەخۆیی لەساڵی ١٧٧٦ ــ ١٧٨٣ درێژەیان کێشا. قورسترین ئەبەردیش لە ساراتۆگا ڕووی دا، کە خۆ بەدەستەوەدانی بەشێکی هێزەکانی ئینگلیزی لێکەوتەوە. لە یۆرک تاون و لەساڵی ١٧٨١ هێزەکانی ئینگلیز خۆیان تەسلیم بە هێزەکانی جۆرج واشنگتۆن کرد. لە ئەنجامدا و بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەی کەلەساڵی ١٧٨٣ لەپاریس مۆرکرا، حکومەتی ئنگلیز بە ڕەسمی دانی بەدەسەڵاتی ئەو سیانزە داگیرگەیەدانا ، بەناوی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە.

ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی تەنها بریتی نەبوو لە جیابوونەوەی ئەمریکا لە ئیمپراتۆریەتی ئینگلیز . بەڵکو ئاراستەکردنی شۆڕشێك بوو لە دژی حکومەتێکی ڕەسمی تۆمار کراو (مسجّلی). ناوەڕۆکی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە ڕاستی دا وەرگێڕدراوی فەلسەفەی مافی سروشتی ئەو سەردەمە بوو. لە سیانزە ویلایەتەکەدا، پێشکەوتنێکی گەورە لە ڕووی یەکسانی مافی خەڵکی بەگشتی بەدی هات و هەرچەندە بوونی سەرمایە مەرجێکی بنەڕەتی بەشداری کردن لە هەڵبژاردنەکان بوو، بەڵام ئەم ڕێژەیە بەشێوەیەك هاوسەنگ کرا، کە زۆرێك لە تاکەکانی کۆمەڵگە، کە پێشتر مافی دەنگدانیان نەبوو، بۆ هەڵبژاردنی دەستەی یاسادانان و خزمەتگوزاریە گشتییەکان بەشداری بکەن و، بڕیاریش درا ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانان بە شێوەیەکی یەکسان، پێناسەی [نوێنەری] ژمارەیەکی یەکگرتووی خەڵکی ئەمریکابن. ئەمەش بابەتێك بوو کە لە ئەنجومەنە پەرلەمانیەکانی ئەوروپادا بەهیچ شێوەیەك باسی لێوە نەکرابوو.

زۆرێك لە دامەزراوە شێوە فیودالیەکان، وەك ئەوانەی کە لە ئەوروپادا هەبوو، ڕیشەکێشکران. ئەو کرێیەی کە لە بەرامبەر بەکارهێنای زەوی کشتوکاڵی لە جوتیاران دەسەنرا، لە زۆربەی ویلایەتە نوێیەکاندا هەڵگیرا. هەندێك مافی وەك بۆماوەیی بنەماڵەکان و مافی تایبەت، کە بەهۆیەوە خێزانە سەرمایەدارەکانی وەك چینی خانەدان ژیانیان پێ دەبردە سەر،

لەناوبران. دەیەکی کڵێسەش وەستێنرا و پلەو پایەی مەزهەبە ڕەسمییەکانی وەك کڵێسەی ئینگلیز لەناوچەی باشوور کەوتە ژێر پرسیارەوە.

بەڵام شۆڕشی ئەمریکا، نە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە دەگەیشتە قووڵایی شۆڕشەکەی فەڕەنسا ـ کەزۆر بە خێرایی سەری هەڵدا ـ و نە شۆڕشەکەشی بەئەندازەی ئەو شۆڕشەی کە لە ساڵی ۱۹۱۷ لە ڕوسیا بەرپاکرا فراوان بوو. ماڵ و سەرمایە، لەدەستی گروپێکەوە بۆ گروپێکی دیکە گوازرایەوە. گۆڕانکاریەکی کچکەش لە ڕووی یاسای مولکدارییەوە ئەنجام دراو، یاسای عورفی ئینگلیزی کە بە میرات بۆیان مابوویەوە، لەهەموو شوێنەکان وەك خۆی مایەوە. لە سەرتاسەری ناوچە کۆچنشینە ئینگلیزییەکانی ئەمریکادا، ئەشوێنەوارێکی سیستەمی خانەدانی مابوویەوە، نە ئەسقەفێکی دەسەڵاتدار. لەڕاستی دا، چینی خانەدان و پیاوانی ئایینی ئەو پلەو پایەو دەسەڵاتەی کە لە کۆمەڵگەی ئەورووپی دا هەیانبوو، هیچکات نەیانتوانی لە کۆمەڵگەی ئەمریکی دا بەدەستی بهێنن. لەبەرئەوە شوێنەواری ئەو شۆڕش و هەڵچوونەی کە دژی ئەوان بەرپا کرا، کەمتر کاریگەر بوو. بەڵام شۆڕشی ئەمریکی، هێشتا نەیتوانی گۆڕانێکی ئەوتۆ لە کۆمەڵگەکەیدا بکات. سیانزە ویلایەتەکە کە کۆماری ئەمریکایان پێك هێنا، هەریەکەو بۆخۆی لە ئازادی ناوخۆیی و حکومەتێکی مەحەللی بەرخوردار بوون، لە کاتێکدا کە فەڕەنسا حکومەتێکی مەرکەزی و سیستەمی چینایەتی تێدا پەیڕەو دەکرا. ئەوەی لە ئەنجامی شۆڕشی فەڕەنسی دا هاتە ئاراوە، بریتی بوو لە دەسەڵات گرتنە دەستی چینی ناوەندی کۆمەڵگە، لە کاتێکدا کە کۆمەڵگەی ئەمریکا، پێش شۆڕشیش دەسەڵاتی بەڕێوە بردنی کاروبارەکانی ناوخۆی وڵاتی هەر لە ئەستۆی چینی ناوەندا بوو. لەکۆی ئەو پەنجاوپێنج کەسەی کە ڕاگەیاندنی سەربەخۆییان واژوو کرد، لە ٧٥٪ یان، هەریەکەو بەجۆرێك لە سەردەمی داگیرگەکاندا لەکاروباری سیاسی دا بەشداری کردبوو، زۆربەشیان خاوەنی خوێندەوارییەکی باش و ئیمکاناتێکی ماددی لەباربوو. ئەم بەردەوامییە لە ڕابەرایەتی سیاسییاندا، سەقامگیری و هێمنییەکی وای هێنابوویە ئاراوە کە زۆرجار لەگەڵ ووشەی شۆڕش دا هەماهەنگ نی یە.

بەو شێوەیەش کە ((تۆکویل)) ئاماژەی پێکردووە:(( ئەمریکا بوو بەخاوەنی دیموکراسی بەبێ ئەوەی شۆڕشێکی دیموکراتیکی تێدا ڕوویدات. ئازاد بونیاد نراو بەبێ ئەوەی بیەوێت ئازادی بەدەست بهێنێت.)) شۆڕشی ئەمریکی پێویستی بەوە نەبوو، کە کۆبونەوەی خانەدانەکان و یان کڵێسەی دەسەڵاتدار و خاوەن پلەو پایە هەڵوەشێنێتەوە. گرنگترین دەستکەوتی شۆڕشی ئەمریکا، لە ڕووی سیاسی و چەسپاندنی دەسەڵاتی دەوڵەتێکی پابەند بەیاساوە بوو. [وەك

ئامانجەمان پێکرد]، سەرچاوەی هەموو ئەم بیروباوەڕانە [لە کانیاوە دەوڵەمەندەکەی] فەیلەسوفی ئینگلیزی ((لۆك))ەوە هەڵدەقولا. لەم لاشەوە سەرکردە سیاسییەکانی ئەمریکا خۆیان بەشێك بوو لە سەردەمی ڕۆشنگەری و باوەڕی تەواویان بەم بۆچونانە هەبوو. بیردۆزەکانی((مۆنتسکیو)) دەربارەی جیاکردنەوەی هێزەکان، بەڵێنی میللەت و قانونی ئەساسی نوسراو، لەو جۆرە بیروباوەڕانە بوون، کەلە ئەمریکادا لایەنگرێکی زۆریان هەبوو. ئەمریکییەکان زیاتر لەهەر میللەتێکی تر، باوەڕیان وابوو، کەدەوڵەت دەبێت، تەنها خاوەنی دەسەلاتێکی سنورداربێت و، بەپێی مەرجەکانی قانونێکی ئەساسی نوسراو دیاری کراو هەنگاو بنێت. ئەوان، سوربوون لەسەر ئەوەی، کە پێویستە قانونی ئەساسی دەرهاویشتەی یاساو ڕێسایەك بێت، دەسەلاتدار بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان میللەت و دەوڵەت و چاودێر بەسەر سیستەمی دەوڵەتەوە.

ویلایەتە یەکگرتووەکان، لەسیانزە ویلایەتی تاقانە و خۆبەڕێوەبەر پێك دەهات. پاش بەستنی پەیماننامەیەك بەناوی پەیمانی((کۆنفدراسیۆن)) لەساڵی ١٧٨١، ویلایەتەکان بەشێوەیەکی نا هاوپەیمان و ئازاددا یەکیان گرتبوو، هەرچەندە دامەزراندنی ئەم شێوازەی حکومەت، کۆمەڵێك گرفتی سیاسی و ئابوری لەگەڵ خۆیدا هێنا.

لەڕووی سیاسەتی دەرەوەوە، کاروباری بازرگانی، ڕێکخستنی بودجەو ڕێك و پێککردنی باجەکاندا، هیچ جۆرە دانوسان و هەماهەنگیەك لەنێوانیاندا نەبوو. پاش ڕاپەڕینی ژمارەیەك لە جوتیاران بەسەرکردایەتی ((دانیەل شیز)) لە ماساچوسێت، سیاسەتمەدارانی ئەمریکا بڕیاریان دا، حکومەتێك بەدەسەلاتێکی مەرکەزی لە یەکێتی ویلایەتەکان و بەپێی قانونی ئەساسی دابمەزرێنن. بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵێك لە نوێنەرانی ویلایەتەکان لەشاری فیلادلفیادا کۆبونەوەیەکیان سازکرد و تیایدا گفتوگۆیەکی تێروتەسەلیان دەربارەی داڕشتنی قانونی ئەساسی ئەنجام دا.

قانونی ئەساسی لە ساڵی ١٧٨٩ تەواو کراو((جۆرج واشنگتون)) ڕابەری سەردەمی شۆڕشی ئەمریکا، وەك یەکەمین سەرۆك کۆماری ئەو وڵاتە هەڵبژێررا. قانونی ئەساسی لەپێشەکیەك و حەوت بنەمای سەرەکی پێکدەهات. لەساڵی ١٧٩١ مافە شارستانییەکان دەربارەی ئازادی مەزهەب، ڕادەربڕین، بلاوکراوەکان، ئەنجامدانی کۆبوونەوەو دەربازبوون لە تاوانبارکردنی بێپاساو و لەخۆوە بڕیاریان لەسەر درا و ، تێکڕای تاکەکانی کۆمەڵگەیش بەبێ جیاوازی و بەشێوەیەکی یەکسان لەم مافانە بەهرەمەند دەبوون، چونکە ئەم مافانە بەپێی بنەمای یەکسانی تاکەکان لەبەرامبەر یاسادا دەستنیشان کرابوو. هیچ مەزهەبێکی دیاری کراو وەك ئایینێکی ڕەسمی دانی

پێدا نەنراو ئازادی ئایینزا، بۆ هەمووان مسۆگەر کراو حکومەت لەسەر بنچینەی عەقڵ و مەنگق لە مەزهەب جیاکرایەوە. لە قانونی ئەساسی دا، ویلایەتە یەکگرتووەکانیان، نەتەنها بەکۆمەڵگەیەك لە ویلایاتی تاقانە پێناسە کرد، بەڵکو بە یەکیەتیەکیان دانا، کە تیایدا تاکەکان لە پێناو کۆمەڵێك مەبەستی پەنابەرانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا حسابیان بۆ بکرێت و لەهەمان کاتیشدا ببنە هۆکارێك لەپێناو ئامانجەکانی پەنابەرانی نێو ویلایەتەکانی خۆیاندا. ئەمە فەلسەفەی حکومەتی فیدراڵی بوو . کۆماری فیدراڵی، تێکەڵبوونی تاکەکان بوو نەك ویلایەتەکان. یاسای نێو ویلایەتەکانیش خرایە ئەستۆی خودی کەسەکان نەك ویلایەتەکان. هەر سیانزە ویلایەتەکە، بەخێرایی دەستیان بە نووسینی قانونێکی هاوشێوەی قانونی ئەساسی فیدراڵ کردوو، هەموویان بە تێکڕا، بنەمایەکی دانپێدانراوی یەکگرتوویان لەقانونە ئەساسیەکانی خۆیاندا گونجاند.

لەقانونی ئەساسی دا، هاتووە، سەرچاوەی دەسەڵاتی حکومەت، میللەتەو ،دەوڵەت بۆ پاراستنی مافە سروشتییەکانی تاکەکان دامەزراوە. هەرکاتێك دەوڵەت نەیتوانی ئەرکەکانی خۆی بەرامبەر بە میللەت جێبەجێ بکات، خەڵکی مافی خۆیانە، لەپێناو ئاسایش و خۆشگوزەرانی خۆیاندا، ئەم دەسەڵاتە لە حکومەت بسێننەوەو، دەوڵەتێکی دیکە بهێننەکایەوە. بابەتێکی دیکە، مەسەلەی سەربەخۆیی ویلایەتەکان بوو لەبەردەم حکومەتی فیدراڵی دا. بەشێوەیەك کەحکومەتی فیدراڵ، کاروباری دەرەوە و بەرگری و سیاسەتی گشتی و بازرگانی پێدەسپێردرێت و کاروباری ناوخۆی نێو هەرویلایەتێکیش دەدرێتەوە دەست حکومەتی ویلایەتەکان. دەسەڵاتی سیانی جێبەجێ کردن، یاسادانان و دادوەری، تاڕادەیەك لە یەك جیاکرانەوە و دەسەڵاتی یاسادانان لەدەرکردنی یاساکاندا سەربەخۆییەکی تەواوی بەدەست هێنا . سەرۆك کۆمار، دەتوانێت بەبەکارهێنانی مافی ڤیتۆ، یاساکان هەڵوەشێنێتەوە، بەڵام کۆنگرێس دەسەڵاتی ئەوەی پێدراوە، کە بەکۆکردنەوەی دوو لەسەر سێی دەنگەکان، بڕیارەکەی سەرۆك کۆمار لەغوو بکاتەوە . دەسەڵاتی دادوەریش سەربەخۆییەکی تەواوی هەیە. دەسەڵاتی دادگای فیدراڵ، لەلایەن دادگایەکی یەکگرتووەوە بەڕێوە دەبرێت، کەپێی دەوترێت دادگای باڵای وڵات و ئەرکی بەدواداچوون و ڕادەربڕین دەربارەی جێبەجێکردن یانەکردنی یاسا ئاساییەکان لەگەڵ قانونی ئەساسی دا دەگرێتە ئەستۆ. بە ڕوودانی هەر ناکۆکیەك لە نێوان حکومڕانی میللی و ویلایەتیدا، دادگای فیدراڵ بۆ ئەم مەبەستە ڕاوسەرنجەکانی خۆی دەخاتە ڕوو. هەرکاتێك دەستەی یاسادانان بیەوێت سنووری مافەکانی دەسەڵاتی یاسادانان بەزێنێت، یان دەسەڵاتی جێبەجێکردن لەبازنەی

دەسەلاتەکەی خۆی تێپەڕ بکات، ئەو کاتە دادگای باڵا دەست بەکار دەبێت و بەدواداچوونی لەسەر دەکات. هەرچەندە دەسەلاتی جێبەجێکردن ناتوانێت لە سنووری ئەو دەسەلاتەی کەبۆی دانراوە بچێتەوە دەرەوە، بەڵام هەرهیچ نەبێت دەتوانێت ببێتە کۆسپێکی گەورە لەبەردەم زۆرداری و تاکڕەوییەکانی دەسەلاتی جێبەجێکردندا. ئەندامانی دادگای باڵا نۆ کەسن و بە پێشنیازی سەرۆك کۆمار و بڕیاری سنا تا کۆتایی تەمەنیان هەڵدەبژێرێن. ویلایەتە یەکگرتووەکان، لەڕووی دادوەرییەوە بەسەر چەند ناوچەیەکدا دابەش دەکرێت، کەلە هەر ناوەیەکدا یەك دادوەری فیدراڵی نیشتەجێ دەبێت و ئەو دادگایانەش بە دادگای ناوچەیی ناودەبرێن و جگەلەمانەش دادگاکانی تێهەڵچوونەوە (استئنافی) و لەکۆتاییشدا دادگای ویلایەتی و دادگا جۆربەجۆرەکانی نێو شارۆچکەکان و ناحیەکان، تایبەت بە لێپرسینەوەی مەسەلەکانی ناوخۆی ویلایەتەکان کاریان دەکرد. هەڵبژاردنی ئەم جۆرە دادوەرانەش لە ڕێگەی دەنگدانی گشتی لە ویلایەتەکاندا دەبێت.

کۆنگرێسی ئەمریکا لەهەردوو ئەنجومەنی نوێنەران و سنا پێك دێت. نوێنەرانی ئەنجومەنی کۆنگرێس هەر دوو ساڵ جارێك و، نوێنەرانی سنا هەر شەش ساڵ جارێك بۆ ئەم پۆستە هەڵدەبژێررێن و ژمارەی نوێنەرەکانیش پێویستە بەپێی ژمارەی خەڵکی ناوچەکە لەنێو ویلایەتەکاندا دەستنیشان بکرێت. هەر ویلایەتێك مافی کاندید کردنی دوو سیناتۆری هەیە. جگە لە کۆنگرێسی ئەمریکا، کە لە شاری واشنگتۆن دا جێگیر بووە، هەر ویلایەتێك بۆخۆی خاوەنی ئەنجومەنێکی نوێنەران و سنایەکی مەحەللی دەبێت، کە بە شێوەیەکی تایبەتی کاروباری ویلایەتەکان هەڵدەسەنگێنێت. دەسەلاتی جێبەجێکردنیش لەسەرۆك کۆمار و دەستەی وەزیران و ڕاوێژکارانی باڵا پێك دێت. هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار هەر چوار ساڵ جارێك و لەلایەن تێکڕای خەڵکی ویلایەتەکانەوە بەڕێوە دەچێت، وەزیرەکانیش بەپێ ی پێشنیازی سەرۆك کۆمار و پەسەندکردنی کۆنگرێس هەڵدەبژێررێن.

یەکێك لە مەبەستە سەرەکییەکانی قانونی ئەساسی، بریتی بوو لە ڕێزگرتن لە دەسەلاتی یاسا، کە لە ڕاستی دا بنەمایەکی بەهێزی کۆمەڵگە پێك دەهێنێت. لە ئەمریکا، بەهیچ شێوەیەك بیر لە بەزاندنی سنووری بنەماکانی دەسەلاتی کۆمەڵگە نەدەکرایەوە و هیچ کاتێکیش سنورێك بۆ ئەو دەسەلاتە دانەنێن، بەڵکو بۆ پاراستن و دابینکردنی ئازادی دەستیان بەدابەش کردن و جیاکردنەوەی هێزەکانی نێو کۆمەڵگە کرد. مەبەستیشیان ئەوەبوو کە دەسەلاتی کۆمەڵگە فراوان و بێسنوور بێت، بەڵام لێپرسراو و جێبەجێکەرانی، بەهۆی گوێڕایەڵیان بۆ یاسا بچووك و سنوردا بێننەوە. چونکە هەر ئەندازە حکومەت، دەسەلاتێکی یاسایی سنورداری بۆ بەکارهێنانی

ئیختیاراتەکانی هەبێت، بەهەمان ئەندازەش لە مەترسی تاکڕەوی و زوڵم و زۆرداری کەم دەکرێتەوە. بە ووتەی ((مەدیسۆن)) کە یەکێکە لەسەرکردەکانی شۆڕشی ئەمریکا، کەسانی خاوەن دەسەلآت، شایستەی متمانە پێکردن نین، هەرچەندە دواتر لەلایەن مێژوو نووسی بەناوبانگی ئینگلیزی لۆرد ((ئەکتۆن))ەوە بلاوکرایەوە:(( دەسەلآتی ڕەها، فەسادی ڕەهای لێدەکەوێتەوە.)) ئەم باوەڕەش کە ئارەزووی دەسەلآت ـ چ تاکەکەسی یان بەکۆمەڵ ـ پێویستە بەڕێگایەك کۆنترۆڵ بکرێت، بەزیندویی مابویەوە و، لە ڕێگەی داسانی یاسا و چاودێری کردنی یاسا لەسەر هەڵسوکەوتی تاکەکان پراکتیکیان دەکرد. بەووتەی ((جۆن ئادامز)) دووەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا:(( لەو شوێنەی کە هەڵبژاردنی تاکەکان لەسەر بنەمای دەنگی زۆرینەو حکومەتی یاسا کۆتایی پێ بێت، زولم و زۆرداری دەست پێدەکات.))

هەنگاوێکی دیکە کە لەم سالآنەدا جێبەجێکرا ، بریتی بوو لە بڕیاری پێکهێنانی دامەزراوە سنووردارە دەوڵەتیەکان لە زەوی یە نوێیەکانی ڕۆژئاوادا، کە خاڵی پەیوەندی نێوان ژیانی سنوور نشینی و دامەزراوە ڕەسمی یە ویلایەتیەکان بوون. ئەم بڕیارە بەدەرکردنی فەرمانێکی تایبەت بە زەوییەکانی باکوری ڕۆژئاوا لەساڵی ١٧٨٧ خرایە قۆناغی جێبەجێکردنەوە و، بەڵێنی دروستکردنی چەند ویلایەتێکی نوێیان لەناوچەی باکوری ڕوداهایۆ ـ بەمەرجێك لەهەموو ئەو مافانەی کە بەسیانزە ویلایەتەکەی تر دراوە، بەهرەمەند بێت ـ دا ئەم هەنگاوەش بەتەنها ڕێگایەك بۆ پەرەپێدان و فراوان بوونی زەوییەکان و دامەزراندنی ویلایەتە نوێیەکان لەقەڵەم دەدرا.

قانونی ئەساسی بەڵگەنامەیەکی سیاسییەو بەبەراورد لەگەڵ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، لایەنێکی محافظ کارانەی پێوە دیارە. لە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیدا، یەکسانی تێکڕای تاکەکانی مرۆڤایەتی بەڕاشکاوی دانی پێدا نراوە، لەکاتێکدا کە قانونی ئەساسی، بەجەخت کردنەوە لەسەر مافی خاوەندارێتی و سەرمایەو پێشێلکردنی مافی ڕەشەکان ـ کە پاراستنی سیستەمی کۆیلایەتی لێکەوتەوە ـ بنەمای یەکسانی مرۆڤەکانی بەگشتی پیشتگوێ خستووە. مێژوو نووسی بەناوبانگی ئەمریکی((چارلز بیرد)) قانونی ئەساسی بەناکامی چالاکی و بیرکردنەوەی کەمایەتیەك دەزانێت، کەلەبەر هەبوونی دەسەلآتی ئابوری، داوای بەڕێوە بردنی زۆرینەیان دەکرد. هەڵبەت لە ناوەڕۆکی قانونی ئەساسی دا هیچ ئاماژەیەك بە دارایی و سەرمایە لە ڕووی پلەو پایەی کۆمەلآیەتی یان پێگەو پیشە بۆ گروپێك یان چینێکی دیاری کراو ناکرێت و بەبەراورد لەگەڵ قانونی ئەساسی فەرەنسا، کە لە ساڵی ١٧٩١ بە ئاشکرا جەخت لەسەر خاوەندرێتی و سەرمایە دەکاتەوە ، ئەم مەسەلەیە بە ئاشکرا دانی پێدا دەنرێت. هەموو ئەو وتارانەی

کە((هامیلتۆن))، ((مدیسۆن)) و((جۆن جی)) ـ لەو کەسایەتیە ناودارانەی کە لە نووسینەوەی قانونەکەدا بەشداریان کردبوو ـ بۆ بەرگری کردن لە حکومەتی مەرکەزی بلاّویان دەکردەوە، بەوتاری فیدرالیستی ناوبانگی دەرکرد. لەدەقی ئەو وتارانەدا بەرگری کردن لە خاوەنداریتی تایبەتی و سەرمایە، زۆر بەروونی دەردەکەویت و، لەواقیعدا بەیەکێك لە چاکترین نمونەکانی لێکدانەوەی ئابوری سیاسی هەژمار دەکریت و ئامانجیشی هاندان و ناچارکردنی ویلایەتە جۆراوجۆرەکانە، بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی بتەو و راوەستاوی حکومەتی، کە کرنتی دارایەکی پێویست دەستەبەر بکات. بەلگەنامەکانی فیدرالیست، خوێندنەوەیەکی بەناوبانگ و بەنرخە لەبواری ئابوری سیاسی دا. هەمان ئەندازە کە باوەڕی بە بەمەرج بوونی ((مشروگیت))ی دەوڵەت و سەروەری یاسا و مافی کۆمەلاّیەتی تاك هەیە، بەو ئەندازەیەش جەخت لەسەر مافی خاوەنداریتی تاکەکەسی و داهێنانی ئابوری تاك و سەرمایەگوزاری تایبەتی دەکاتەوە. بەشێوەیەکی گشتی رۆڵی دەوڵەت لە چالاکییە ئابوریەکاندا بە پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی بەرقەرارکردنی ئارامی و دروستکردنی ژینگەیەکی لەبار دەزانێت، کە تیایدا تاکەکان بتوانن بەئاسوودەیی، سەرمایەکانی خۆیان لە چالاکییە ئابوریەکاندا بخەنەگەڕ.((مدیسۆن)) لە یەکێك لە نامەکانی فیدرالیستدا دەنوسێت:(( یەکەمین مەبەستی سەرەکی هەر حکومەتێك بریتی یە لە پشیوانی کردن لە مافی دارایی و مافی خاوەنداریتی و دەرکردنی چەند یاسایەك کە سەرمایەداری و مافی دارایی تاکەکان مسۆگەر بکات.))

((هامیلتۆن)) لەوتارە فیدرالیستیەکانی خۆیدا، جەخت لەسەر حکومەتێکی مەرکەزی و بەهێز دەکاتەوە، کە بەوپەڕی تێگەیشتن و زیرەکی بەرژەوەندییەکانی زۆرینەی خەلّك بپارێزێت و بەڕێوەبەرێت.

پاراستنی سیستەمی کۆیلایەتی، بەگرنگترین مەسەلەی نێو ویلایەتەکانی باشور و سەرەکیترین بابەت لەڕووبەڕوو بوونەوەی بیروباوەڕی نێوان ویلایەتەکانی باکور و باشور دەژمێررا. بۆ رێگە گرتن لەم جۆرە ڕوو بەڕوو بوونەوانە و بەدەست هێنانی دەنگی دانیشتوانی باشور، لە نووسینەوەی قانونی ئەساسی دا، ئەم مەسەلەیە بە خامۆشی مایەوە و ڕەشپێستەکان وەك هاولاتییەکی ئەمریکی کە خاوەنی مافێکی دیاری کراوی خۆیان بن دانیان پێدا نەنراو هیچ جۆرە ئاماژەیەکیش بەمەسەلەی ئازاد کردنی کۆیلەکان نەکرا. ((مدیسۆن)) لە نامەیەکدا کە بۆ ((لافایت))ی نارد جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کەتەنانەت ئاماژە کردن بە مەسەلەی کۆیلایەتی، لەکاتی نوسینەوەی قانونی ئەساسی دا،((وەك بزیسکێك وابووە لەنێو ئەنبارێکی باروت))دا.

پاراستنی کۆیلایەتی ویشتگوێ خستنی ئەم گرفتە کۆمەلآیەتییە لە واقیعدا بۆ بەدەست هێنانی دەنگی ڕەزامەندی ویلایەتەکانی باشوور زۆر پێویست و زەرور بوو هەروەها بەتەنها ڕێگایەکیش بۆ پاراستنی یەکیەتی و یەکریزی نێوان ویلایەتەکان دادەنرا.

کاریگەری شۆڕشی ئەمریکا لەسەر ولاتانی ئەوروپا لەماوەیەکی زۆر کورتدا دەرکەوت. بەهۆی ئەو جەنگەی کە لەگەلّ ئەمریکادا بەرپای کرد، ئەرکێکی زۆر قورس کەوتە سەرشانی حکومەتی فەرەنسا و یەکێك لە دەرەنجامەکانیشی سەرهەلّدانی شۆڕشی ناوخۆ بوو لەو ولاتەدا. لەهەمووی گرنگتر ئەوەبوو ، کە شۆڕشی ئەمریکا بوو بەسەرەتای سەرهەلّدانی شۆڕشگەلێکی ئازادیخوازانە، کە هەندێکیان تا سالّی ١٨٤٨ درێژەیان کێشا. بەدەست هێنانی سەربەخۆیی ئەمریکا، بەلای ئەوروپیەکانەوە نیشانەی ئەوەبوو، کە دەکرێ، زۆرێك لە بیرو ڕاکانی سەردەمی ڕۆشنگەری، بخرێنە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە. بەلاّم ئەوەی زیاتر لە هەموو شتێك کاریگەری لەسەر بیری ئەوروپیەکان بەتایبەت ولاتی فەرەنسا دروست کردبوو، ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی و دارشتنی قانونی ئەساسی بوو. دانای فەرەنسی ((لارو شفوکۆ)) ڕاگەیاندنەکەی وەرگێڕایە سەر زمانی فەرەنسی و، ئەمەش وایکرد کە گفتوگۆیەکی لەڕادەبەدەر لەسەر ئەم ڕاگەیاندنە لەنێو هەموو چین و توێژەکانی فەرەنسادا سەرهەلّبدات.

مەشروگە خوازی، فیدرالیزم و، سنوورداركردنی دەسەلاّتەکانی حکومەت، بەلای ئەوروپیەکانەوە شتێکی تازە نەبوو، بنچینەی ئەم بیر و بۆچونانە لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە سەرچاوەی دەگرت، بەلاّم بەو شێوەیەی کە باوبوو - بۆنمونە لەفەلسەفەی مۆنتسکیودا- ئەم بیرکردنەوانە زیاتر لەسیستەمی دەرەبەگایەتی و خانەدانەکانەوە نزیك بوون. شۆڕشی ئەمریکا، شێوازێکی پێشکەوتن خوازانەی بەم بیرکردنەوانە بەخشی . سەرکەوتنی ئەم بیرکردنەوانە و لەگەلّ ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ئەوروپا سەریان هەلّدا، بۆچوونی ڕووناکبیرانی دواتری زیاتر لەگەلّ بنەماکانی دیموکراسی دا هەماهەنگ کرد. قوتابخانەیەك لە چاکسازی ڕادیکالّ خوازی لە ئینگلیز سەری هەلّدا. ئیدی لە ئەوروپا متمانە بە حکومەتی ((زۆرداری بریقەدار)) نەدەکراو باوەڕی خەلکی بە حکومەتی مەردووم ڕۆژ بەڕۆژ زیادی دەکرد. کردوەی ئەمریکییەکان، بەشێك لەو بیروباوەڕانەی ئەوروپایان هێنایە سەر ئەمەری واقیع و بەشێوەیەکی عەمەنی پێشکەشیان کرد. ئەمەش خۆی بەلگەیەکی ڕوون و ئاشکرا بوو، لەسەر ئەوەی کە فەرەنسیەکان، لەسالّی ١٧٨٩ شۆڕشەکەی خۆیان بەڕاگەیاندنی مافی مرۆ و نووسینی قانونی ئەساسی دەست پێکرد.

جارج واشنگٹن

بنجامن فرانکلن

کۆبوونەوەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی

نارەزایی خەلکی دژی یاسای پوول

سەربازانی ئینگلیز لە شاری بۆستۆن تەقە لە خەلکی دەکەن

ویلایەتە یەکگرتووەکان لە سالی ١٧٨٧

کۆمەڵگەیـەدا باردەکـات و زوڵـم و سـتەم بـاڵی بەسـەر هەمووانـدا دەکێـشێت. حیزبەکـەی ((جفرسـۆن)) بەناوی ((کۆماریخوازی دیموکرات)) ناوبانگی دەرکرد. ئامانجی سەرەکی جفرسۆن و لایەنگرەکانی ئەوەبوو:((ئەگەر لە دامەزراندنی حکومەتێکدا، کە بتوانێت دەسەڵاتی زۆرینـەی خەڵك دەستە بەر بکات، سەرکەوتن بەدەست نەهێنین، درەنگ یا زوو ڕووبەڕووی حکومـەتێکی تاکڕەوی ڕەها دەبینـەوە.)) چـونکە((لـە کۆمەڵگەیەکـدا کـە لەسـەر بنـەمای یەکـسانیەکان دابمەزرێت، تاکەکان بـە ڕەزامەنـدی خۆیـان ملکەچـی یاسـاکان دەبـن و حکومـەتیش لەبەر پێویستی لە لایەن تێکڕای خەڵکەکەوە ڕێزی لێدەگیرێت.))

بەشێوەیەکی گشتی(( کۆماریخوازانی دیموکرات))، لایەنگری مـافی تێکـڕای خـەڵك و دژی چڕبوونەوەی دەسەڵات بوون، لە کاتێکدا کە (( فیدرالیستەکان)) داوای چڕبوونەوەی دەسـەڵاتیان دەکرد لە ژێر دەستی کەمینەیەکدا، کە لە کۆمەڵگەدا خـاوەنی پێگـەو ناوبـانگێکی تایبـەتی بوون. ئەو پشێوی و ئاڵۆزییەی کە وڵاتی فەڕەنـسـای گرتـەوە ـ وەك ڕووخـانی کۆنڤانـسیۆن و دەسـت پێکردنـی سـەردەمی تـیرۆرو حکومـەتی ڕۆبـسبیر ـ ترسـێکی زۆری خـستە دڵـی ((فیدرالیست))ەکانەوە و ئەوانی لە ئەگەری ڕوودانی هەرجۆرە کارێکی تێکدەرانە نیگەران تـر کرد. لەبەر ئەوە ((فیدرالیستەکان)) کە خوازیاری کەم کردنەوەی دەسـەڵاتی زۆرینە بـوون، لـەو سەردەدا سـەرنج و بایـەخێکی زیاتریـان پێـدرا.((جـۆرج واشـنگتۆن)) وەك یەکـەمین سـەرۆك کۆماری ئەمریکا، لەلایەن ((فیدرالیست))ەکانەوە هەڵبژێررا و حیزبەکەشی تـوانی بـۆ مـاوەی دوانزە ساڵ جڵەوی دەسەڵات لە ئەمریکا دا بگرێتە دەست. ((جۆرج واشنگتۆن)) دوو کەس لـە کەسـایەتیە ناودارەکـانی نێـو حیزبـە جۆراوجۆرەکـانی بـۆ هاوکـاری بانگهێـشت کـرد، ((هامیلتۆن))ی لە حیزبی ((فیدرالیست)) بـۆ پۆسـتی وەزیـری خەزێنـە و((جفرسـۆن)) ی لـە حیزبی ((دیموکرات)) بۆ وەزیری دەرەو و بەشداری کـردن لـە کاروبـاری بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت دەست نیشان کرد.

سیاسەتی ئـابوری ((هـامیلتۆن)) لەسەر بنـەمای هاندانی سەرمایەگوزاری تایبـەتی و بەدەستهێنانی پشتیوانی بازرگانەکان و دابینکردنی هۆکاری پێویست بـۆ داهێنـانی تاکـەکان، لەگەڵ پشت بەستن بە دەوڵەتێکی بەهێز دەڕۆشت، کە بتوانێت بەدەستە بەر کردنی هۆکارەکانی بەرقەرار کردنی ئاشتی و ئـارامی و ڕەخـساندنی هەلومـەرجێکی لـەبارو گونجـا و، هاوکـاری کەسایەتیە ناودارەکان بەدەست بهێنێت و، بەرەو زیاد کردن و وەگەرخـستنی سـەرمایە هانیـان بدات. یەکێك لە پێشنیازەکانیشی بریتی بوو لە، دانەوەی تـەواوی قـەرزەکانی ویلایەتـەکان ـ

کەبەهۆی جەنگەکانی سەربەخۆییەوە لێیان کەوتبوو ـ لەلایەن حکومەتی فیدراڵییەوە. بەم شێوەیە بەڵگەی بەهادار کەوتە بەردەستی هاوڵاتیان بەڵام زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئەم قەباڵانەیان دەکڕی سەر بەچینی دەسەڵاتدار و دەوڵەمەندی کۆمەڵگەی ئەمریکا بوون.((هامیلتۆن))یش، هەر لەبەرئەوەی ویستبووی، دەسەڵاتی مەرکەزی لە ڕێگەی دەوڵەمەندەکانەوە بەڕێوە ببات، ڕوو بەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر بوویەوە. یەکێکی تر لە پێشنیازەکانی هامیلتۆن دامەزراندنی بانکی مەرکەزی فیدراڵی بوو، کە بتوانێت پارێزگاری لە پاشەکەوتی دەوڵەت بکات و بۆخۆشی مافی دەرکردنی دراوی هەبێت و سەرمایەکەشی بەیارمەتی دەوڵەت و خاوەن پشکەکان دابین بکرێت. ئەم مەسەلەیە نارەزایییەکی زۆر بەدوای خۆیدا هێنا و هۆکاری نارەزایییەکەش ترسان بوو لەوەی کە ئەم پێشنیازە بەهێزتربوونی چینی دەسەلات داری لێبکەوێتەوە.((جفرسۆن)) پێشنیازی دروستکردنی بانکەکەی رەتکردەوە و، باوەری وابوو کە ئەم بابەتە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە قانونی ئەساسی دا باسی لێوەنەکراوە، بەڵام ((واشنگتۆن)) و ((فیدراڵیست))ەکانی تر سوور بوون لەسەر دامەزراندنی ئەم بانکە و لەساڵی ١٧٩١، یەکەمین بانکی مەرکەزی فیدراڵیان بونیاد نا.

مەسەلەیەکی دیکە، کە لە سەرەتاکانی دامەزراندنی حکومەتی کۆماری دا ڕوو بەڕووی بوونەوە، مەسەلەی زەوییەکانی ڕۆژئاوای شاخەکانی ئەلگانی بوو، کە پێشتر لە لایەن ئینگلیزەوە هەر جۆرە داگیرکردنێکی تێدا قەدەغە کرابوو. پاش مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی پاریس و سەربەخۆیی ئەمریکا، ئەم بڕیارە هەڵوەشایەوە و ئەمریکییەکان بە مەبەستی دەست بەسەردا گرتنی زەوییەکانی ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەیتقەکاندا بەشەرهاتن. سوور پێستەکانی ئەو ناوچانە، ژیانێکی زۆر سەرەتایی و فەرهەنگێکی بەتەواوەتی جیاوزیان هەبوو، ئەوان بەهیچ شێوەیەك نەیاندەتوانی لە سیاسەتی کۆچبەرە سپی پێستەکان تێبگەن . لەو لاشەوە، ئەمریکییەکان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر تامەزرۆی دەست بەسەردا گرتنی زەوییە بەپیتەکانیان بوون.((جفرسۆن)) پێی وابوو، کە لەسەر کۆچبەرەکان پێویستە، دەرك بەو ژیانە نالەبارو خەمبارەی ئەیتقەکان بکەن و هەوڵ بدەن، بەشێوەیەك لەگەڵ کۆمەڵگەی ئەمریکیدا بیانگونجێنن و لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکەن. بەڵام زۆرینەی ئەمریکییەکان، سوور بوون لەسەر ئەوەی کە تەنها بەکارهێنانی زەبر و زەنگ دەتوانێت ڕێگای داگیرکردنی زەوییە بە پیتەکانی ڕۆژئاوا واڵا بکات. ئەیتقەکان، لەو ناوچەیەکەی کە ئەمڕۆ بە ویلایەتی ئۆهایۆ و ئیندیانا و ئیلی نوا ناودەبرێت بڵاو بوو بوونەوە، بەروودانی هەر پێکدادانێك ناچار بە پاشەکشێ دەبوون و زەوییەکانیان لەلایەن

ئەمریکییەکانەوە دەستی بەسەردا دەگیرا. پاش زنجیرەیەك شەڕی یەك لەدوای یەك و لەساڵی ١٧٩٤ بەپێی ڕێککەوتننامەیەك، تەواوی زەوییەکانی ئۆهایۆ خرایە ژێر ڕکێفی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە. دواتریش چەندەها ڕێککەوتننامەی لەو جۆرە لە نێوانیاندا مۆرکرا، بەلاّم ئەمریکا هیچ کات بەڵێنەکانی خۆی بەرامبەر بەدانیشتوانی ئەو ناوچانە نەبردە سەر.

لە ڕووی سیاسەتی دەرەوەیی دا، حکومەتی ئەمریکا سیاسەتی بێلایەنی پەیڕە و دەکرد و ئەم هەڵوێستەش چەند پاڵنەرێکی جۆرا و جۆری لە پشتەوە بوو. ئەم کۆمارە، زیاتر لە هەر شتێك پێویستی بە ڕێکخستن و بتەو کردنی دامەزراوەکانی حکومەتەکەی هەبوو. بە سەرهەڵدانی شۆڕشی فەرەنسی و، بەتایبەت کوژرانی ((لویی شانزەیەم)) و دەست پێکردنی سەردەمی ((ڕۆبسپیر))، ئەمریکییەکان زیاتر لە جاران باوەڕیان بە جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە پەیدا کرد. لەلایەکیشەوە ئاڵوگۆڕی بازرگانی لەگەڵ حکومەتی ئینگلیز دا ن هێشتا گرنگترین بنەمای ئابوری ویلایەتەکانی پێك دەهێنا کە بۆ ئەمریکییەکان بایەخێکی زۆری هەبوو. لەم ڕووەوە لایەنگری کردنی فەرەنسایا لەشەڕی دژ بە ئینگلیزدا بە کارێکی پۆزەتیڤ نەزانی.

((واشنگتۆن)) لەساڵی ١٧٩٣، ڕاگەیاندنێکی بلاّو کردەوەو جەختی کردەوە کە دەوڵەتی ئەمریکا پێویستی بە هێمنی و ئاشتی هەیە و هەل و مەرجێکی لەباری خۆسازکردنی بۆ ڕەخساوە، لەم ڕووەوە، سیاسەتی ئەمریکا لەسەر بنەمای ڕەفتاری دۆستانە بەرامبەر بە میللەتانی دیکە ئاراستەی وەرگرت .

پاش تەواو بوونی ماوەی سەرۆك کۆماریتییەکەی لەساڵی ١٧٩٦، واشنگتۆن لە مەیدانی سیاسەت کەنارەگیری کرد و لە نامەیەکدا کە بەیادگاری بۆ هاوڵاتیەکانی بەجێی هێشت، سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکای دیاری کرد:(( مێژوو، ئەزموون دەری خستووە، کە دەسەڵاتی دەرەوە لە مەترسیدارترین دوژمنانی کۆمارە.گرنگترین ئەرکی ئێمە لە مەسەلەی سیاسەتی دەرەوەدا، پەرەپێدانی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ وولاّتانی بێگانە و، تا دەکرێت کەمکردنەوەی پەیوەندییە سیاسیەکانمانە.گیر و گرفتەکانی ئەورووپا بە تەواوەتی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئێمەدا جیاوازە.

لەبەرە ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە، ئەگەر خۆم لەکاروباری سیاسی ئەو کیشوەرەدا هەڵقورتێنم. جودایی و دووری وڵاتی ئێمە لە ئەورووپا، هەلومەرجێکی لەباری بۆ ئێمە دەرەخسێنێت کە بتوانین ڕێبازێکی دیکە بگرینەبەر. ئەگەر ئێمە، هەوڵەکانی خۆمان لە پێناوی دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتوو، کە لە ڕێگەی حکومەتێکی بەهێزەوە بەڕێوە

بېرێت، بخەینە گەڕ، ئەوا لەماوەیەکی کەمدا، دەتوانین سەرکەوتنێك بەدەست بهێنین کە هەمووان ناچار بەڕەچاوکردنی ئەم بیر لایەنیەی ئێمە بێن.))

بەم شێوەیە((واشنگتۆن)) سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی بۆ ماوەیەکی درێژ خاوەن دیاری و دارشت: پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی بازرگانی توند و تۆڵ لەگەڵ وڵاتانی دیکە، کەمکردنەوەی ئەو پەیوەندییە سیاسیانەی کە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەمریکادا یەك ناگرێتەوە. لەم ماوەیەی کە وڵاتانی ئەوروپا سەرقاڵی شەڕکردن بوون((واشنگتۆن)) توانی ئاشتی و ئارامی بۆ وڵاتەکەی دەستەبەربکات و سیاسەتی گشتی ئەو وڵاتەش دەست نیشان بکات. پاش وازهێنانی ناوبراو، یەکێك لە کەسایەتیە ناودارەکانی شاری بۆستۆن، کە وەك یەکەمین سەفیری ئەمریکا لە ئینگلیزدا کاری کردبوو هەروەها یەکێکیش بوو لە ڕابەرانی شۆڕشی ئەمریکا ((جۆن ئادامز))، توانی دەسەڵاتی سیاسی وڵات بگرێتە دەست و تەفاهوم و دانوسان لەگەڵ حکومەتی ئینگلیز بکاتە سەرمەشقی کارەکانی . بەڵام لە ڕووی سیاسەتی ناوخۆیدا ڕوو بەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر بوویەوە. بەتایبەت گۆڕانکاری کردن لە یاسای کۆچکردن، کە مەرجەکانی نیشتەجێبوونی کۆچبەرانی بۆ وەرگرتنی مافی پەنابەرێتی ئەمریکا لە پێنج ساڵەوە بۆ چواردە ساڵ درێژ کردەوە، نارەزایی و ناکۆکییەکی زۆری لێکەوتەوە. هەروەها ئەو یاسایەش کە مافی بە دەوڵەتی مەرکەزی دەدا، بۆ ئەوەی بە دواداچوون و لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکات، کە لە ڕێگەی بڵاوکراوەکانەوە بابەت لە دژی سەرۆك کۆمار یان ئەندامانی کۆنگرێس بڵاو دەکەنەوە، بووە هۆی کەمکردنەوەی ئعتبار و خۆشەویستی حیزبی ((فیدراڵیست)) و زیاد بوونی دەسەڵاتی حیزبی ((کۆماریخوازی دیموکرات)).

ئەم کردەوانە دەنگی نارەزایی حیزبەکەی ((جفرسۆن))یان بەرزکردەوە، ((فیدراڵیستەکان)) یان بە پێشێلکردنی مافی تاکەکان تاوانبار کرد و ناکۆکیەکانیش لەنێوانیاندا زیادی کرد. بە مردنی ((واشنگتۆن)) لە ساڵی ١٧٩٩ و، بەردەوام بوونی کردەوە سەختگیریەکانی دەوڵەتی ((ئادامز)) زەمینەیەکی لەباری سیاسی بۆ دیموکراتەکان ڕەخساند. لە هەڵبژاردەکانی ساڵی ١٨٠٠ دا، هیچ کام لە حیزبەکان نەیانتوانی دەنگی پێویست کۆبکەنەوە و سەرەنجام پاش چەند کۆبونەوەیەکی نێو کۆنگرێس،(( تۆماس جفرسۆن)) بیرمەندی ناوداری ئەمریکی، ڕابەری شۆڕش و سەربەخۆیی و نوێنەری دیموکراتە، وەك سێیەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا توانی زۆرینەی دەنگەکان بەدەست بهێنێت.

سەرۆك كۆمارێتی((جفرسۆن)) دەسەلاتی لە حیزبی بەرامبەر واتە ((فیدرالیستەکان))ەوە بۆ ((کۆمارێخوازانی دیموکرات)) گواستەوە. لەسەردەمی ئەودا سنوری دەسەلاتی کۆماری زەویەکانی ڕۆژئاوا و باشوریشی گرتەوە، خۆبەڕێوەبردنی ویلایەتەکان دانی پێدا نرا و لە ڕاستی دا، یەکەمین یەکێتی نێوان هەردووچینی جوتیارو شاری لەم سالانەدا هاتە ئاراوە.

لە نێو سەرکردە ناودارەکانی ئەمریکادا،((جفرسۆن)) بە یەکێك لە شایستەترینیان دەژمێرێت. ئەو کەسێکی تێگەیشتوو، شارەزای بۆچوون و بیرکردنەوەکانی سەردەمی خۆی، هۆشیار و باوەڕی تەواوی بە ئازادی و دیموکراسی هەبوو،ناوبراو لەنێو ڕەوتە فکرییەکانی ئەوروپادا، باوەڕ بەیاسای سروشت و مافی سروشتی و حکومەتی یاسای وەرگرت و سوودێکی زۆریشی لە بۆچونی فیزیۆکراتیەکان - کە زەوی و کشتوکالیان بەسەرچاوەی سەرەکی دەرامەت دەزانی - وەرگرت. ((جفرسۆن))، کۆمەلگەی جوتیارانی ئازاد و ووردە سەرمایەداری، بەناوکی سەرەکی کۆمەلگەیەکی دیموکراسی دەزانی ئەوانی بە بەرهەمهێنەرانی ڕاستەقینەی مال و سامان و پارێزەرانی سەربەخۆیی و ئازادی ناو دەبرد. متمانەی بە فیدرالیستەکان نەدەکرد، چونکە ئەوانی بە پشتیوانی سیاسەتی ئینگلیز لە قەلەم دەدا و ئەو سیاسەتەش کە لە ڕووی ئابوورییەوە بۆ چڕ کردنەوەی سەروەت و سەرمایە لەدەستی چینی بانکدار و بە مەبەستی گەشە پێدانی کۆمەلگەی دیموکراسی پەیڕەویان دەکرد، بە سیاسەتێکی زیانبار وەسف دەکرد. ترس و واهیمەی ((جفرسۆن)) لە چەسپاندنی دەسەلاتی سەرمایەداری، دامەزراندنی حکومەتێك بوو کە وەکو ((لوایتان)) ـ ئاژەلی زەبەلاحی ئەفسانەیی - لەبەر بەرژەوەندی خۆیی و دژی بەرژەوەندی گشتی دەست بخاتە نێو هەمور شتێکەوە و هەمووان بتۆقێنێت. بە ووتەی ناوبراو:((چڕ بوونەوەی دەسەلات لەنێو دەستی کەسێك یان دەزگایەکدا، هەردەم لەناوچوونی ئازادی و مافی تاکەکانی لێکەوتووەتەوە.)) جەخت کردنەوەی ئابراو لەسەر ئەزموونی حکومەتە مەحەللی و خۆ بەڕێوەبەریەکانی سەردەمی داگیرگەکان بوو، کە ووردە ووردە و بەشێوەیەکی سروشتی لە کۆمەلگەی ئەمریکادا گەشەیان کرد. بەبۆچونی ئەو، حکومەتێك شایەنی ستایش کردن بوو، کەوەك ((تۆماس پین)) دەلێ، سادە و ئاسان بەپێی پێداویستیەکانی کۆمەلگە دامەزرابێت. ئەمریکای سەردەمی ((جفرسۆن)) دونیایەکی سادە و پشت ئەستوور بە کشتوکال و ژمارەیەك ووردە سەرمایەدار بوو، کە مافی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیش لەسەر بنەمای پێداویستی و داواکاریەکانی ناوچە مەحەللییەکان ڕاوەستابوو. مال و سامانی فراوان یان هەژاری تاکەکان، کە جیاوازی چینایەتی و دەست بەسەردا گرتنی زۆرینەی بە پێی

بەرژەوەندی گروپێك لێبکەوێتەوە، لە ئارادا نەبوو. ناوبراو بەو شێوە بیرکردنەوەیەی خۆی، واتە عەشق بۆ ئازادی و باوەڕ بە حکومەتی دیموکراسی، بە نمونەی کەسایەتیەکی سەرکەوتووی ئەمریکای لاو دەژمێررێت. ئەو لە هەمانکاتدا سیاسەتمەدارێکی واقع بین بوو، لەو بارودۆخە ناهەموارەی ئەو کاتەدا شێوازی حکومەتەکەی لەسەر بنەمای دانوسان و ئاشتەوایی بەڕێوە دەبرد. لە ووتاری دەست بەکاربوونی سەرۆکایەتییەکەیدا، هەموو چین و توێژەکانی بۆ دانوسان و هاوکاری کردن بانگهێشت کرد. ئاماژەشی بەوە کرد، کە هەرچەندە داواکاری زۆرینە هەمیشەو هەردەم جێگای ڕێز و جێبەجێ کردنە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا، یاسا بۆ کەمینەش چەند شتێکی دەست نیشان کردووە کە ناکرێت لەبەرچاو نەگیرێن و،جیاوازی بیروڕاش نابێتە هۆی جیاوازی لە بنەماکاندا، چونکە ((ئێمە هەموومان هەم کۆماریخواز و هەم فیدراڵیستین.))

لەو پرۆژە گرنگانەی کە لەسەردەمی سەرۆکایەتی ((جفرسۆن)) دا بەئەنجام گەیەنران، کڕینی ناوچەی لوئیزیانا لە فەڕەنسا و لکاندنی بە ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە بوو. پاش ئەوەی کە ئامانجەکانی ناپلیۆن لە دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی فەڕەنسا لە هایتی و ئەمریکای مەرکەزی شکستیان هێنا، فەڕەنسا بۆ ئەوەی لەسەر شەڕەکانی خۆی لە ئەورووپا بەردەوام بێت و ڕێگە لەبەردەم یەکگرتنی ئینگلیز و ویلایەتە یەکگرتووەکان دژ بە ولاتەکەی بگرێت، ڕەزامەندی خۆی لەسەر فرۆشتنی ئەو ناوچەیە دەربڕی. بەم شێوەیە لە ساڵی ١٨٠٣ تەواوی ناوچەی لوئیزیانا و ڕۆژئاوای فلۆریدا بە بڕی پانزە ملیۆن دۆلار درایە ویلایەتە یەکگرتووەکان.

کڕینی لوئیزیانا، سەرکەوتووترین هەنگاو بوو کە لەسەردەمی سەرۆکایەتی ((جفرسۆن))دا جێبەجێکراوە. بە کڕینی ئەم ناوچەیە ڕووبەری ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ دوو ئەوەندە زیادی کرد و کەشتیوانی ئازاد لەسەر ڕووباری می سی سی پی ڕاگەیەنرا و لەڕووی ئابوریشەوە ئاسۆیەکی بەرفراوانی دیاری دەکرد. دەکرێ بووترێ، کە((جفرسۆن)) زەمینەی ئەمریکایەکی زلهێزی فەراهەم کرد. ((فیدراڵیستەکان)) کە دەترسان بە کڕینی ئەم ناوچانە، لایەنگرانی ((جفرسۆن)) و دیموکراتەکان ئەوەندەی دیکە زیاد بکات، کۆبوونەوەیەکیان ساز کرد و تیایدا پێشنیازیان کرد کە ویلایەتەکانی ناوچەی ((نیو ئینگلاند)) و ویلایەتەکانی نیویۆرك و نیوجێرسی لەیەکیەتی فیدراڵی جیاببنەوە و بۆ خۆیان ویلایاتی هاوپەیمانی باکور دابمەزرێنن. سەرەتا ((هامیلتۆن))یان بۆ سەرپەرشتی پرۆژەکە بانگهێشت کرد، بەلاّم ناوبراو داواکەی ڕەتکردنەوە و پاش ئەو هانایان بۆ سیاسەتمەدارێکی دیکە کەناوی ((ئارون بار)) بوو برد، بەلاّم ئەو داواکەی ڕەت نەکردنەوەو هەر لەبەر ئەم هەڵوێستەش ناکۆکیەك لە نێوان ناوبراو

((هامیلتۆن)) دا ڕووی داو دواتر لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دوئێل دا، ((هامیلتۆن)) ی کوشت و بەم شێوەیە ئەو کەسەی کە پایەو بناغەی ئابوری ئەمریکای دامەزراند، ژیانی کۆتایی پێهات. پاش ئەم ڕووداوە ((بار)) بڕیاری دا کە ئیمپراتۆریەتێکی گەورە لە ڕۆژئاوای ئەمریکادا دروست بکات، بەڵام پیلانەکەی ئاشکرا کراو دوای هەموو ئەمانە پەردە لەسەر مەسەلەی ئەو دوو ملیۆنەی کە بڕیار بوو بەشێوەی بەرتیل بۆ دابەشکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئینگلیزی وەربگرێت، هەڵدرایەوە و، ناچار کرا ئەمریکا بەجێبهێڵێت. ئەم ڕووداوە زیانێکی زۆری بە متمانەی((فیدرالیەکان)) لەنێو جەماوەردا گەیاند و دەسەڵات و پلەو پایەی ئەوانی خستە ژێجر پرسیارەوە.((جەفرسۆن)) لەساڵی ١٨٠٤ بە ئاسانی و بۆ جاری دووەم بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری هەڵبژێررایەوە.

ناوبراو پاش کڕینی لوئیزیانا، بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری و باروودۆخی جوگرافی ناوچەکە، دەستەیەکی دۆزینەوەی بەسەرپەرشتی دوو لاوی ئەمریکی کە ناویان ((لوئیز و کلارك)) بوو بەرەو ڕۆژئاوا ڕەوانە کرد. دەستەی ناوبراو بەو زانیاریانەی کە دەربارەی ناوچەکە کۆیان کردەوە، زەمینەیەکی گونجاویان بۆ بەرەو پێش چوون بەرەو ڕۆژئاوا ئامادە و فەراهەم کرد.

یەکێك لەو کێشانەی کە ڕوو بەڕووی ((جەفرسۆن)) بوویەوە، مەسەلەی ڕێگەگرتن لە دەسەڵاتەکانی دەزگای دادوەری و سەرۆکی دادگای باڵا ((جۆن مارشاڵ)) بوو.((مارشاڵ)) فیدرالیست بوو هەروەها سوور بوو لەسەر پاراستنی دەسەڵاتەکانی دەزگای دادوەری و سەربەخۆیی ئەو دادگایە بەرامبەر بە دەسەڵاتەکانی دیکە. ئەم هەڵوێستەی ناوبراو لە ڕێز گرتنی قانونی ئەساسی و پەرەسەندنی دەسەڵاتی دادوەری، یەکێك لە گرنگترین کۆڵەکەکانی حکومەتی یاسای لە ئەمریکادا دامەزراند. ئەو لەساڵی ١٨٠١ ـ١٨٣٥ واتە تاکۆتایی تەمەنی لەسەر پۆستەکەی خۆی مایەوە و دەسەڵاتی ئەو دەزگایەی لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی قانونی ئەساسی ئەمریکادا چەسپاند.

((جەفرسۆن)) وەك باقی سەرۆکەکانی تر سیاسەتی بێلایەنی خۆی لەوکاتەی کە ناپلیۆن و ئینگلیز بۆ بەدەست هێنانی دەسەڵاتی جیهانی لە کێبەرکێدا بوون، پاراست. ئەو نەیدەویست لەم مەسەلانەدا تەداخول بکات، متمانەی بە ناپلۆین نەدەکرد و، سیاسەتی ئینگلیزیشی لەدەست بەسەردا گرتنی دەریایی و قۆرغکردنی دەسەڵاتی جیهانی دا دەبینیەوە و لەهەمان کاتیشدا بەنیازبوو، پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ هەموو وڵاتاندا بەرقەرار بکات. بەهۆی ئەو کێبەرکێ دەریاییەی کە لەنێوان فەرەنسا و ئینگلیز دا لە ئارادا بوو، چەندین جار کەشتییە

بازرگانییەکانی ئەمریکا دەستیان بەسەردا دەگیرا و ئینگلیزیش بۆ زیاتر کردنی ژمارەی مەلەوانەکانی خۆی پەنای دەبردە بەر کاری توند و تیژی و کەشتییەکانی بەووردی دەپشکنی. لە یەکێك لەو ڕووداوانەدا، بەهۆی تەقەکردنی کەشتییەکی ئەو ولاتەوە، سێ مەلەوانی ئەمریکی کوژرا. ((جفرسۆن)) بەناچاری یاسای تایبەت بە پچڕاندنی ئالوگۆڕی بازرگانی ئەمریکا و ئەوروپای خستە قۆناغی جێبەجێکردنەوە، کە ئەمەش زیانێکی زۆری بە بازرگانی ئەمریکا گەیاند، لەبەر ئەوە دوای یەك ساڵ، بڕیارەکەی هەڵوەشاندەوە. هەموو ئەم ڕووداوانە ئاگریان بۆ هەڵگیرسانی شەڕێکی گەورە خۆشدەکرد.

((مدیسۆن)) و((مۆنرۆ)) ئەو دوو سەرۆك کۆمارەی کە پاش ((جفرسۆن)) حکومەتیان گرتە دەست، بەشێك بوون لە ڕابەرانی سەردەمی سەربەخۆیی. لەسەردەمی ئەواندا، ویلایەتە نوێیەکانی ئۆهایۆ و کینتاکی و تەنسی خرانە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان، کۆچکردن بەرەو ڕۆژئاوا پەرەی سەند و چەند شارێکی گەورەو مەڵبەندی بازرگانی دروستکران. بەهۆی ئەو پاڵە پەستۆیەی کە لەلایەن ئینگلیزەوە دەخرایە سەر بازرگانی دەریایی ئەمریکا و ئەو فشارەی کە بیر و ڕای گشتی بە ڕابەرایەتی چەند نوێنەرێکی نێو کۆنگرێس، وەك ((جۆن کلهۆن)) و((هێنری کلی)) دەیاخستە سەر حکومەتی ئەمریکا، جەنگی دژ بە ئینگلیز لە ساڵی ١٨١٢ سەری هەڵدا. ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە، بۆ چەسپاندنی مافی بازرگانی و ئالوگۆڕی دەریایی و پەیدا کردنی بازاڕی بازرگانی کە بەهۆی سەروەری ئینگلیزەوە لێی بێبەشکرابوون، بەتێڕوانینی سیاسەتمەدارە لاوەکان، زۆر پێویست و زەرور بوو، لەهەمان کاتیشدا هۆکاری بەهێزکردنی ئاستی هۆشیاری و باوەڕ بەخۆبوون و یەکریزی نەتەوەیی بوو. هەروەکو((جەکسۆن)) نوێنەری تەنسی ئاماژەی پێدەکات، هۆکاری شەڕەکە ئەوەبوو کە((کەسایەتی نەتەوەیی خۆمان بەهێز بکەین، دەریاوانەکانی خۆمان بپارێزین، مافی بازرگانی خۆمان ڕاوەستاو کەین و، لە بەدەستهێنانی بازاڕە جیهانییەکاندا، کە بەهۆی سەروەری دەریایی ئینگلیزەوە لێی بێبەش بووین، سەرکەوتن بەدەست بهێنین.))

لەساڵی ١٨١٢، سوپای ئەمریکا بەهیچ شێوەیەك ئامادەی شەڕ کردن نەبوو، ژمارەی سەربازەکانی نە دەگەیشتە حەوت هەزار سەرباز و خاوەنی جبەخانەیەکی سەربازی ئەوتۆ نەبوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو، کە لە هێرشەکەیدا بۆ سەر کەنەدا شکستی خوارد، بەلام لە بەشی دەریاچە پێنجینەکانەوە، کەشتییە جەنگییەکانی ئەمریکا، پێشکەوتنێکی بەرچاویان بەخۆوە بینی و توانیان ناوچەکانی دیترۆین و میشیگان کۆنترۆڵ بکەن و زۆربەی زۆری سوور

پێستەکانی ئەو ناوچانە ناچار بە پاشەکشێ بکەن. تا ئەو کاتەی کە هێزەکانی ئینگلیز سەرقاڵی شەڕەکانی نێو ئەوروپا بوون ، ڕوو بەڕووبوونەوەی ئەمریکا جوجوڵێکی ئەوتۆی تێدا بەدی نەدەکرا. پاش ساڵی ١٨١٤ و دەست لەکارکێشانەوەی ناپلیۆن، هێزەکانی ئینگلیز ڕوویان لەبەرەکانی سوپای ئەمریکا کرد و لە سێ لاوە هێرشیان کردە ویلایەتە یەکگرتووەکان: لە ڕێگەی کەنەدا، ئۆقیانوسی ئەتڵەسی بەرەو شاری واشنگتۆن و، لەباشووری بەندەری نیو ئۆرلیانزەوە.

هێزەکانی ئینگلیز لە پێشڕەوەی کردنیان بەرەو شاری واشنگتۆن، سەرکەوتنێکی باشیان بەدەست هێناو توانیان کۆشکی سەرۆك کۆمار و زۆربەی بەڕێوەبەرایەتیە حکومیەکان بسوتێنن. ((مدیسۆن)) و هاوکارەکانی ، بەرەو ڤیرجینیا هەڵهاتن دوای پاشەکشێ کردنی هێزەکانی ئینگلیز گەڕانەوە و ، ئەوجا بڕیاری دا کۆشکەکەی سەرۆك کۆمار سەر لەنوێ چاك بکاتەوە ، لەو ڕۆژە بەدواوە کۆشکی سەرۆك کۆمار بە ماڵی سپی ناوبانگی دەرکرد .

یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی ئەم جەنگە ئەوەبوو، کە هەر لەسەرەتای دەست پێکردنی جەنگەکەوە، گفتوگۆکانی نێوانیشیان دەستی پێکردبوو، سەرەنجام لە مانگی دیسەمبەری ساڵی ١٨١٤ لەناوچەی ((گند)) سەر بە وولاتی بەلجیکا، پەیماننامەی ئاشتی نێوانیان واژو کرا، بەڵام داواکەی ئەمریکا لەمەڕ نەهێشتنی ئەو پاڵە پەستۆیەی کە حکومەتی ئینگلیز دەیخستە سەر کەشتی و مەلەوانەکانی ئەمریکا و کەشتیوانی لە ڕووباری می سی سی پی دا بەبێ چارەسەر مایەوە. لە پەیماننامەی ئاشتی نێوانیاندا، هیچ بابەتێك جگە لە ڕاگرتنی شەڕ ئاماژەی پێنەکراوە.

لە ئەنجامەکانی جەنگی ١٨١٢، سەرهەڵدانی گیانی نەتەوایەتی و یەکگرتوویی و یەکریزی نێوانیانە، کە تائەو کاتە شتێکی بێوێنە بوو. شەڕ دژی هێزە داگیرکەرەکانی ئینگلیز، کە بەردەوام دەیانویست خاوەندرێتی خۆیان بەسەر داگیرگەکانی ئەمریکادا بپارێزن، زیاتر لە جاران سەربەخۆیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی زەمانەت کردوو، هۆشیاری نەتەوەیی تاکی ئەمریکایی بە یەکێك لە شوێنەوارەکانی ئەو جەنگە دەژمێررێت. ئەنجامێکی دیکەی جەنگەکە، پێشکەوتن و بەرەو پێشەوەچوون بوو بەرەو ڕۆژئاوا. لەو ڕۆژە بەدواوە، تەواوی سەرنج و گرنگی دەسەلات دارانی ئەمریکا بەدوای پەرەپێدان و چاککردنی بارودۆخی ناوخۆ و پشتگوێخستنی مەسەلەکانی تایبەت بە ولاتانی ئەوروپاوە بوو. بەشێوەیەك کە گەڕانەوەی ناپلیۆن و دوور خستنەوەی بۆ ((سنت هلن))، دووبارە هاتنەوە سەرکاری بنەماڵەی بۆربۆن لە فەرەنسا و

پێکهێنانی کۆنگرەی ڤیەننا، دەنگۆو هەرایەکی ئەوتۆی لەنێو بلاوکراوەکانی ئەمریکادا دروست نەکرد. ئەمریکا پاش بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، جەنگێکی تری لەگەڵ ئینگلزدا بەرپا کرد و ڕێگای بۆ سەرکەوتنەکانی داهاتووی خۆی ناوەلا کرد . ئەمریکا لەم قۆناغەدا، هەموو هەوڵەکانی خۆی بۆ چاککردن و پەرەپێدانی بارودۆخی ناوخۆ ، گەشەپێدانی پیشەسازی و فراوانکردنی کارگەکان، دامەزراندنی ڕێگای دەریایی و دروست کردنی هێڵەکانی پەیوەندی نێوان ناوچەکاندا چڕ کردبوویەوە. ئەمە قۆناغی سەرەتای شۆڕشی پیشەسازی ئەمریکایە، کە جگە لە زیاد بوونی ڕێژەی دانیشتوانەکەی، پەرەسەندنی ویلایەتەکان و کۆچکردن و گۆڕانکاری نوێ ی لە بواری کۆمەلایەتی و ئابوری ئەمریکادا لێکەوتەوە. لەوانەش سەپاندنی باجی گومرگ بۆ پارێزگاری کردنی کارگەکانی ناوخۆی وڵات، بەهێز کردنی بانکی ویلایەتە یەکگرتووەکان، پلانی دروست کردنی جادە و هۆکارەکانی پەیوەندی کردن، کە ڕێگای بۆ بەرەو پێشەوە چوون بەرەو ڕۆژئاوا خۆش دەکرد یان دروست کردنی کاناڵی ئێریە کە ناوچەی نیۆیۆرکی لە ڕێگەی دەریاچە پێنجینەکانەوە بە ویلایەتەکانی ڕۆژئاواوە دەبەستەوە.

پاش ڕاگەیاندنی ئاشتی نێوانیان، هێدی هێدی ناکۆکیە دەرەیایی و بازرگانییەکانی خۆیان چارەسەر کرد. لەم ساتە بە دواوە، ئەمریکییەکان مافی ڕاوە ماسی کردنیان لەناوچەکانی باکوری ئۆقیانوسی ئەتلەسی (نیو فونلەند و لابرادۆر) پێدرا. سنوری نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا لەسەر هێڵی ٤٩ پلە دەست نیشان کراو، سەبارەت بە ناوچەی ئۆرزگۆن بڕیار درا بۆماوەی دەساڵ بە هاوبەشی لە نێوان هەردوو لادا بەڕێوەببرێت و دواتر چارەنووسی یەکلایی بکرێتەوە. ناوچەی فلۆریداش، بەرواڵەت لە ژێر دەسەلاتی ئیسپانیادا بوو، بەلام بەهۆی پشێوی و ئالۆزیەکانی ناو خۆیەوە زۆربە زەحمەت دەیتوانی داگیرگەکانی خۆی لە ئەمریکادا کۆنترۆڵ بکات. ئەیتڤەکان کە بەهۆی پاڵە پەستۆی بەردەوامی سپی پێستەکانەوە پاشەکشێیان دەکرد، پەنایان بۆ ناوچەی فلۆریدا برد و جار جارێکیش لەوێوە پەلاماری ویلایەتەکانی باشوریان دەدا.((جەکسۆن))، فەرماندەی هێزە سەربازییەکان، بەمەبەستی لەناو بردنیان، هێرشێکی توندی کردە سەر ناوچەی فلۆریدا. ئیسپانیاش لە بەرامبەردا نارەزایی خۆی دژ بەم هێرشە دەربڕی و لە ئەنجامدا و پاش چەندین گفتوگۆی تێر و تەسەل، دەوڵەتی ئەمریکا بە پشتیوانی فەرەنسا ناوچەی فلۆریدای لە دەوڵەتی ئیسپانیا کڕی.

لەم قۆناغە مێژوویەدا، داگیرگەکانی ئیسپانیا لە ئەمریکا، بەرەو پارچە پارچە بوون دەچوون. لەسەردەمی ناپلیۆندا، ولاتانی ئەمریکای باشور کە ئازادییەکی ڕێژەییان هەبوو،

توانیان پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئینگلیزدا بەرقەرار بکەن و بەم شێوەیە خۆیان لەژێر چنگی دەسەلاتی ئیسپانیادا قوتار بکەن، بەشێوەیەك کە لە ساڵی ١٨٢١ زۆربەی وڵاتانی ئەمریکای باشور، توانیان سەربەخۆیی خۆیان ڕابگەیەنن. ویلایەتە یەکگرتووەکانیش دانی بەم شۆڕشانەدا نا. پاش مۆرکردنی پەیماننامەیەك لەگەڵ ئیسپانیادا، سەبارەت بە کڕینی ناوچەی فلۆریدا لەساڵی ١٨٢٢ بڕیاری دا سەربەخۆیی ئەم ویلایەتانە بەهەموو جیهان بناسێنێت و هەموو توانایەکی خۆی بۆ بەدەست هێنانی بازاڕە نوێیەکانی ئەمریکای لاتین خستەکار. ئیسپانیا هێشتا ئەم ناوچانەی بەبەشێك لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خۆی دەزانی و ڕاپەڕینە سەربەخۆیی خوازییەکانی بەشۆڕش لێك دەداتەوە. دوای بەستنی کۆنگرەی ڤیەننا . وڵاتانی نەمسا و ڕوسیاو پروسیا (ئەڵمانیا) بەپێکهێنانی ((هاوپەیمانی پیرۆز دژی هەموو ڕاپەڕینە نەتەوەییەکان و شۆڕشەکان یەکیان گرت. ئەمریکاش بۆ ئەوەی، نەوەك وڵاتانی ئەوروپی بەبیانوی پشتیوانی کردنی ئیسپانیا، دەست بخەنە نێو کاروباری کۆمارە نوێکانەوە، بڕیاری دا کە دژی ئەم هاوپەیمانی یەتیە بوەستێتەوە. لە لایەکی ترەوە، حکومەتی ئینگلیز کە نەیدەویست وڵاتە ئەوروپییەکان بەبۆنەی پشتیوانی کردنی ئیسپانیا و بەبیانوی کپ کردنەوەی ڕاپەڕینەکانی ئەمریکای باشور دەستیان وەردەنە نێو کاروباری کیشوەری ئەمریکاوە، پشتیوانی کردنی خۆی بۆ ئەو وڵاتە ڕاگەیاند و پەیمانی هاوکاری کردنی خۆی لەڕووی سەربازییەوە بۆ ئەمریکا دوپاتکردەوە.((مۆنرۆ)) سەرۆك کۆماری ئەمریکا، لە نامەیەکدا کە لە ساڵی ١٨٢٣ پێشکەش بە کۆنگرەی کرد و دواتر بە ((بنەمای مۆنرۆ ناسرا)، ڕایگەیاند: شێوازی سیاسەتی ئەوروپا بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکا دا جیاوازە. فراوانبوونی دەسەلاتی ئەوروپا لەم کیشوەرەدا دەبێتە هۆی لەناوبردنی ئاشتی و ئارامی ناوچەکە و، هەرجۆرە دەستێوەردانێکیش دژ بە سەربەخۆیی وڵاتانی ئەمریکای باشوور، لە ڕوانگەی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە، بە هەڵوێستێکی نادۆستانە لەقەڵەم دەدرێت. لەم ڕووەوە، هەرجۆرە خۆ هەڵقورتاندنێکی وڵاتانی ئەوروپای لەم کیشوەرەدا قەدەغە کرد.

بەشێوەیەکی گشتی، مەبەستی ئەم ڕاگەیاندنەی ((مۆنرۆ)) بریتی یە لەڕەتکردنەوەی هەرجۆرە دەستێوەردانێکی وڵاتانی ئەوروپی لەکاروباری ناوخۆی ئەم کیشوەرەدا. جەخت کردنەوە لەسەر جیاکردنەوەی ئەمریکا و ئەوروپا، لە ڕووی مەعنەویەوەو، جیاوازییەکانی نێوان هەردوو کیشوەر، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لەسەدەی

نۆزدەیەمـدا هـەبوو. سـوپا و هێـزە دەریاییـەکانی ئینگلیـزیش، بـۆ ڕێگـە گـرتن لـە دەستدرێژییەکانی ئەوروپا، سووربوونی خۆیان بۆ پشتیوانی کردنی ڕاگەیاندنەکە دووپاتکردەوە، چونکە لەو ڕۆژگارەدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان نەخاوەنی هێزێکـی سیاسـی ئـەوتۆ بـوون، نـە دەسەلاتێکی ئابوری وەهاشی هەبوو کە ئەوروپا چاوی تێببڕێت.

بەلام دەوڵـەتی ئـەمریکا (( بنـەمای مـۆنرۆ)) ی لـە بەرژەوەنـدی خـۆی بـەکارهێنا. بـە لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەو بنەمایانە، ڕێگایەکی بـۆ دەسـت بەسـەردا گـرتن و دەسـەلاتی سیاسی و ئابوری خۆی لە ولاتانی ئەمریکای لاتینی دا کردەوە. چـالاکی لـە بـواری بازرگـانی نێودەوڵەتی، هاوکات لەگەلّ بـێ لایـەنی و دەسـت وەرنـەدان لـە کاروبـاری سیاسـی ولاتـانی ئەوروپا، بنچینەی سیاسـەتی دەرەوەی ئەمریکای ئەم سەردەمەیان پێك دەهێنا.

سـالەکانی ١٧٨٣-١٨٢٤، واتـە سـەرەمی پێکهێنـانی کۆمـاری لاو، سـەردەمی گۆڕانکارییە سیاسـی و ئابوری و کۆمەلایەتیەکانی ئەمریکایە. لەم سالانەدا، شۆڕشی ئەمریکا سەری هەلّدا، قانونی ئەساسی نوسرایەوە و، سەرەتای دامەزراندنی سیستەمی دوو حیزبی هاتە ئـاراوە. چـەندین گـەورە سیاسـەتمەداری وەك ((جـۆرج واشـنگتۆن)) و ((تۆمـاس جفرسـۆن)) دەسەلاتیان گرتە دەست. ناوچەی لوئیزیاناخرایە سـەر ئـەمریکا . گەیـشتە ئکتـشافییەکەی ((لوئیز و کلارك )) بەرەو ڕۆژئاوا ئەنجام درا. جەنگی دژ بە ئینگلیز لە سالّی ١٨١٢ بەرپاکرا. کارگەکانی ڕسـتن و چنین و کانزاکاری پـەرەیان سـەند، ڕێگاکـانی هاتوچـۆی نێـوان ناوچـەکان، کۆچکردنیان بەرەو ڕۆژئـاوا ئاسـانترکرد، چـەند سیاسـەتمەدارێکی لاویـش دەرفـەتی بەشـداری کردنیان لەکاروباری سیـاسی دا پێـدرا، سیاسـەتی بێلایـەنی دەردوە و ڕاگەیانـدنی ((مـۆنرۆ)) هەموو ئەو ڕووداوانە بوون کە لەم سالانەدا ڕوویاندا. هەر لەم سالانەدا لەو ئەوروپاش چـەندین گۆڕانکاری گەورە لەسـەرجەم لایەنـەکانی ژیانـدا ڕوویانـدا. شۆڕشـی فەرەنـسی و دەرکـەوتنی ناپلیۆن، شۆڕشی پیشەسازی و کۆمەلایەتی و سـەرهەلّدانی ڕاپـەڕینی ڕۆمانتیـك، لـەو جـۆرە گۆڕانکاریانەن. ئەمریکا بە سیستەمێکی نوێ ی حکومڕانی دەیویـست کۆمەلگەیـەك بونیـاد بنێت کە خەلکەکەی بتوانێت لەژێر سایەی ئەو حکومەتەدا لە مافەکانی ئازادی، یەکسـانی و خاوەندارێتی تایبەتی بەهرەمەنـد ببێـت. ئـەمریکا لـەم سـەردەمەدا، لـەڕووی فەرهـەنگی و کۆمەلایەتیـەوە لەژێر کاریگەری فەرهەنگی ئەوروپادا بوو ـ و لە ڕاستیشدا فەرهەنگی ئەمریکا درێژکراوەی فەرهەنگی ئەوروپابوو. تـەنها ئـەو بـیر و بـاوەڕ و داب و نەریتـەی کـە کۆچـبەرە ئەوروپییەکان لەگەلّ خۆیان دەیانهێنا، بەپێ ی کات و شوێن گۆڕانیان بەسـەردا دەهات و لەگـەلّ

ژینگەی نوێدا دەگونجێنران و، زیاتر پشت بەو تایبەتمەندیانە دەبەسترا کە ئەمریکای لە دونیای کۆن جیادەکردەوە. ئەوروپیەکان زۆرجاران ئەم هەستی خۆ بەگەورە زانینەیان بەشتێکی پوچ و بێبنەما لێك دەدایەوە، بەلاّم بۆ ولاّتێکی تازە پێگەیشتوو کە دەیویست ناسنامەی نەتەوەیی خۆی ئاشکرا بکات و کاروباری کۆمەلاّیەتی و فکری و فەرهەنگی خۆی لە ئەوروپا سەربەخۆ و جودا پەروەردە بکات، ئەم هەستی خۆ بەگەورەزانینە زۆریش غەیرە مەنتقی نەبوو.

ئەو بیر و باوەڕ و بنەمایانەی کە ئەمریکایان گەیاندە سەربەخۆیی، بەرهەمی ڕاپەڕینە گەورەکەی سەردەمی ڕۆشنگەری بوو. سەدەی هەژدەیەم لە دونیای ڕۆژئاوادا، شێوازێکی نوێ ی تێڕوانینی مرۆڤی دەربارەی خودی مرۆڤ، دونیا، خودا و سروشت هێنایە ئاراوە. ئەمریکییەکانی سەردەمی داگیرگەکان، سوودیان لە بیرکردنەوەکانی سەردەمی ژیری وەردەگرت.((جۆن لۆك)) فەیلەسوفی ئینگلیزی یەکێك لە فەرمانە ڕەسمییەکانی ناوچەی کارۆلینای نوسیەوە.((ڕۆسۆ))، ((فرانکلین)) و ((مۆنتسکیو)) پێکەوە هاوڕێ بوون و سەردانی یەکتریان دەکرد.((ڤۆلتێر))یش ئەو کاتەی کە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی واژو کرد، هێشتا لە ژیاندا مابوو. لە ڕاستی دا ئەم بیرکردنەوە ڕووناکانەی سەدەی هەژدەیەم، بنەماو بنچینەی سیستەمی حکومەتی ئەمریکایان ڕەنگ ڕێژی کرد. سەردەمی ڕۆشنگەری پشتی بە سێ بنەما بەستبوو: چاکسازیخوازی و پەیجۆری مرۆڤ بۆ گەیشتن بە کەمال، گرنگی گەشەکردن و پێشکەوتن، سوودمەندی زانست و ژیری. فەیلەسووفانی سەدەی هەژدەیەم وای بۆ دەچوون کە بە جیاکردنەوە و شی کردنەوەی منطقی یانە، مرۆڤ دەتوانێت شێوازێکی نوێ بە ژیان و کۆمەلگەکەی ببەخشێت و بە زانست و منطق، ڕێسا و یاسایەکی وەها دابنێت، کە گەشەسەندن و پێشکەوتنی کۆمەلگەی تێدا مسۆگەر بکرێت.

شۆڕشی فەڕەنسا، سەردەمی ناپلیۆن و ڕاپەڕینی نوێ ی فیکری ((ڕۆمانتیزم))، شوێنی بیرکردنەوە بریقەدارەکانی سەدەی هەژدەیەمیان گرتەوە. ئەم ڕاپەڕینە زیاتر گرنگی بە تاك دەدا تا کۆمەلگە، هەست و سۆزە تاکەکەسیەکانی زیاتر لە بەلگە و بورهان بۆ دروست کردنی پێکهاتە مرۆڤایەتییەکان بەبەشدار دەزانی و، جەختی دەکردەوە، کە سۆز و عاتیفەکانی مرۆڤ هەمیشە کاریگەری خۆیان لەسەر گۆڕانکاریە مرۆڤایەتیەکان هەبووە و تەنها پێوەری عەقلی نەبوو کە بەسەر کۆمەلگەدا حکومەتی دەکرد.

جەخت کردنەوە لەسەر کەسایەتی تاك هاوکات لەگەڵ بیروراکانی سەردەمی رۆشنگەری، پێویستی گەشەکردن و پێشکەوتنی زانست و منگق و، باوەڕ بە چاکسازی کردن لە مرۆڤدا، رۆحیەی کۆمەڵایەتی ئەمریکای پاش سەربەخۆییان پێك دەهێنا.

کۆمەڵگەی ئەمریکا لە راپەڕینی ((رۆمانتیزم))ەوە باوەڕ بە توانا و لێهاتوویی تاکەکەسی بۆ پێشکەوتن و بەرەو پێشەوە چوونی کۆمەڵگە و لەسەدەی هەژدەیەمیشەوە، بایەخی زانست و، گرنگی بنەما زانستییەکان و توێژینەوە هونەری و پراکتیکیەکانی لەجیاتی فەلسەفەی توێژینەوە تیۆرییەکان وەرگرت. لێکۆڵینەوە زانستییەکان گرنگییەکی زیاتریان پێدرا و، بەشە زانستییەکانی وەك پزیشکی و بیرکاری و فیزیا و کیمیا و... پێشکەوتنێکی بەرچاویان بەخۆوە بینی. ژمارەیەك لە کۆچبەرە تازە هاتووەکان، دەستیان بە لێکۆڵینەوەی زانستی کرد، کە توانیان خزمەتێکی گەورە بە مرۆڤایەتی بکەن. یەکێك لەو کۆچبەرانە ((جۆزێف بریستلی)) بوو، کە لە بەریتانیاوە هاتبوو، دواتر بوو بەیەکێك لە گەورەترین کیمیاگەرانی جیهان. زانکۆکان، بەرنامەی لێکۆڵینەوە زانستییەکانی خۆیان پەرەپێدا و زانستە هونەری و تەجریبییەکان، زیاتر لە گرێمانە تیۆری و فەلسەفیەکان جەختیان لەسەر دەکرایەوە. ژیانی سەخت و دژواری کۆچبەران و ڕوو بەڕوو بونەوەی گرفتە جۆرا و جۆرەکان، پیاوانێکی چالاك و بەئەزمونیان پێگەیاند، کە زۆر حەزیان بە گفتوگۆکردن دەربارەی بابەتە فەلسەفیەکان نەدەکرد.((تۆکۆیل)) کە لە ساڵەکانی ١٨٣٠ سەردانێکی ئەمریکای کردووە، پێی وایە، کە لەهیچ شوێنێکی گێتی دا بەئەندازەی ئەمریکا، فەلسەفە و بنەما تیۆریەکان بێ نەرزش نییە. بنچینەی فەلسەفەی ئەمریکا، لەسەر بیرکردنەوە ئەزمونیەکانی ((لۆك)) بونیاد نرابوو - واتە زانیارییەك کە لەرووی ئەزموونەوە بەدەست هێنرابوو - مەزهەبیش لەرووی پەیوەندی بە کۆمەڵگە و مافی مرۆڤەوە گرنگی پێدرا، لە قانونی ئەساسی دا - بەو شێوەیەی کە جفرسۆن باوەڕی پێ ی هەبوو - ئازادی مەزهەب وەك هەمو مافەکانی دی جەختی لەسەر کرایەوە.

لەو بابەتانەی کە پرۆتستانتەکانی ئەمریکا ئاراستەیان کرد، مەسەلەی لێهاتوویی تاکەکانە لە تێگەیشتنی بابەتە مەزهەبییەکاندا. هەڵسەنگاندنی بابەتە ئاینیەکان لەگەڵ فیکر و منگقی تاکەکەس، لایەنێکی دیکەیە لە گرنگیدان بە لێهاتوویی تاکەکەس و بیروباوەڕی کۆمەڵگەی ئەمریکی سەبارەت بەتاك و توانایی بەرهەمهێنانی ئەو تاکە لە کۆمەڵگەدا. بەم هۆیەوە، مەزهەب و کڵێسە رۆڵێکی گرنگ و کاریگەریان لە بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی ئەمریکی دا گێڕا و زۆرێك لەو پرۆژە گرنگانەی وەك دروست کردنی قوتابخانە، بڵاو

کردنەوەی کتێب، کۆبوونەوە جۆراوجۆرەکان و سازدانی گفتوگۆی جۆراوجۆر، لەلایەن کلێسەوە جێبەجێدەکران، بەلام هیچ کات کلێسەیەکی یەکگرتوو لە ئەمریکادا پێك نەهێنرا و ئاینزایەکی دیاریکراویش بەناوی ئایینی ڕەسمیەوە دانی پێدا نەنرا.

مەسەلەیەی دیکە کە جەختی لەسەر ماف و ئازادی تاکەکان دەکردەوە و باوەڕی بە یەکسانی تاکەکان هەبوو . ژیانی دژواری سەرەتایی، فراوانی زەویە بەپیتەکان و هەلی ژیانێکی لەبار و خۆشگوزەران بۆ زۆرینەی کۆمەلگە، بیرۆکەی یەکسانی کۆمەلایەتی زیاتر پەروەردە کرد. بە پێچەوانەی ولاتانی ئەوروپا کە سیستەمی دەرەبەگایەتی و چینایەتی تیایاندا بالادەست بوو، ئەم کۆمەلگەیە زیاتر چینی مامناوەند و بیرکردنەوەی بۆرژوازی پەریان دەکردەوە و باوەڕ بەیەکسانیەکانیش زیاتر لە ولاتانی ڕۆژئاوا، تیایدا ڕەنگی دابویەوە. ڕەخسانی هەل و مەرجێکی لەباری ئابوری، زەوی بەپیتی ناوچەکان و فراوانی سەرچاوە سروشتییەکان، هەلێکی لەباری بەشێوەیەکی یەکسان بۆ هەموو تاکەکان ڕەخساندبوو، کە بەبێ جیاوازی چینایەتی بتوانن لە پێناو چاککردنی ژیانی خۆیاندا تێبکۆشن.

تێکڕای ئەم دیاردە کۆمەلایەتیانە، واتە گرنگی دان بە زانست و پیشەسازی، بەکارهێنانی مەنگۆ و ژێری پشت ئەستوور بە توانا و لێهاتوویی تاکەکەس، باوەڕ بە پێشکەوتن و بەرەو پێشەوە چوون هاوکات لەگەل ئازادییە تاکەکەسیەکان و مافی کۆمەلایەتی، دەستیان دایە دەستی یەکتر و، پێکەوە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەمیەمدا، ناسیۆنالیزمی ئەمریکایی و فەرهەنگی تایبەت بە ژیانی کۆمەلگەی ئەمریکایان دامەزراند و هێدی هێدی پەروەردەیان کرد.

پەرەپێدانی چاندنی لۆکە

جەنگی دژ بە ئینگلیز لە ساڵی ١٨١٣

نەخشەی ویلایەتە یەکگرتوەکان لەساڵی 1803

بەکڕینی ناوچەی لوئیزیانا لە ساڵی ١٨٠٣، ڕووبەری ئەمریکا بۆ ئەوەندە زیادی کرد

نەخشەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٨١٩

## بەشی چوارەم:

### دیموکراسی و چارەنووسی یەکلاکەرەوە

لە سەرەتای دامەزراندنی کۆچنشینەکانەوە، ئەمریکا، بابەتێکی گرنگ بوو بۆ پەیجۆری چاودێرانی ئەوروپا. بەلام لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە، ئەوروپیەکان زیاتر سەرنجیان بۆ لای سیستەمی دیموکراسی ئەو حکومەتە دەچوو. بۆ هەلسەنگاندنی ئەو جۆرە حکومەتە بەرەو ئەمریکا سەفەریان کرد. بەشێك لەو لێکۆلینەوانە لە شێوەی چەند کتێبێکدا دەربارەی کۆمەلگە و حکومەتی ئەمریکا بلاو کرانەوە.((ئەلێکسی تۆکۆیل)) و ((چارلز دیکنز)) لەو جۆرە لێکۆلەرەوانە بوون، کە لە دوای خۆیان چەند بەرهەمێکیان سەبارەت بەم کۆمەلگە نوێیە بەجێهێشتووە. کتێبی ((دیموکراسی لە ئەمریکا)) بەرهەمی ((تۆکۆیل)) بیرمەندی ناوداری فەرەنسی، بەناوبانگترینی ئەو کتێبانەیە کە لە شێوەی ناوەرۆکێکی کلاسیکی دا بلاو کرایەوە. تەسك بینی، توانای دەست نیشان کردن و لێکدانەوە و پێشبینیەکانی ئەو سەبارەت بە دامەزراوە حکومی و کۆمەلایەتیەکانی ئەمریکا، بەرهەمەکەی ناوبراوی وەك یەکێك لە بەرزترین بەرهەمەکانی هاوشێوەی خۆی بە جیهان ناساند. ﴿راستە﴾ هەموو چاودێرە ئەوروپیەکان ئەمریکایان بە چاوێکی پۆزەتیڤ سەیر نەدەکرد، بەلام بەتێکرا باوەریان وابوو، کە ئەمریکا نمونەی ئەزمونێکی گرنگە لە حکومەتی دیموکراسی سیاسی دا.

لەماوەی نێوان سالەکانی ١٨٣٠-١٨٥٠، ئەمریکا، بە پەرەپێدانی مافی دەنگدان، گرنگی دان بە دەنگی زۆرینە، لەگەل گۆرانی لایەنی ئابوری کشتوکالی و داگیرکردنی زەویەکانی رۆژئاوا، زەمینەیەکی لەبارو گونجاوی بۆ گەشەکردنی پیشەسازی و گۆرانکاری سیاسی و کۆمەلایەتی کۆمەلگەکەی دەستەبەرکرد.

لەسەدەی هەژدەیەمدا، رێژەی ئەو کەسانەی کە لەئەمریکا مافی دەنگدانیان هەبوو، بەبەراورد لەگەل ولاتانی ئەوروپا، زۆر زیاتر بوو. هەرچەندە مەرجی سەرەکی بەشداری کردن لە

دەنگدانیش، سەرمایە و دانی باجی ساڵانە بوو، بەڵام زۆربەی چین و توێژکانی کۆمەڵگە دەیانتوانی لەدەنگداندا بەشداری بکەن. وورده وورده و پاش ئەوەی کە بیرۆکەی حکومەت لەسەر بنەمای ڕەزامەندی میللەت، شێوەیەکی واقعی تری وەرگرت، یاسای ویلایەتەکان گۆڕانیان بەسەردا هات و مەرجی هەبوونی سەرمایە و باجی ساڵانە کە مەرجی سەرەکی بەشداری کردنی خەڵك بوو لەکاروباری سیاسی وڵاتدا، ڕاستەوخۆ هەڵوەشایەوە و هەموو پیاوێکی ئازاد بەبێ لەبەرچاو گرتنی پلەو پایەی کۆمەلایەتی دەیتوانی لەهەڵبژاردنەکاندا بەشداری بکات.

لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، ئەم بیرۆکەیە بە پرۆژەیەکی نوێ لە قەڵەم دەدرا. لە فەرەنسا و تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم، بوونی سەرمایەو دانی باجی دیاری کراو مەرجی سەرەکی بەشداری کردن بوو لە کاری سیاسی دا و، لە ئینگلتەراش چینی کرێکاران، لەسەدەی بیستەمەوە بەم مافەیان شاد بوون. بە ڕازی بوون لەسەر ئەو بۆچوونەی کە تەنها مەرجی بەشداری کردن لە چالاکییە سیاسیەکاندا، بریتییە لە هاوڵاتی بوون، ڕێگا بۆ گۆڕانکاریەکانی ئاینده کرایەوە. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم و پاش ئازاد بوونی ڕەش پێستەکان، مافی دەنگدانیشیان پێدرا و لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا ژنانی ئەمریکاش دوای ڕوو بەڕوو بوونەوەیەکی دوور و درێژ ئەو مافەیان بەدەست هێنا. لە ساڵەکانی ١٨٣٠، ئەو کاتەی کە بیرۆکەی بەشداری کردنی تێکڕای پیاوانی ئازاد، لەکاروباری سیاسی دا بە واقعی چەسپا، دیموکراسی ئەمریکا ڕوو بەڕووی گۆڕانێکی خێرا بوویەوە. تێکڕای بەرپرسانی ویلایەتەکان ، بەڕێگەی دەنگدانی ڕاستەوخۆ هەڵبژێردران و مەرجی بوونی سەرمایەش لە پیشە سیاسییەکاندا بە هەموو شێوەیەك ڕەتکرایەوە ز حکومڕانی ویلایەتەکان، دادوەر و باقی بەرپرسانی دیکە، لە ڕێگەی دەنگدانی مەحەللییەوە پۆستە جۆراوجۆرەکانیان وەردەگرت. هەر لەم ساڵانەدا، قانونی ئەساسی لە هەموو ویلایەتەکاندا لە ڕووی بڕیاری کۆتاییەوە خرایە دەنگدانی گشتییەوە و هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار کە وەك نەریتێکی هەمیشەیی لەلایەن کۆنگرێسەوە ئەنجام دەدرا، لەسەردەمی ((ئەندرۆ جەکسۆن))ەوە، بۆ دەنگدانی ڕاستەوخۆ گۆڕانی بەسەردا هات و پێکهێنانی ئەنجومەنی گشتی حیزب (کۆنڤانسیۆن)یش ئاسایی بوویەوە.

سنوری ئەم گۆڕانکاریانە زۆر لەوە فراوانتر بوو کە بونیادنەرانی سەربەخۆیی ئەمریکا بیریان لێ دەکردەوە.((تۆماس جفرسۆن)) و((پین)) لە خستنە ڕووی بیر و بۆچونەکانیان لە سەرەتای سەردەمی سەربەخۆیدا، نەیاندەتوانی بەو خێراییە بەرەو پێشەوە بڕۆن. مەترسی دەسەلات

گرتنە دەستی زۆرینە و دواتریش بەرژەوەندی میللەت بە گشتی، کە هەندێك جار دەسەڵاتی کەمینەیەکی هۆشیاری بەسەر تێکڕای خەڵکی دا دەسەپاند، بابەتی سەرەکی گفتوگۆی نێوان فیدرالیست و کۆماریخوازە دیموکراتەکان، لەسەرەتای دامەزراندنی حکومەتی کۆماریدا.

بەڵام سەردەمی ((جەکسۆن)) بەسەرەتای پەرەسەندنی دەسەڵاتە سیاسییەکان و بەشداری کردنی ژمارەیەکی بەرچاوی خەڵك لە کاروباری حکومڕانیدا هەژمار دەکرێت. حیزبی دیموکرات لە سەردەمی ئەمودا شکڵی گرت و، یەکەمین سەرۆکیش بوو، کە لە نێو بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی ڤیرجینیا و ماساچۆسێت دا بەخێو نەکرابێت. لایەنگری تێکڕای خەڵك و دژی دەسەلات و هێزی ژمارەیەکی دیاری کراو بوو . کێبەکێ و پڕو پاگەندەکانی هەڵبژاردنی بەپێی بەرنامەیەکی رێك و پێك لە رێگەی رۆژنامە و کۆمیتە و پێکهێنانی کۆبوونەوە جۆرا و جۆرەکانەوە دەست پێکرد و بە پڕ و پاگەندە فراوانەکەی، توانی تێکڕای خەڵکی بۆ لای خۆی رابکێشێت. پاش چەند ساڵێك ((جۆن کوینسی ئادامز)) سەرۆك کۆماری پێشتری ((جەکسۆن)) بە زمانێکی گاڵتەجاری رایگەیاند:(( ئەم هەڵبژاردنە دەری خست کە بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك کۆماری، زیاتر لە هەموو شتێك، پێویستی بە پڕوپاگەندەیەکی خەڵك خەڵەتێنەر هەیە.)) هەرچەندە حیزبی بەرامبەری ((جەکسۆن))ـ کە لەو سەردەمەدا بە ((ویگ)) ناودەبرا ـ هەمان شێواز و رێبازی بۆ کۆکردنەوەی زۆرینەی دەنگەکان و بەکارهێنانی پڕوپاگەندەیەکی فراوان بۆ راکێشانی سەرنجی گشتی بەکارهێنا.

یەکێك لە بەرنامە گرنگەکانی((جەکسۆن))، جێگۆڕکێ و دامەزراندنی تاکەکان بوو لەنێو دام و دەزگا حکومیەکاندا، بۆ ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵگە ئەو ئیش و ئەرکەی کە پێیان سپێراوە، بەمولکی تایبەتی خۆیان و وەك شتێك کە لە باوانەوە بۆیان مابێتەوە حسابی نەکەن و گروپێکی دیاری کراویش بەبێ هیچ جۆرە پاساوێك، سەروەت و سامانی خەڵکی بەتاڵان نەبەن. دابەشکردنی پلە و پایەو پۆستە جیاوازەکان وەك پاداشت بەسەر دۆست و ئاشناکاندا، هەندێك جار دەبووە هۆی سەرهەڵدانی گەندەڵی ئیداری ولەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا بە دەرکردنی یاسایەکی دیاری کراو سەبارەت بە دامەزراندنی خەڵك لە دام و دەزگا حکومیەکاندا تا رادەیەك چارەسەری ئەم دیاردەیە کرا، بەوەی کە خودی کەسەکە پێویستە تاقی بکرێتەوە و توانا و لێهاتوویی لەکاروبارەکاندا هەڵبسەنگێنرێت. ئەم شێوازی هەڵبژاردنە لە ئاستی دەوڵەتی فیدراڵی و ویلایەتەکاندا، لەسەر بنەمای پەرەپێدانی مافی میللەت راوەستابوو هەروەها هۆکارێکی کاریگەریش بوو، بۆ ئەوەی چینێکی جیاواز لە چینەکانی دیکە

سەر هەڵنەدات. زۆرێك لەو كەسانەی كە خاوەنی پیشەیەكی گەورەو معتبر بوون و تەنانەت سەرۆك كۆمار، پاش كۆتایی هاتنی ماوەی دەسەڵاتەكەیان دەگەڕانەوە سەر پیشە ئاساییەكەی خۆیان و هیچ كاتێك وەزیری دەزگایەكی جێبەجێكردن، پاش تەواو بوونی ماوەی خزمەتەكەی، دەستكەوتە حكومیەكانی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەكار نەدەهێنا.

پەرەسەندنی دەنگی خەڵكی و هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆی سەرۆك كۆمار، دەسەڵاتی دەزگای جێبەجێكردنی زیاتر كرد.((جەكسۆن))، بە پشت بەستن بە پشتیوانی میللەت، زۆرێك لە بڕیارەكانی كۆنگرێسی بە بەكارهێنانی مافی ڤیتۆ هەڵوەشاندەوە و، زیاتر لە هەموو سەرۆكەكانی پێش خۆی ئەم چەكەی بەكار هێنا. بەهەڵبژاردنی سەرۆك و پشت بەستن بە بیروڕای گشتی، دەسەڵاتی دەزگای جێبەجێكردن بە مەرجی بوونی سەركردایەتییەكی بەهێز، پەرەی دەسەند. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، هۆكارێكی سەرەكی بوو بۆ ئەوەی زۆربەی سەرۆك كۆمارەكان، بەبیانوی ئەوەی كە نوێنەری زۆرینەی ئەندامانی كۆمەڵگەن ، دەسەڵاتی دەزگای جێبەجێكردن پەرەپێدەن ـ بەتایبەتی لە سەردەمی ((فرانكلین ڕۆزفلت)) بەدواوە ـ كە دەزگای سەرۆك كۆماری وورده وورده دەسەڵاتەكانی جێبەجێكردنی خۆی زیاتر كردووە.

جەخت كردنەوە لەسەر یەكسانی مافی تاكەكان لەسەردەمی((جەكسۆن))دا، وەك بیر و باوەڕێكی گشتی تێكڕای خەڵكی لێهات. هەرچەندە هیچ كات، سیستەمی خانەدانی بەو واتایەی كە لە ئەوروپا هەبوو، لە ئەمریكا سەری هەڵنەدا، بەڵام هەڵبژاردنی ((جەكسۆن)) و پەرەسەندنی مافی دەنگدان و دیموكراتیزە كردنی دام و دەزگا ئیداریەكان، باوەڕ بەیەكسانی تاكەكانی زیاتر گەشە پێدا.((تۆكۆیل)) كەلەم ڕۆژگارەدا سەردانی ئەمریكای كردووە، ئاماژە بە یەكسانی و ترسانی خەڵكی ئەمریكا لە سیستەمی خانەدانی دەكات، بەرادەیەك كە تاكەكان ئامادەن، لەسەر هەژاری و زۆرداری و تۆقاندن ئارام بگرن، بەڵام سیستەمی خانەدانی لەسەر بنەمای دەسەڵاتی چینایەتی بەهەموو شێوەیەك ڕەتدەكەنەوە. خاتوو ((ترولوپ))ی ئینگلیزی كە بە دیدێكی ڕەخنە ئامێزە ئەو گۆڕانكاریانەی هەڵسەنگاندووە، ئاماژە بەو گفتوگۆیە دەكات كە لەگەڵ ژمارەیەك خەڵكی ئەمریكادا ئەنجامی داوە، كە چۆن ڕوو بەڕووی ناڕەزاییەكی زۆر بووەتەوە لەسەر ئەوەی ووتویەتی، هەموو كەسێك شیاوی بەدەست هێنانی پلەی سەرۆك كۆماری نیە.

جگە لەوەش ئەوەی كە باوەڕ بەیەكسانی تاكەكانی زیاتر گەشەپێدەدا، ئەو ئیمكانات و هەلومەرجە لەبارە بوو كە بۆ هاوڵاتیان ڕەخسابوو. خەڵكی ئەمریكا دەیانتوانی دوور لە

هەموو ئەو کۆسپانەی کە باڵیان بەسەر کۆمەڵگەی ئەورووپیدا کێشابوو [ئایین، خانەدان، چینایەتی ] هەوڵی بەدەستهێنانی ماڵ و سامان و دەسەلات و پێگەی سیاسی و کۆمەلایەتی بدەن. وەك ((ئەمرسۆن)) بیرمەندی ناوداری ئەمریکی دەڵێ، هەڵ و ئیمکاناتی ژیانێکی چاکتر، لەگەڵ ووشەی ئەمریکادا هاو واتا بوون. ئەم بارودۆخەش وای کردبوو کە هیچ کەس بیر لە چوونەناو چینێکی تایبەتی نەکاتەوە. هەرچەندە ئەم یەکسانیە، هەموو بوارەکانی نەدەگرتەوە و باوەڕ بە خاوەندارێتی تایبەتی و سەرمایەداری وەك باقی بنەماکانی دیکە لە کۆمەڵگەدا گەشەی دەکرد.

بەپەرەسەندنی مافی سیاسی، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، بیرۆکەی ئازادی ئابوری شوێنی سیستەمی ((مەرکانتالیزم))ی گرتەوە. ئەم بیروبۆچوونانە بە ئاراستەی رێبازی لیبرالیزمی گەشەیان کردبوو ، واتە بەمەرج بوونی دەسەلاتی دەوڵەت (مشروطیت)، باوەڕ بەیاسا دانان و دیاری کردنی مافی تاکەکەسی، کە سەرچاوەکەیان بەمافی سروشتی یان هەتا هەتایی دەزانی. بنچینەی سەرەکی مافی تاکەکەس لە ئاسودەیی گیانی و داراییدا دەستەبەر دەبێت، ئاسودەیی گیانی ـ کە تاك بزانێت لەژێر سایەی یاسادا گیانی لە دەستدرێژی و ستەم لێکردن پارێزراو دەبێت ـ و ئاسودەیی دارایی ـ لە ڕووی ئاسینی مافی خاوەندارێتی تایبەتی و دەسەلاتی تاکەکان بەسەر ئەو داراییەی کە بەدەستیان هێناوە ـ کە ئەم بنەمایە بەیەکێك لە مەرجە سەرەکیەکانی پێشکەوتنی ئابوری و بەشێکی گرنگی بواری ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکان دەژمێررا.

بنچینەی بیروباوەڕەکانی ئابوری لیبرالیزم، لەسەر بنەمای تیۆری ((ئابوری سیاسی)) ڕاوەستاوە. ئابوری سیاسیش لەسەر ئەو بنەمایە ڕاوەستاوە، کە مرۆڤ بەهەر شێوەیەك بێت، بەدوای بەرژەوەندی تایبەتی خۆیی و کۆکردنەوەی سەرمایەی زیاتردا دەگەرێت. ئەگەر بارو دۆخی سیاسی و کۆمەلایەتی، بەشێوەیەك بێت کە تاکەکان بەرەو بەدەست هێنانی سەرمایە و کارکردن لەپێنا وبەرژەوەندی خۆیان هانبدات، ئەوا سەرمایەی وەبەرهێنانی میللەت فراوانتر دەبێت و لەپێناو پێشکەوتنی کۆمەڵگەدا بەکاردەهێنرێت.(( ئادەم سمپ)) لە بونیادنەرانی ئابوری سیاسی، ئامانجی ئەم قوتابخانە ئابوریە بەدەرامەتی زیاتر و مووچەی ئاسانتری خەڵکی لێك دەداتەوە، لەکاتێکدا کە دەست تێوەردانی دەوڵەت لەکاروباری ئابوریدا بگاتە کەمترین ڕادە. لە ڕاستیدا ئەرکی سەرشانی دەوڵەت، تەنها بریتی بوو لە سەقامگیر کردنی ئاسایشی کۆمەلایەتی و جێگیرکردنی سیستەمی حکومەتێکی ڕێك و پێك و یاسایی، تاوەکو لەکاتی

پێویست دا هەلومەرجێکی لەبار و گونجاو بۆ گەشەکردنی ئابوری ولات بڕەخسێنرێت.((ریکاردۆ)) و((جۆن ستیوارت میڵ)) کە بەدوو نوێنەری بەناوبانگی ئابوری لیبرالیزمی سەدەی نۆزدەیەم دەژمێررێن، باوەڕیان وابوو کە دامەزراوەو یاساکانی کۆمەڵگە و زۆربوونی ڕێژەی دانیشتوان، کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی لەسەر بەرهەمی ئابوری هەیە و، لە بەرامبەریشدا باوردۆخی ئابوری ئەو کاریگەریەی خۆی بۆ سەر گۆڕانکاریە فیکریەکان و پەیوەندیە کۆمەلأیەتیەکان دەگوازێتەوە. لەم ڕووەوە، لە نێوان پەرەسەندنی ئابوری و زیاد بوونی سەروەت و سامان و بارودۆخی سیاسی دا پەوەندی و هاوسەنگیەکی ڕاستەوخۆیان دەبینی. بە دەستە بەرکردن و ڕەخساندنی هەلو مەرجێکی لەبار و ئارام، تاکەکان سەرمایەکانی خۆیان بەوپەڕی ئاسودەیەوە وەگەڕ دەخەن و ئەو کاتیش کێبڕکێیەکی (ئاسایی و یاسایی) لە نێوانیاندا دەست پێدەکات. بەپێ ی ئەم بۆچوونانە ، لە شێوەی کێبڕکێی ئازاددا نرخی بەروبومی بەرهەمهێنراو دەگاتە کەمترین ئاست و لەنێوان نرخی کالأی بەرهەم هێنراو و توانای کڕینی هاولأتیاندا، هاوسەنگی پەیدا دەبێت و ئەم سیاسەتە بەشێوەیەکی گشتی بەگەڕ خستن و زۆربوونی سەرمایەی لێ دەکەوێتەوە.

ئەم سیستەمە ئابوریە میراتی هزری لیبرالیزمی، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەم و سەدەی نۆزدەیەم ـ بەتایبەتی لە ئینگلیز ـ سەری هەلّدا. دامەزرێنەرە سەرەکیەکانی ئەم ڕێبازە، ئینگلیزی و سکۆتلەندی بوون و ئەمریکی یەکان ئەم سیستەمەیان لەوانەوە وەرگرتبوو، لەپێناو پێشکەوتنی ئابوری ولأتەکەیاندا بەکاریان هێنا. هەر ئەم سیستەمە ئابوریەی ئینگلیزی سەدەی نۆزدەیەم بوو، کە بەرەسمی نمونەی شیکردنەوەی سەرمایەداری ئەمریکای لێ پێکهات. ڕۆلّی دەولّەت تەنها لە فەراهەم کردنی هەلومەرجێکی لەبار بۆ بەرەو پێدانی سەرمایەداری لێکدرایەوە و بۆ ئەوەی تاکەکان بتوانن بە ئاسودەیی لەبازاڕی کێبڕکێی ئازاددا بەشداری بکەن و داهێنانەکانی خۆیان لە چالاکی یە ئابوریەکاندا نمایش بکەن.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، کاتێك کە بیرکردنەوەکانی قوتابخانەی ئابوری سیاسی قالّبێکی تایبەتی وەرگرت، لایەنی کشتوکالّی ڕۆلّێکی بەرچاوی لە بواری بەرهەمی نەتەوەییدا دەگێڕا، جگە لەوەش پیشەسازی ڕوو لە پێشکەوتنی ڕستن و چنین و دوورینی قوماش، دەرهێنانی کانەکان و پیشەسازی کانزاو کانزاکاری، بەرەو پێشەوە چوونێکی گەورەیان بە خۆوە بینی.

دەست بەکار بوونی کارگەکان و گۆڕانی ئابوری پیشەسازی ئەمریکا، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم داو لەماوەیەکی کورتدا، کۆمەلّگەی ئەمریکای لە کۆمەلّگەیەکی

کشتوکاڵیەوە بۆ پیشەسازی گۆڕی، پەیوەندی بە ساڵەکانی پاش جەنگی ١٨١٢ ەوە هەیە. ڕەونەقی بازرگانی بە پشت بەستن بە سیستەمی ئابوری ئازاد، بەکارهێنانی ئامێری هەڵمی و ئەزموونەکانی شۆڕشی پیشەسازی ئینگلیز، پەرەسەندنی بەروبومی کارگەکانی نێو ولایەتەکانی وەك ماساچۆسێت و نیۆیۆرکی بەدوادا هات. یەکەمین تاریفەی گومرگی بۆ پشتیوانی کردنی بەروبومی ناوخۆ لەساڵی ١٨١٦ دانراو، بەکارهێنانی ووزەی هەڵمی، بەرهەمی پیشەسازی ناوخۆی زیاتر گەشەپێدا. کارگەکانی ڕستن و چنینی ویلایەتی ماساچۆسێت کە زۆرینەی کرێکارەکانیان ئافرەت بوون، بە خێرایی پەرەیان سەند و بەروبومی ئەم کارگانە بەشێکی گرنگ و سەرەکی تێکڕای بەرهەمی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان تایبەت کرد بەخۆیانەوە.

((ئیلی ڤیتنی)) داهێنەری ئامێرەکانی لۆکە پاککردن، توانی تفەنگێك دروست بکات کە لە چەند بەشێکی جۆراوجۆر پێکهاتبوو، بەلەکارکەوتنی هەر بەشێکی بەئاسانی دەیتوانی چاکی بکاتەوە. ئەم داهێنە ،کە کاریگەریەکی زۆری لەسەر دروست کردنی ئامێرە کانزایەکان، هەر لە مەکینەی درومانەوە تا کاتژمێر و ئامێرەکانی دیکە هەبوو، زەمینەی بۆ داهێنانەکانی تر لە بوارەکانی تردا خۆش دەکرد بەرهەمی پیشەسازی گۆڕانێکی گەورەی بەسەر ئابوری ویلایەتەکانی باکووردا هێنا. هەرچەندە تا پێش ساڵی ١٨٦٠ لە٦٠٪ی هێزی کار لەبواری کشتوکاڵی ویلایەتەکاندا ئیشیان دەکرد و ئەوانی دیکە لە بواری پیشەسازی و بازرگانی خزمەتگوزاری شارەکاندا، بەلاّم هەمان ئەندازەش چالاکی پیشەسازی لە ویلایەتەکانی باکووردا نیشتەجیّ کرابوو. لە کۆی ئەو سەدوچوار هەزار دامەزراوەیەی کە لەسەردەمی پێش شەڕی ناوخۆدا کاریان دەکرد ، تەنها لە ١٥٪ی لە ویلایەتەکانی باشووردا جێگیر بوون. لە کاتێکدا کە یەك لەسەر سیّ ی تێکڕای دانیشتوانی ئەمریکا لە باشووردا دەژیان و، تەنها دەیەکی بەروبومی پیشەسازیان بەرهەم دەهێنا. سەرکەوتنی باکووریش بە پلەی یەك بۆ ئەو پێشکەوتنە دەگەڕایەوە کە لە بواری ئابوری پیشەسازی دا بەدەستی هێنابوو.

بە پەرەسەندنی بەرهەمی پیشەسازی، مەسەلەی ئاڵوگۆڕ و پەیوەندی نێوان ویلایەتەکان گرنگی یەکی زۆری پێدرا و لەم پێناوەشدا گەلێك پرۆژەیان بە ئەنجام گەیاند وەك دروست کردنی کاناڵی دەریاچەی ئیریە، کە ناوەڕاستی ئەمریکای لە ڕێگەی ڕووباری هودسن بە نیۆیۆرك و ئۆقیانوسی ئەتلەسی یەوە دەبەستەوە. ئەم کاناڵە، کاریگەریەکی زۆری لەسەر ئاڵوگۆڕکردنی ئامێرە پیشەسازیەکاندا هەبوو. شاری نیۆیۆرك بە خێرایی گەشەی کردوو بوویە یەکێك لە بەندەرە هەرە بەناوبانگەکان لە ڕووی بازرگانی یەوە. بەکارهێنانی کەشتی هەڵمی، یەکێکی تر

بوو لەو هۆکارانەی کە پەیوەندی بازرگانی نێوان ناوچەکانی ئاسانتر کردبوو. سەرکەوتنی کانالّی ئیریە، بووە هۆی ئەوەی کە چەندەها کانالّی دیکە بەمەبەستی بەرقەرار کردنی پەیوەندی نێوان رووبارەکانی ناوەوەو کەنارەکانی رۆژهەلات و باشووری ولات دابمەزرێنن. لە رێگەی رووباری می سی سی پی یەوە ـ کە بەزمانی رەسەنی ئەمریکی واتای باوکی ناوەکان دەگەیەنێت ـ چەندەها کەشتی هەلّمی بارهەلّگری تایبەت بە گواستنەوەی شتومەکی بازرگانی دەستیان بەکارکرد، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بازرگانی و پەیوەندی نێوان ویلایەتەکانی ئاسانتر دەکرد. زۆربەی ئەو ناوچانەی کە لە کەناری روبارەکاندا درێژ بوو بوونەوە، شێوەی شارە گەورەکانیان بەخۆوە گرت. لەوانەش شاری مەمفیس، سین سیناتی، ویلوی ویل، کەلەگەلّ رووباری می سی سی پی دا دراوسێ بوون.

گرنگترین هێلّی پەیوەندی نێوان ناوچەکان، بریتی بوون لە هێلّەکانی ئاسن. یەکەمین لۆکۆمۆتیڤی هەلّمی لە سالّی ١٨٣٠ دەستی بەکارکرد و تا کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم زیاتر لە سێ هەزار میل هێلّی ئاسن لە ناوچەکەدا راکێشرا. هێلّەکانی ئاسن بە سەرهەلّدانی گۆرانکاریە پیشەسازیەکانی پاش شەری ناوخۆ، چەندەها بەرامبەر زیادیان کرد. ئەو جوتیارانەی کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، بۆ گواستنەوەی بەروبومی خۆیان تەنها پشتیان بە گالیسکە و ناژەلّی بارهەلّگر دەبەست، لەماوەی چەند سالّدا و بە سوود وەرگرتن لە هێلەکانی ئاسن و رێگا ناویەکان، دەیانتوانی پەیوەندی بە بازارە سەرەکی و گرنگەکانی ولاتەوە بکەن. داهێنانی تەلەگراف لەلایەن ((ساموێل مۆرس)) کە لە دوای سالّی ١٨٤٤ وە لەسەرتاسەری ئەمریکادا بلاّو بوویەوە، هۆکارێکی دیکەی پەیوەندی کردن بوو، کە هەموو ناوچەکانی وولاتی بەیەکەوە دەبەستەوە.

پێشتر زانیمان کە پاش شەری ١٨١٢، ئەمریکا بەمەبەستی پەرەپێدانی کاروباری ئابوری و بازرگانی و دامەزراندنی چەند کارگەیەك لە ناوخۆی ولاتدا، بە خێرایی رێگەی پێشکەوتنی گرتە بەر لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی کارگە پیشەسازیەکانی دەولّەتی فیدرالّی دا بە پێویستی زانی، کە چەند رێسایەکی گومرگی نوێ دەربکات. بەروبومی سەرەکی ویلایەتەکانی باشوور لۆکە بوو، کە بەرەو ولاتی ئینگلیز دەنێررا و لەبەر ئەوەی کە توانای بەرهەمهێنانی ئەم بەروبومەی لاواز بوو، ناچار دەبوو پێداویستیەکانی خۆی لەدەرەوەی ولاتەوە دابین بکات. دانانی باجی گومرگی لەگەلّ بەرژەوەندی باشووریەکاندا نەدەگونجاو، بەتوندی نارەزایی خۆیان لەسەری دەربری. لەسالّی ١٨٢٠، ویلایەتی کارۆلینای باشوور رایگەیاند، کە دانانی باجی

گـومرگی بەزانـدنی قـانونی ئەساسـی و بڕیـارێکی نادادپەروەرانەیـە، بـەڵام کـۆنگرێس ئـەم نارەزایيانەی پشت گوێ خست و سوور بوو لەسەر جێبەجێکردنی بڕیارەکانی. لەم ڕۆژە بەدواوە، ئەو بابەتەی کە جێگای مشتومڕی ویلایەتەکانی باشـوور بـوو، بریتـی بـوو لـەوەی کـە ئایـا ویلایەتێك دەتوانێت لە جێبەجێکردنی یاسایەکدا کـە کـۆنگرێس بڕیـاری لەسـەر داوە، خـۆی بەدوور بگرێت یان ئەگەر سیاسەتی دەوڵەتی فیدراڵی بە پەسەند نازانێت، دەکرێت لەو دەوڵەتە پاشەکشێ بکات ؟! دوا بەدوای ئەم گفتوگۆو دەنگ و باسانە، ویلایەتەکانی باشوور پەنایان بـۆ بنـەمایەکی دیکە برد کە بە ((بنەمای هەڵوەشانەوە)) ناوی دەرکرد . بەو واتایەی کـە مـادام، هەر ویلایەتێك توانیویەتی بەلایەنی کەمەوە لەڕووی تیۆری یەوە پارێزگاری سـەربەخۆی یەکەی بکات، کەواتە مافی گۆڕانی ئەو یاسایەی هەیە، کە لە لایەن کۆنگرێسەوە بڕیاری لەسەر دراوە و یان ئەگەر ئەو یاسایەی بەپێـچەوانەی قـانونی ئەسـاسـی و دژ بـە دادپـەروەری زانـی، ئـاوا دەتوانێت بڕیاری جێبەجێکردنی ئەو یاسـایە لـە چوارچێـوەی ویلایەتەکەیـدا هەڵوەشـێنێتەوە. بیرۆکەی ((بنـەمای هەڵوەشانەوە)) لە لایەن دەسـەلآت دارانـی حکومەتـەوە ـ لەوانـە کلـهۆن جێگری سەرۆك کۆمار کە خۆی خـەڵکی ویلایەتـەکانی باشـوور بـوو ـ پێـشوازی لێکـدەکرا. مشتومڕێکی زۆر لەسەر پەیوەنـدی نێـوان حکومـەتی فیـدراڵ و حکومـەتی ویلایەتـەکان و، بنچینەی ئازادی و یەکێتی ـ لە کۆنگرێسدا ـ سەری هەڵدا، باوەڕیان وابوو کە ئەگەر جیـاوازی بیروڕا لە پێناسە و شیکردنەوەدا ڕوویدات، ئەوا لـە صـلاحیـەتی دا دادگـای باڵادایـە کـە لـە مەسـەلەکەدا دەست وەربدات.

نـاکۆکی نێـوان ویلایەتـەکانی بـاکوور و باشـوور، ڕەگ و ڕیـشەیەکی ئـابوری هـەبوو. دانیشتوانی باشوور لەسەر دەرکردنی یاساکانی باجی گومرگی ڕەخنەیان هـەبوو. لـە لایەکـەوە زیاد بوونی بەرهەمی لۆکە ووردە ووردە نرخەکەی لە بازارەکاندا دەهێنایە خوارەوەو، لە لایەکی تریشەوە خاوەن پیشەسازیەکانی باکوور نرخی شتومەکە دروست کراوەکانیان بەرز دەکردەوە.

باشووریەکان، کە دەبوو لە بەرامبەر ئەو مـاددە خاوانـەی کـە لـە بـواری کـشتوکاڵدا بـە نرخێکی هەرزان دەیانفرۆشت، بەروبومی پیشەسازی بە نرخێکی گران بهێننە ناوەوە، نارەزاییان لەسەر زیاد کردنی مافی (باج)ی گومرگی دەربڕی. لەساڵی ١٨١٢، کاتێـك کـە((جەکـسۆن)) پێرستی نرخی گومرگی کاڵای واژوو کرد و، نوێنەرانی ویلایەتەکانی باشوور دژی وەسـتانەوە و کارۆلینای باشووریش بە ڕاشکاوی ڕایگەیاند، کە ئەگەر کـۆنگرێس پـێش مێژوویـەکی دیـاری کراو مافی (باج)ی گومرگی هەڵنەوەشێنێتەوە، ئەوا لەو یەکێتی یە دێتە دەرەوە. لەبـەر ئـەوە

کۆنگرێس یاسایەکی دیکەی دەرکرد کە بەپێی ئەو یاسایە، نرخی مافی گومرگی بۆ ماوەی دەساڵ و بە ئەندازەیەك کە زیان بە بەرژەوەندی یەکانی دەوڵەت نەگەیەنێت کەم دەکرێتەوە. بەم شێوەیە دەوڵەتی فیدراڵ بە چاککردنەوەی نرخی گومرگ، پلانی دانوسانی لەگەڵ ویلایەتەکانی باشوردا دارشت.

لە ساڵی ١٨٣٢ ((جەکسۆن)) بۆ جاری دووەم بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار هەڵبژێررایەوە. لەم ماوەیەشدا، ئەو بابەتەی کە زۆرترین باس و گفتوگۆی لەسەر دەکرا، مەسەلەی بانکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو. ناوبراو دژی درێژ کردنەوەی کارکردنی بانکی مەرکەزی فیدراڵی بوو. بە بۆچوونی ئەو، سەرمایەدارە گەورەکان دەسەلاتێکی دارایی مۆنۆپۆلیان بۆ خۆیان پێکهێناوەو وەك دەستەیەکی خانەدانیان لێ هاتووە، بە رادەیەك کە کاریگەری دەسەلاتەکەشیان لە حکومەتدا هەستی پێ دەکرێت. ئەو باوەری وابوو، کە بوونی ئەم گروپە دەسەلاتدارە دەبێتە هۆی لاوازبوونی بنەماکانی یەکسانی، کە کۆمەلگەی ئەمریکا لەسەر ئەم بنەمایانە بونیاد نراوە.

سەردەمی((جەکسۆن)) لە هەمان کاتدا کە بە سەردەمی پەرەسەندنی مافی سیاسی دەژمێررا، سەردەمی لیبرالیزمی ئابوری و جەخت کردنەوە لەسەر نەهێشتنی دەست تێوەردانی دەوڵەت لە نێو کاروباری ئابوریش بوو، کە هاوکات لەگەڵ دەست پێکردنی سەردەمی شۆرشی پیشەسازی لە جیاتی سیستەمی((مەرکانتالیزم)) بایەخێکی گەورەی پێدرا. پشتیوانی کردن لە سەرمایە گوزاری تایبەتی، بەکارێکی پێویست و زەرور لە قەڵەم دەدرا، بەلام هەرجۆرە دەستێوەردان یان کۆنترۆڵ کردنێکی کاروباری ئابوری لەلایەن دەوڵەتەوە بە پێچەوانەی ئازادی و مافی تێکۆشان بۆ بژێوی ژیان لێك دەدرایەوە. دژایەتی ((جەکسۆن))یش بۆ دامەزراوەکانی بانکی مەرکەزی لەسەر ئەم باوەر راوەستابوو. ناوبراو لایەنگری بانکە مەحەللی یەکان بوو هەروەها لە پێناو لەناوبردنی دامەزراوەکانی بانکی مەرکەزی دا، سەرمایەی دەوڵەتەکەی خەرج کرد و خستیە بەردەستی بانکە مەحەللی یە گچکەکان و مافی دەرکردنی سکە و مامەڵەکردنی دراویشی پێدان. ئەمە یەکەمین قۆناغی مەترسی هەڵئاوسانی نرخی دراو سەرەتای سەرهەڵدانی قەیرانی ساڵی ١٨٣٧ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ((جەکسۆن)) نوێنەر و خۆشەویستی زۆرینەی میللەتەکەی بوو، سەرەتای سەرۆك کۆمارێتی یەکەشی بە سەرەتای گۆرانێکی کۆمەلایەتی نوێ لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەلگەی ئەمریکی دا دەژمێررێت.

چاکسازییەکۆمەلایەتییەکانی سەردەمی((جەکسۆن)) کاردانەوەی بیروباوەری پێشکەوتنخوازانەی مرۆڤ و هەستی گەشبینی و متمانەکردن بە لێهاتوویی و توانای تاکەکان،

کە بە ڕەخساندنی هەلومەرجێکی لەباروگونجا، کۆمەڵگە بەرەو پێشکەوتن و گەشەسەندن دەبات، ئەم چاکسازی خوازە کۆمەلایەتیانە لە بوارە جۆراو جۆرەکاندا دەستیان بە چالاکی کرد و جەختیان لەسەر بەدواداچوون و چاککردنی ژیانی نێو کرتووخانەکان، پەرەپێدانی مافی ئافرەتان، گرنگی دان بە بارودۆخی ژیانی کرێکاران، چاککردنی دام و دەزگا حکومیەکان تا پەرەپێدانی بواری فێرکردنی گشتی و بەخۆڕایی لەم سەردەمەدا دەکردەوە.

هزری پێشکەوتن و گەیشتن بەکەماڵ لە بیرو ڕاکانی سەردەمی ڕۆشنگەری سەدەی هەژدەیەمەوە وەرگیرا بوو ـ واتە باوەڕ بە مافی سروشتی و یاسای سروشت و پشت بەستن بە ژیری و ڕێنمایی منگق و بورهانی عەقلی. ئەم باوەڕە بەهزری پێشکەوتن خوازی یە لە سەدەی نۆزدەیەمدا لەگەڵ هەست و سۆز و مرۆڤ دۆستی دا ئاوێتە کراو، لە بازنەی سنورداری ڕۆشنگەران و فەیلەسوفان دا چووە دەرەوەو، لە پێناوکارکردن لە ژیانی تێکڕای خەلکدا بەکارهێنرا. پێشکەوتنە زانستیەکانی سەدەی نۆزدەیەم، سوود وەرگرتن لە داهێنانە نوێیەکان، گۆڕانی ئابوری پیشەسازی و باوەڕ بە ئەزموون و تاقی کردنەوە، هۆکارێك بوون بۆ ئەوەی بیرۆکەی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی بەرگێکی زانستیانەی بکرێت بەبەردا. بەگەشەکردنی هزری سوودمەندی و باوەڕ بەوەی کە مەبەست لە بیرۆکەی پێشکەوتن، دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی تێکڕای خەلکەکانە، ئەم بیرۆکانە لە بواری چاکسازیە کۆمەلایەتیەکاندا خرانە گەڕ و ووزە و تینێکی فراوانیان وەرگرت.

ڕاپەڕینی چاکسازیە فەرهەنگیەکان و پەرەسەندنی فێرکردنی گشتی، لە پرۆژە سەرەکی و بەرنامە سەرکەوتووەکانی ئەم سەردەمە بوو. لە بیرۆکەی پێشکەوتن دا، باوەڕ بە فێرکردنی گشتی بۆ پەرەسەندنی حکومەتی دیموکراتیك و گەشەسەندنی کۆمەلایەتی، بە بنەمای سەرەکی دەژمێررێن. هەڵبەت بیرۆکەی پەروەردە کردنی چینی لاو لە کۆمەڵگەی ئەمریکی دا هەمیشە و هەردەم جێی بایەخ و گرنگیدان بووە. ((پیوزرتینەکان))ی سەدەی حەڤدەیەم، فێرکردنیان بە بنەمای سەرەکی دامەزراندنی کۆمەڵگەی تەندروست زانیوە و، هەوڵ و کۆششەکانی ئەوان بوو کە دروست کردنی چەندەها قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دامەزراندنی زانکۆکانی وەك هاروارد و ییلی بەدواداهات.

بیری دامەزراندنی قوتابخانەی سەرەتایی لە شارو لادێکانی ئەمریکا، لە ڕێگەی کۆکردنەوەی باج و یارمەتی خودی دانیشتوانی ئەو ناوچانە ـ کەدواتر لەسەرتاسەری ئەمریکادا بلاوبوویەوە ـ بەنەریتێکی کۆنی ((پیوزرتینەکان)) دەژمێررێت. بزوتنەوە چاکسازی

خوازیەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم، ئەم بیرۆکەیەی گشتاند و بەدیاری کردنی باجێکی تایبەت بە مەبەستی فێرکردن لە هەر ویلایەتێکدا، سیستەمێکی نوێ ی فێرکردنی بە خۆڕایی بۆ زۆربەی خێزانە ئەمریکیەکان دانرا. ئەم فێرکردنانەش، غەیرە مەزهەبی و بنچینەیەکی زانستیان هەبوو. فێرکردنی بنەما مەزهەبیەکان لە قوتابخانەکاندا تەرك کراو ئەو ئەرکە خرایە ئەستۆی قوتابخانە ئاینیەکان و بودجەکەشی لەبودجەی قوتابخانە گشتی یەکان جیا کرایەوە. پەیڕەوکردنی سیستەمی خوێندنی ئیجباری، لەسەدەی نۆزدەیەم دا کە جەختی لەسەر ناسینی فەرهەنگ و خودی کۆمەڵگەی ئەمریکی دەکردەوە، کاریگەریەکی زۆر لەسەر یەکگرتوویی و یەکیەتی بیروباوەڕی گشتی ـ کەلەهەموو کون و قوشبنێکی ئەم جیهانەوە کۆچیان کردبوو ـ هەبوو. هەستی نیشتمانپەروەری، بیرکردنەوەی شارستانیانەو عورفی و، زانستە سروشتیەکان لە نێو سیستەمی فێرکردنی توێژی لاواندا جەختی لەسەر کرایەوە و، فێرکردنیش بە هۆکارێکی سەرەکی لە چارەسەرکردنی گیروگرفتە کۆمەڵایەتیەکاندا لەقەڵەم دەدرا. قوتابخانە ناوەندیەکان بەوەرگرتنی باجی گشتی، وردە وردە پەرەیان سەند و تا هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ زۆربەی ویلایەتەکانی باکوور و ڕۆژئاوا بەیەك ئاست سیستەمی خوێندنی خۆڕاییان تێدا پەیڕەو کرا. بەهۆی پێشنیازەکەی ((مریل))ەوە کەلەساڵی ١٨٦٢ خستیە ڕوو، گوژمەیەکی تایبەتی لەلایەن دەوڵەتی فیدڕاڵیەوە بەمەبەستی دروستکردنی پەیمانگا کشتوکاڵیەکان خرایە بەردەستی ویلایەتەکان. ئەم هەنگاوەش هۆکاری سەرەکی پەرەسەندنی زانکۆکانی نێو ویلایەتەکان بوو لە سەرتاسەری ئەمریکادا. باوەڕ بە بیرۆکەی پێشکەوتن و بەرەو پێشەوە چوونی کۆمەڵایەتی، چاککردنی باری ژیانی کۆمەڵایەتی ئافرەتانیشی لێکەوتەوە. ژنانی ئەمریکا لەسەردەمی کۆچنشینەکاندا، بە بەراورد لەگەڵ ژنانی ئەورووپی، لە بارودۆخێکی چاکتردا دەژیان و ئەوانەشیان کە هاوسەریان نەکردبوو، هەموو ئەو مافانەیان هەبوو کە بە پیاوان درابوو، بەڵام پاش شوو کردنیان، زۆربەی ئەو مافانەیان لێدەسەنرایەوە و فێرکردنیشیان تەنها لە بوارەکانی خوێندن و نوسین و دورمان و گوڵچنین و سەماکردن و فێربوونی مۆسیقادا کورت کرابوویەوە، کە تەنها ژمارەیەکی کەم لە ئافرەتان دەیانتوانی بەشداریان تێدا بکەن، کە ئەوانیش چینی خۆشگوزەران بوون.

ئامانج لەم جۆرە پەروەردە کردنانە، بریتی بوو لە ئامادەکردن و فێرکردنی کچان بۆ پرۆسەی هاوسەرگیری و جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ماڵەوە. لە ساڵی ١٨٢٠،((ئەما ویلارد)) وەك ئافرەتێکی چالاك و بەئاگا ، هەستا بە دروست کردنی خوێندنگەیەك، کە زانستە

ئەزموونی بیرکاریەکانی تێدا بووتریتەوە. ((فرانسیس رایت))، ژنە روناکبیری ئینگلیزی لەماوەی گەشتە جۆراوجۆرەکانی دا بۆ ئەمریکا و پێشکەش کردنی چەند وتارێك دەربارەی فێرکردن و مافی ئافرەتان، توانی سەرنجی بیرورای گشتی بۆ چارسەرکردنی گیروگرفتەکانی ژنان رابکێشێت. یەکەمین کۆلێژی کچانە، کە هەمان بەرنامەی زانکۆکانی دیکەی پەیرەو دەکرد لەساڵی ١٨٣٧ لە ((مۆنت هایلۆك)) دامەزرا، هەرچەندە تا کۆتای یەکانی سەدەی نۆزدەیەمیش ناوی زانکۆی لێ نەنرا. بزوتنەوەی ئازادی ئافرەتان و بزوتنەوە چاکسازی خوازیەکانی دیکەی وەك راپەرینی روو بەڕوو بوونەوەی کۆیلایەتی، لەم سەردەمەدا سەریان هەڵدا. یەکەمین کۆبونەوەی گشتی سەبارەت بە مافی ئافرەتان لەساڵی ١٨٤٨ و لەشاری سنکا فالزی سەر بە ویلایەتی نیو یۆرك بەسراو، گفتوگۆیەکی زۆریش لەسەر مەسەلەکانی وەك مافی یەکسانی لەگەڵ پیاوان و رەخساندنی هەلی گونجاو لە بوارە جیا جیاکاندا ئەنجام دران،((ئیلیزابێت کەدی ئستانتۆن)) و((لوکر سیامات))، کە لە بەناوبانگ ترین رابەرانی ئەم راپەرینانە بوون، بلاو کراوەیەکی هاوشێوەی راگەیاندنی سەربەخۆی یان لەگەڵ هاوکارەکانیاندا بلاو کردەوە، کە تیایدا جەختیان لەسەر مافی یەکسانی و ئینسانی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکی کردەوە. بزووتنەوەی ئازادی ئافرەتان لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم دا، پشتیوانیەکی تەواویان لە راپەرینەکانی دژ بە کۆیلایەتی کرد و، تا دەهات چالاکیەکانی ژنان لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ئابوری، سیاسی و فێرکردن دا زیادی دەکرد. پاش شەری ناوخۆی ئەمریکا، چەندەها کۆلێژی نوێی کچانە لە ویلایەتەکاندا دروست کران و ژمارەیەکی زۆر لە کچانیان لە هەموو بوارەکاندا ناو نوس کرد.

نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم، بە سەردەمی گۆرانکاریە ئەدەبیەکانی ئەمریکا هەژمار دەکرێت. بە گەشەکردنی بنەماکانی دیموکراسی لەسەردەمی ((جەکسۆن)) دا، پلەو پایەی تاك و ئازادی تاکەکەس لەم سەردەمەدا بایەخێکی زۆری پێدرا. پشت بەستن بە بەها مرۆڤایەتیەکان و بنچینەی تاك، گرنگترین بەشەکانی ئەدەبیاتی ئەم سەردەمی ئەمریکا پێك دەهێنێت، کە لە بەرهەمی نوسەراندا بە چاکترین شێوە رەنگی داوەتەوە.((ئەمرسۆن)) بیرمەندی بەناوبانگی ئەمریکی، لەم رۆژگارەدا دەژیا. ناوبراو باوەری بە دەسەلاتی شێوە خودایی مرۆڤ و جیهانگیری رۆح و هەروەها نوێنەری ئایدیالیزم و هەستی گەشبینانەی ئەمریکایە. ئەم سەردەمە لە رووی گەشە کردنی ئەدەبیاتەوە بە سەردەمە گرنگەکانی مێژوویی ئەمریکا لە قەڵەم دەدرێت.

((تۆرۆ))،((لانگ فلۆ))،((هاتۆرن)) و((ملویل)) هەموویان لە نوسەر و بیرمەندە بەناوبانگەکانی ئەمریکای پڕ جموجوڵ و لاو و دیموکراتیکی سەدەی نۆزدەیەمە.

بە درێژایی ماوەی نێوان ١٨١٢ تا شەڕی ئەسپانیای کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم، ئەمریکا هەموو توانایەکی خۆی لە پێناو چارەسەرکردنی گرفتەکانی ناوخۆ و ئاوەدان کردنەوە و بوژانەوەی ناوچە نوێیەکاندا خستە گەڕ. لە ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم سەردەمە، فراوانکردنی سنوورەکان و چەسپاندنی ناوچە دەست بەسەردا گرتووەکانی ڕۆژئاوا بوو. بەمەبەستی هێنانەدی ئەم ئامانجانەی دەوڵەت و ویلایەتەکان، حکومەت پشتیوانی خۆی بۆ خەڵکەکەی دووپات کردەوە و، توانی دەست بەسەر کیشوەرێکی گەورەی وەك ئەمریکای باکوردا بگرێت. پەرەپێدانی ویلایەتەکان و لکاندنی ئەو زەویە پان و بەرین و بە پیتانە بۆ وڵاتێکی تازە بونیاد نراو، بەو دانیشتوانە فرە ڕەگەزەیەوە کە تیایدا دەژیان، کارێکی ئاسان نەبوو. ناکۆکی و دژایەتی نێوان ویلایەتەکان، بۆنی مەترسیەکی گەورەی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان لێ دەهات، ئەویش مەتری جیابوونەوە و دوو بەرەکی نێوان ویلایەتەکان بوو. لە ڕاستیشدا سەرهەڵدانی شەڕی ناوخۆی ئەمریکا، لە پێناو بەرەنگاربوونەوەی ئەم پەرتەوازەیی و دوو بەرەکیە بوو. بەردەوامی وبەرگری یەکیەتی ویلایەتەکانیش، بەهێزی بونیادی حکومەتی سیاسی ئەمریکا دەردەخات.

لەساڵی ١٨٠٠، تێکڕای ئەو ناوچانەی کە بە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەناسرا، سنوورەی لە کەناری ڕووباری مى سى سى پى بەولاوە تێپەڕی نەدەکرد، ئەسپانیا ناوچەی فلۆریدای لەژێر دەست دا بوو، کە ئەمەش کۆسپێکی گەورەی لەبەردەم ئەمریکادا بۆ گەیشتن بە کەنداوی مەکسیك دروست کردبوو. بەندەری ستراتیجی نیوئۆرلیانزیش، هەر لە ژێر کۆنترۆڵی ئەسپانیەکاندا بوو هەروەها فەرەنسیەکان دەستیان بەسەر ناوچەی لویزیانادا گرتبوو، بەڵام ئەمریکا لەماوەی نیو سەدەدا توانی سنورەکانی خۆی تا سێ سەد ئەوەن پەرە پێبدات و خۆی بگەیەنێتە ئۆقیانوسی ئارام [کە ئەمەش شاکارێکی گەورەیە]. ئامانج لە فراوانکردنی سنورەکان و لکاندنی زەویە تازەکان بە ویلایەتە یەکگرتووەکانە، نەلەبەر زۆری ڕێژەی دانیشتوان بوو، نە لەبەر نەبوونی زەوی کشتوکاڵی پێویست، ئەوەی پاڵی بە ئەمریکیەکانەوە بەرەو ڕۆژئاواو نیشتەجێبوون لەو ناوچە نوێیانە دەنا، تەنها زەویە بەلاش و بەپیتە کشتوکاڵیەکانی بوو، کە کۆچبەرە ئەوروپیەکانی بۆ ئەم مەبەستەو لە پێناو دەستەبەرکردنی ژیانێکی خۆشگوزەراندا بەرەوە ئەمریکا ڕادەکێشا. شتێکی ئاسایش بوو، کە لەماوەی چەند ساڵێکدا، خێزانێك سێ یان چوارجار شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی بگوازێتەوە و لە ناوچەیەکی

نوێدا نیشتەجێ ببێت. ((تۆکویل)) وەك گەشتیارێکی ئەو رۆژگارە دەنوسێت :((ئەمریکیەکان، هەموو رۆژێك شوێنی لەدایك بوونی خۆیان بەجێ دەهێڵن و بەهیوای دامەزراندنی زەویەکی کشتوکاڵی گەورەو بەرفراوان روو لە ئەمریکا دەکەن. لە کاتێکدا کە خەڵکی هەژاری ئەوروپا، کۆڵیتە بچوکەکانی خۆیان بە مەبەستی نیشتەجێ بوون لە کەنارەکانی ئۆقیانوسی ئەتلەسی دا بەجێ دەهێڵن، تاکی ئەمریکی کە خۆی بۆ خۆی لەم کەنارانەدا لەدایك بووە، زێدەگاکەی خۆی واز لێ دێنێت و بەرەو خەڵوەتگەکانی ناوەراستی ئەمریکا کۆچ دەکات...کۆچ کردنەکان لەو بەری ئەورووپاوە دەست پێ دەکەن و بە کەنارەکانی ئۆقیانوسی ئەتلەسی دا تێدەپەرن و لەخەڵوەتگەکانی دونیای نوێدا کۆتاییان پێ دێت. بە درێژایە ئەم هێڵە، ملیۆنەها مرۆڤ، چاویان بریوەتە ئاسۆیەکی دیار و هاوکات بەرەو پێشەوە دەرۆن. زمان و رەوشت و داب و نەریتیان جیازە، بەلام مەبەستێکی هاوبەشیان هەیەو بە هەموشیان وتراوە، کە بەختەوەری و سەروەت لە شوێنێکدا چاوەرێیان دەکات و هەموویان بە ئامەزرۆی یەوە بەرەو پێشوازی لێ کردنی دەچن.)) بە کرینی ناوچەی لوئویزیانا، بەرامبەر بە ۱۵ ملیۆن دۆلار، ناوچەیەکی بەرفراوانی نێوان روباری می سی سی پی تاوەکو چیاکانی راکی خرایە سەر ئەمریکا. بەدەست هێنانی ئەم زەویە نوێ یانە و نیشتەجێبوونی ئەمریکیەکان تیایاندا، بە ئامانجی سەرەکی چالاکی یە کانی ئەو سەردەمە دەژمێررێن، کە بە رێگا چارەی هەموو گیر و گرفتە کۆمەلایەتیەکان دادەنرا و باوەریشیان وابوو کە گیرو گرفتە ماددی و سۆزداری و ئەو کێشانەی کە روو بە رووی خێزانەکان دەبێتەوە بە کۆچ کردنیان بەرەو رۆژئاوا و دەست پێ کردنی ژیانێکی نوێ چارەسەر دەکرێن.(( تۆکویل )) پێ ی وایە :(( تاکی ئەمریکی لە پێناو بەدەست هێنانی سەروەت و سامان تیرە ژەهراویەکانی ئەیتڤەکان و ئەخۆشیە تایبەتیەکانی بیابانەکان بە گیانی دەکرێت. لە بێ دەنگی دارستانەکان ناترسێت و سڵ لە روو بە روو بوونەوەی ئاژەڵە درندەکانیش ناکاتەوە، چونکە هەموو تاکێك عەشق و خۆشەویستی بەهێزتر لە خۆشەویستی بۆ ژیان، بەرابەر و رێنوێنیکەری خۆی دەزانێت. لەبەرامبەریدا کیشوەرێکی بێ سەر و بن هەیە، بەلام ئەو بەرادەیەك (شڵەژاوە) و پەلە دەکات کە دەڵێی دەترسێ، ئەوەك شوێنێك بۆ ئەو نەمێنێتەوە و درەنگ بگاتە جێ. من لە مەسەلەی کۆچبردن لە ویلایەتە نوێ یەکانەوە سەرم سور دەمێنێت. لەکاتی دامەزراندنی ویلایەتی ئۆهایۆ وە تائێستا پێنج ساڵ تێدەپەرێ و بەشێکی گەورەی دانیشتوانی ئەم ویلایەتە کەسانێکن کە لەو شوێنەدا لە دایك نەبوون... زەویەکی کشتوکاڵی بەرفراوان لەو ناوچانەدا هەیە، کە هیچ کەسی تێدا ناژی . لەگەڵ ئەوەشدا

دانیشتوانی وەها ویلایەتێك كۆچكردنیان بەرەو رۆژئاوا دەست پێ كردوە و، ئەمرۆ لە ویلایەتی ئۆهایۆدا نیشتەجێ بوون، كە بەرەو لەوەڕگا پڕ لە سەوزایەكانی ئیلی ئەوا شۆڕ بوونەتەوە و ئێستاش بە ئومێدی بەدەست هێنانی ژیانێكی چاكتر، لەوەتەنی دووەمی خۆیانەوە كۆچ دەكەن ... بەلای ئەم كەسانەوە، تەماعی بەدەست هێنانی ژیانێكی خۆشگوزەران و ئاسودە وەها گرویتینێكی دروست كردووە كە خۆی لە خۆیدا، [مرۆڤ]بێزار دەكات.))

تا مەزرۆیی رۆشتن بەرەو رۆژئاوا و پەرەسەندنی سنورەكانی ئەمریكا لەو سەردەمەدا بە واتای ((چارەنووسی یەكلاكەرەوە)) لێك دەدرایەوە. باوەڕ وابوو كە پەرەپێدانی سنورەكان و نیشتەجێبوون و ئاوەدانی ناوچە تازەكان، قەدەرێكی خوای بەو كە ئەمریكیەكان بەرەو فراوانكردنی شارستانیەتەكەیان و ئاوەدان كردنەوەی ئەم بەشەی دونیای نوێ رێ نوێنی دەكات.((جۆن ئوسالیوان)) كە سەرنووسەی گۆڤارێكە لە شاری نیویۆرك، لە ساڵی ١٨٤٥ لە وتارێكی دا دەنوسێت : ((دەبێت چارەنووسی یەكلاكەرەوە بە پەرپێدانی سنورەكان و داگیركردنی زەویە بەرفراوانەكانی رۆژئاوا ، كە پەروەردگار خستویەتیە بەردەستی ئێمە تەواو بكەین و بیگەیێنینە ئەنجام.)) واتای ((چارەنووسی یەكلاكەرەوە لەو كاتە بەدواوە بۆ ئاراستەكردنی بەرەو پێشەوە چوون بەرەو رۆژئاوا بەكار دەهێنرا. كۆشش لە پێناو بەدیهێنانی ئەو ئامانجە و پەرەپێدانی سنورەكانی ویلایەتە یەكگرتووەكان، بە بەشێكی گرنگی مێژووی ئەو ولاتە لە قەڵەم دەدرێت. ئەم بەشەی مێژوو، كە بە مێژووی پێشەنگەكان بەناوبانگە، سەرگوزشتەی خەلكانێكە كە لە ناوچە جیاجاكانی ئەوروپا و ویلایەتە یەكگرتووەكانەوە بە بیر و رای جیاواز و بە هیوای كۆكردنەوە ی سەروەت و بەدەست هێنانی ژیانێكی چاكتر بەرەو ئەو ناوچە نەناسراوانەی رۆژئاوا كۆچیان دەكرد و ژیانی سەرەتایی و كوند نشینی رۆژئاوایان وردە وردە بۆ كۆمەلگەیەكی گەشە كردوو بە دامەزراوە ئابوری وسیاسی و كۆمەلایەتیە نوێیەكان دەگۆری.

تەنها مەبەستی سەرەكی كۆچكردنی خەلكی بە دەستهێنانی زەوی كشتوكاڵی بوو، كە مژدەی ژیانێكی چاكتر و خۆشتری لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، رووبەری فراوان و ئەو دیمەنە كراوە و بەرواڵەت بێ سنورەی كە لە بەرامبەریاندا رەخسا بوو، خۆی لە خۆیدا ئازادیەكی تایبەتی بەم كەسانە دەبەخشی. زەویە كشتوكاڵیەكانی ناوچەكانی رۆژهەلات، وەك ((نیو ئینگلەند)) زۆر فراوان نەبوو، بەلام بەسەرنجدانی ئەو نوێنگەیەی كە زەویەكانی رۆژئاوا نمایشیان دەكرد، واقت وڕ دەما. یاساكانی تایبەت بە خاوەنداریتی، پشتیوانی و پارێزگاریەكی تەواوی مافی ئەو

پیشەنگانەی دەکرد کە دەبوونە خاوەنی زەویەکی بەرفراوان. گروپە جۆراوجۆرەکان، لە چینی بازرگان و مافپەروەرەوە بیگرە تا گروپە مەزهەبیەکان و ئەهلی سیاسەت و ڕووداوخوازەکان، هەلومەرجێکی لەباری کارکردنیان لەبوارەکانی خۆیاندا بۆ ڕەخسا. سەفەر کردن بەرەو ڕۆژئاوا، هەندێك جار تاکەکەسی و زۆرجاریش بە شێوەیەکی دەستە دەستە ئەنجام دەدرا. هەر کۆمەڵێکیش کە لە شوێنێکدا کۆ دەبوونەوە، بانك و قوتابخانە و کتێبخانە و دامەزراوە کۆمەلایەتیەکانی دیکەشیان بۆ خۆیان دروست دەکرد.

نزیکەی یەك سەدەی تەواو، لە ١٧٩٠ تا ١٨٧٠ ، لێشاوی کۆچکردن بەرەو زەویەکانی ڕۆژئاوا بەرێ کەوتبوو. چەندەها شاری نوێ و ویلایەتی پڕ لە سەروەت و سەرمایە بونیاد نران. پاش شەڕی ١٨١٢، کۆچکردن گەیشتە ئەوپەڕی ڕادەی خۆی. دروست کردنی هێڵەکانی پەیوەندی نێوان شارەکان. هێڵەکانی ئاسن، بەکارهێنانی کەشتیە هەڵمیەکان لە ڕێگەی ڕووبای می سی سی پی یەوە، هۆکارێکی گەورە و سەرەکی پەیوەندی نێوان ناوچەکان بوون. زەویەکانی ڕۆژئاوای ئەم ڕووبارە بەشوێنێکی گرنگ و ستراتیجی بۆ کۆچبەران و خەڵکی ڕوداو خواز لەقەڵەم دەدران، کە لە پێناو بەدەست هێنانی سەروەت و ساماندا، سڵیان لەهیچ جۆرە ڕووداوێك نەدەکردەوە. یەکێك لەو پیشە سەرەکیانەی کەبەلای ڕۆژئاوا نشینەکانەوە بایەخێکی زۆری پێ دەدرا، بازرگانی پێستە بوو. ((ئاستۆر)) کە یەکێك بوو لەو پیاوە پێشەنگانەی، کە سەرکەوتنێکی گەورەی لەم بوارەدا بەدەست هێنا، توانی لە ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی میشیگان و دۆڵی می سی سی پی، چەند بنکەیەکی بازرگانی دابمەزرێنێت و، لە ساڵەکانی ١٨٢٠ خۆی بگەیەنێتە کەنارەکانی باکوری ڕۆژئاوای ئەمریکا و ناوچەی ئۆرۆگۆن و دواتر سەروەتێکی ئێجگار زۆر لە ڕێگەی بازرگانی کردنی پێستی ئاژەڵە کێویەکانەوە کۆ بکاتەوە. ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی ((ئاستۆر)) ژمارەیەکی زۆری ڕوداوخوازەکانی بەرەو ڕۆژئاوا و دۆزینەوەی ڕێگا نوێ یەکان هان دا. یەکێك لەم کەسایەتیە سەرکەوتوانە، ئەفسەرێك بوو بەناوی ((جۆن فرمۆنت)) کە لەگەڵ گروپێکی پلان دانەردا، چەندەها سەفەری ئکتشافی بەرەو ڕۆژئاوا و ناوچەی ئۆرۆگۆن و کالیفۆرنیا ئەنجام داو توانی بۆ ماوەیەك لە کالیفۆرنیادا کۆمارێکی سەربەخۆو جودا لە دەوڵەتی مەکسیك ڕابگەیەنێت.

ناوچەی کالیفۆرنیا لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شانزەدا لەژێر دەستی ئسپانیادا بوو، ئسپانیەکان بۆماوەی نزیکەی ١٧٠ ساڵ ـ جگە لە گەشتە کاتی یە دەریاییەکانی ((فرانسیس دریك)) لە ساڵی ١٥٧٩ـ تەنها دۆزەرەوەکانی کالیفۆرنیا بوو. پاش لاوازبوونی دەسەلاتی

ئسپانیا و سەربەخۆیی مەکسیك، ئەم ناوچانە بوون بە شێك لە قەڵەم ڕەوی دەوڵەتی مەکسیك. ڕووداو خوازان و نوێنەری دەوڵەتی ئسپانیا، چەندەها جار هاتبوونە ئەم کەنارانە و، لەوناوەڕاستەکانی سەدەی هەژدەیەم دا، گروپە جیاوازە مەزهەبیەکانیش چەندەها گەشتیان بۆ ئەم ناوچانە بە ئەنجام گەیاند. ئەمانە بانگەشەکارانی مەزهەبی کاتۆلیکی بوون، کە زیاتر بۆ بلاَوکردنەوەی ئاینەکەیان لەنێو ئەیتقەکاندا سەفەریان دەکرد، هەرچەندە لەم کارەیاندا سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهێنا. لە ئەنجامدا و تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەم، کێشمەکێشی ئسپانی یەکان لەگەڵ زەوی، سروشت و ئەیتقەکاندا هەر بەردەوام بوو، ووردە ووردە سپی پێستەکانیش ڕوویان لەم ناوچانە کرد و ئەمریکیەکان بۆ بازرگانی پێستە لە کەنارەکانی ڕۆژهەلاتەوە بە گوڕمە دەهاتن و بە تێپەڕ بوونی کات ڕوداوخواز و ئەو کەسانەی کە بەدوای سەروەت و سامانی زۆرتردا دەگەڕان، گەشتنە کەنارەکانی ڕۆژئاوا، بەلاَم لەبەرئەوەی ژمارەی ئەم کەسانە کەم بوون، کۆچکردنەکانیش بەڕێژەیەکی کەم ئەنجام دەدران. دۆزینەوەی زێر لە ساڵی ١٨٤٠، شالاَوی کۆچبەر و خەڵکە ڕوداو خوازەکانی بەرەو ئەم ناوچەیە خستە ڕێ و لە ماوەیەکی کەمدا کالیفۆڕنیا بوو بە یەکێك لە قەرەباڵغ ترین ویلایەتەکانی ئەمریکا. ناوچەی ئۆرۆگۆن کە بە پێی پەیاننامەیەك لەنێوان ئینگلیز و ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، لەژێر چاودێری هەردوو لادا بەڕێوە دەبرا، بە کۆچکردنی ژمارەیەك خەڵکی ئەمریکا بەرەو ئەو ناوچەیە، ڕوو بەڕووی بارودۆخێکی نوێ بوویەوە و مەسەلەی لکاندنی ئەو ناوچەیە بە ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە سەری هەڵدا. لەسەردەمی سەرۆك کۆماریتی ((جیمز پولك)) دا لە ساڵی ١٨٤٦، ئۆرۆگۆن خرایە سەر ویلایەتە یەکگرتوەکان و سنوری نێوان ئەمریکا و کەنەدا لەسەر هێڵی ٤٩ پلە چەسپا، کە سنوری ئێستای نێوان هەردوو وولاتیش دیاری دەکات. دەست بەسەردا گرتنی کەنەدا لە لایەن ئەمریکاوە، بەو شارەزاییەی کە حکومەتی ئینگلیز لە ڕووی شوێنی جوگرافیەوە هەیبوو، کە بە بەخشینی حکومەتی خۆبەڕێوەبەری بۆ ئەم ناوچەیە، ئەو حکومەتی خستبوویە ژێر بازنەی دەسەلاَتی خۆیەوە، کارێکی زۆر ئەستەم بوو.

بابەتێکی دیکە، کە مشتومڕێکی زۆری لەسەر کرا، مەسەلەی تەکزاس بوو. لەساڵەکانی ١٨٢٠ دا، ژمارەیەکی زۆر لە ئەمریکیەکان بەتایبەت ئەوانەی کە خەڵکی ویلایەتەکانی باشوور بوون، سوودیان لەو یاسا سووك و ئاسانانەی دەوڵەتی مەکسیك سەبارەت بە کۆچکردن بەرەو تەکزاس وەرگرتبوو، بۆ چاندنی لۆکە و کشتوکاڵەکانی دیکە لەگەڵ کۆیلەکانی خۆیاندا

بەرەو ئەم ناوچەیە هاتبوون. ئەم گروپانە سەرەتا لەژێر سەرپەرشتی کەسێك دا بەناوی ((ئاستین))، لەناوچەی تەکزاس دا نیشتەجێ بوون. لەماوەی ئەو سێ سەدەی کە بەسەر دەست بەسەردا گرتنی ئەم ناوچەیەدا تێدەپەڕی، تەنها چوار هەزار کەسی ئسپانی بۆ ئەم ناوچەیە کۆچیان کردبوو. لە کاتێکدا کە ئەو گروپە ئەمریکیەی کە لەگەڵ ((ئاستین)) دا هاتن، لەماوەی سێ ساڵدا ژمارەیان گەشتە پێنج هەزار کەس و لەساڵی ١٨٣٦ ئەو ژمارەیە بۆ دوو سەد و پەنجا هەزار ئەمریکی زیادی کرد، کە ژمارەیان بە بەراورد لەگەڵ هەموو دانیشتوانی ئسپانی و مەکسیکی یە کاتۆلیك مەزهەبەکانی نیشتەجێ بووی تەکزاس دا، زیاتر بوو. مەکسیکیەکان، کە زۆر لەگەڵ شێوازی ژیان و دابونەریتی ئەمریکیەکان دا ئاشنا نەبوون، ئەوانیان بەحاڵی خۆیان واز لێهێنا. لەساڵی ١٨٣٤، کە سایەتیەکی سەربازی بەناوی ((سانتانانا)) جڵەوی دەسەڵاتی حکومەتی مەکسیکی گرتەدەست و ناوچەی تەکزاسی بەناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی سەربازی حکومەتی مەکسیك ڕاگەیاند. بەڵام دانیشتوانی ئەمریکی ئەم ناوچەیە، کە ژمارەیان لە مەکسیکیەکان زیاتر بوو، تەسلیمی ئەم بڕیارە نەبوون. سەربازەکانی ((سانتانانا))ش بەمەبەستی سەرکوتکردنی یاخی بووان، گەمارۆی یەکێك لە قەڵاکانیان دا کەناوی ((ئالامو)) بوو، دواتر هێرشیان کردە سەر قەڵاکە و ١٨٨ هاوڵاتی ئەمریکیان تێدا قەتڵوعام کرد. پاش ئەم ڕووداوە، دروشمی یاخی بووان بەم شێوەیە بوو: (( ئالاموتان لەبیر نەچێتەوە.)) دوا بەدوای ئەم ڕووداوە، یەکێك لە ئەمریکیەکانی تەکزاس بەناوی((سام هۆستۆن))، توانی سوپایەك پێك بهێنێت و بەسەر((سانتانانا)) دا زاڵ ببێت و تەکزاسیش وەك ناوچەیەکی سەربەخۆ لە ساڵی ١٨٣٦ ڕابگەیەنێت و، خۆیشی ببێتە سەرۆکی حکومەت.((هۆستۆن)) یەکێك بوو لە هاوڕێیەکانی سەرۆك کۆماری ئەمریکا و خوازیار بوو، ناوچەی تەکزاس بە ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە بلکێنرێت. هەرچەندە ڕاستەوخۆ ئەم کارە ئەنجام نەدرا، لەساڵی ١٨٤٤، کۆنگرێسی ئەمریکا ڕەزامەندی لەسەر ئەم کارە دەربڕی. دەوڵەتی مەکسیك ناڕەزایی خۆی لەبەرامبەر ئەم بڕیارەی کۆنگرێسدا دەربڕی و پێشنیازەکەی ئەمریکای سەبارەت بە کڕینی تەکزاس ڕەتکردەوە. لەبەرئەوە ئەمریکا، شەڕی دژ بەم وڵاتە ڕاگەیاند و لە ئەبەردی ((پالۆ ئالتو))دا، هێزەکانی مەکسیکی شکست پێ هێنا. لە ئەنجامدا بە پێی پەیماننامەی((گوادولوپ هیدالگۆ)) کە لەساڵی ١٨٤٨ لە نێوانیاندا مۆرکرا، حکومەتی مەکسیك لەسەر پێشنیازەکەی ئەمریکا دەربڕی و نیو مەکسیکۆ و کالیفۆرنیای لە بەرامبەر پانزە ملیۆن دۆلاردا بە ئەمریکا فرۆشت، کە دواتر ویلایەتەکانی کالیفۆرنیا، تواادا، نیو

مەکسیکۆ، ئاریزۆنا، کلورادۆ، یوتا، تەکزاس و ئۆکلاهۆمای لێ پێك هات. بەم شێوەیە ئامانجەکانی ((چارەنووسی یەکلاکەرەوە)) هەموویان هاتنە دی و ولاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئۆقیانوسی ئەتلەسیەوە تا ئارام پەرەی سەند و پێ ی نایە قۆناغێکی مێژوویی نوێ وە.

لەساڵی ١٧٥١ ((بنجامین فرانکلین))، وا تەسەوری دەکرد، کە کیشوەری ئەمریکای باکور ئەوەندە بەرفراوان و گەورەیە، کە ئاوەدان کردنەوە و نیشتەجێکردنی چەندەها سەدە دەخایەنێت، بەلام بە پێچەوانەی بۆچونەکەی ((فرانکلین)) هاتەدی و، لەماوەی کەمتر لە نیو سەدە پاش دامەزراندنی کۆماری ئەمریکا، نیشتەجێکردن و ئاوەدانکردنەوەی ئەم کیشوەرە لەلایەن ئەو ئەوروپیانەی کە کۆچیان دەکرد بەرەو ئەمریکا، کەوتە قۆناغی جێ بەجێکردنەوە.

لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەیەم دا، ((فردریك جەکسۆن ترنەر)) مێژوو نووسی ئەمریکی، لێکۆڵینەوە بەناوبانگەکەی خۆی دەربارەی کاریگەری سنورنشینی و رۆشتن بەرەو رۆژئاوا لەسەر بەرقەرارکردنی دیموکراسی لە ئەمریکادا بلاو کردەوە. ناوبراو جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە پەرەسەندنی سنورەکانی ئەمریکا و ئاوەدانکردنەوەی ناوچە نوێیەکان، لەسەر شێوازی ژیان و رۆحیە و جۆری بیرکردنەوەی کۆمەلگەی ئەمریکی و چەسپاندنی دیموکراسی دا کاریگەریەکی زۆرتری هەبووە، تاوەکو فەرهەنگ و شارستانیەتی ولاتانی ئەوروپا. بە بۆچونی ((ترنەر)) دیموکراسی ئەمریکا نەهیچ جۆرە تیۆرێکی سیاسی کاری تێکردووە، نە لەگەل کۆچبەرەکاندا هێنراوەتەوە ئەمریکا، بەلکو زەویە پان و بەرینەکان، دارستانە بەرفراوانەکان و زۆری سەرچاوە سروشتیەکان، کۆمەلگەی دیموکراتیکی ئەمریکایان دامەزراند. هەروەها تایبەتمەندیەکانی کەسایەتی تاکی ئەمریکی، وەك هەستی تاکگەرایی ، متمانە بەخۆبوون، هێزی راوەستان لە بەرامبەر ئەو گرفتانەی کە روو بەروویان دەبێتەوە و گۆرانی ژینگەی سروشتی بەرەو کۆمەلگەیەکی خۆشگوزەرانی، بە ئەنجامی هۆکاری سنور نشینی و رۆشتن و نیشتەجێبوون بەرەو زەویە فراوان و دەولەمەندەکانی رۆژئاوای ئەمریکا دەزانی.

ئەو بۆچوونەی، کەلە هەستی نیشتمان پەروەری و بیرکردنەوە رۆمانتیکیەکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە سەرچاوەی گرتووە، لەگەل راستیە مێژوویەکاندا زۆر ناگونجێت.

شەست سال پێش ((ترنەر))،((تۆکویل)) لە رێگەی ئەو توێژینەوانەی کەلەسەر ئەمریکا ئەنجامی داون، بەووردی بیری یەکسانی یە کۆمەلایەتیەکان، وەك یەکی و هاوسەنگی هەلسوکەوت، دابونەریت و زیندەگی ئەمریکیەکانی چ لەناو شار و چ لە گوند و ناوچە کەنارگرتووەکانی نێو دەشتایی جەنگەلەکاندا روون کردۆتەوە.

ئەو لەگەڵ ئاماژە کردن بەو گفتوگۆیانەی کە لەگەڵ خەڵکی سنور نشینەکانی نێـو کۆڵێتـە گچکەکاندا و لە ناوجەرگەی سروشت دا ئەنجامی داوە، ڕوونی دەکاتەوە، کە چۆن خەڵکانی ئەو ناوچانە بەتاسـەوە ئەو ڕۆژنامانەیان دەخوێندەوە، کـە لـە نیۆیـۆرك و شـارەکانی دیکـەدا بـڵاو دەکرانەوە و بەو پەڕی حەز و ئارەزووەوە باسیان لەو گۆڕانکاریە هەنوکەییانەی ئـەوروپا دەکـرد. ((تۆکۆیل)) گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە شێوازی ژیانی ئەم خەڵکانە، زۆر زۆر سادە و کاتی بووە و بەسـوود وەرگرتن لە کەلەپوری فەرهەنگی ئەوروپا، لە ماوەیەکی کـورت دا، توانیویانـە ئـەو دارستانە چڕ و پڕ وچۆڵانە بۆ ئاوەدانی شارە قەرەباڵغەکان بگۆڕن و بنەما فکریـەکانی ئـەوروپا لەو ناوچانەدا بلاّو بکەنەوە. بەووتەی ناوبرا و: ((بە ڕواڵەت ئەو شتەی کە کەسێکی پێشـەنگی گەمارۆداوە، حاڵەتی سەرەتایی و دەشتەکی خۆی پاراستووە. بەڵام کەسـێك کـە لـەم کۆڵێتـە بچوکەدا و لەنێو ئەم سروشتە وەحشیەدا دەژی، کەسێکە کە کەلەپووری هەژدە سـەدە ئەزمون و فەرهەنگی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. پۆشاکی ئەو، وەك پۆشاکی شاریەکانە، شێوازی دەربڕینیـشی وەك خەڵکی نێو شارەکان وایە. لە ڕابـردوو بـە ئاگایـە. دەربـارەی داهـاتوو بـیر دەکاتـەوە و پەیجۆرە. دەربارەی ئێستا لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ دەکات و، بەشێوەیەکی گـشتی کەسـایەتیەکی شارستانی یە کە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بـە ژیـانی نێـو دارسـتانەکان ڕازی بووە و لەگـەڵ پـەرتوکێکی پـیرۆز و تـەورێکی داربڕینـەوەو ژمارەیـەك ڕۆژنامـە چـووەتە نێـو جەرگـەی بیابانەکانەوە. باوەڕ کردن بەوەی کە فەرهەنگ بە چ خێراییـەکی سەرنج ڕێکیش لەم بیابانانـەدا بلاّو دەبێتەوە زۆر ئەستەمە. من باوەڕم بەوە نیە، کە تەنانەت لە ڕۆشنبیرترین و قـەرەباڵغترین ناوچەکانی فەڕەنسادا، وەها بزوتنەوەیەکی فکری بەهێز سەری هەڵدابێت.))

گومانیش لەوەدا نیە کە فەرهەنگی ئەوروپا لە پاراسـتنی ئەسـاسی حکومـەتی کۆمـاری ئەمریکا دا کاریگەریەکی زۆری هەبووە. شارستانیەتی ئەمریکا لە ڕاسـتی دا درێـژە پێـدەری فەرهەنگی ئەوروپایە، کەلەگەڵ پێداویـستیە کاتی و شوێنیەکاندا هەماهـەنگ کـراوە. زۆربـەی ویلایەتەکانی ڕۆژئاوا، قانونی ئەساسی ویلایەتەکانیان هاوشـێوەی قـانونی ئەسـاسی دەوڵـەتی فیدراڵی نوسیوە. گرنگـی دان بـەمافی تاکەکـەس، یەکـسانی بـە کۆمەڵایەتیـەکان و مـافی دەنگدانی گشتی و قانونی ئەساسی نوسراو، ئەو بیرۆکانەن کە کۆمەڵگـەی ئـەوروپای سـەدەی حەڤدەیەم پەروەردەی کردن و سەردەمی ڕۆشنگەری سەدەی هەژدەیـەمیش شـێوە و فـۆرمێکی منگڤیانەی بەم بیرۆکانە بەخشی. هەڵبـەت ژینگەی کراوە و بەرفراوانی کۆمەڵگـەی ئـەمریکا، هەلی ئـەزموون و پراکتیـزە کردنـی بـۆ گەشـەکردنی ئـەم بیرۆکانـە ڕەخـساند، بـەڵام تـەنها

ڕەخساندنی هەلو مەرجی لەبارو گونجا و بۆ پەروەردەکردنی ئەم بیرۆکە دیموکراتیکیانە بەس نیە. لە قۆناغە جیاجاکانی مێژوودا، چەندەها نمونەی هاوشێوەی ئەم زەویە بەرفراوان و بێ سنورە و جێگیر بوونی نەتەوە جیاوازەکان تیایاندا دەبینرێن، بەلاّم هیچ کام لەو ناوچانە، دامەزراندنی حکومەتی دیموکراسی و بلاّو بوونەوەی بیری ئازادی و مافی تاکەکانی تێدا بەخۆوە نەبینیوە. هاوکات لەگەلّ پەرەسەندنی سنورەکانی ئەمریکا ـ بەتایبەتی لە ڕووی ڕۆژئاوایدا ـ ڕووسیاش دەستی بە فراوانکردنی سنوورەکانی ڕۆژهەلاّتی ولاّتەکەی کرد و سیبریای داگیرکرد و تقریبا لە یەك کاتدا هەردوو ولاّت گەیشتە ئۆقیانوسی ئارام. جێگیر بوونی ڕووسیای تزاری لەو ناوچانەدا، هیچ جۆرە کاریگەریەکی لەسەر گۆڕانکاریە سیاسیەکان نەبوو. وەك قەزاقەکانی دەوروبەری ڕووباری ((دن)) کە وەك نەتەوەیەکی دیاری کراو لەسەدەی حەڤدەیەمدا دەرکەوتن و بەداگیرکردنی زەویەکانی دەوروبەری ئەو ناوچەیە هێشتا نەیانتوانی شوێن پێیەکی ئەوتۆ بۆ خۆیان بەدەست بهێنن ـ لەماوەیەکی زۆر کورت دا ستەمکارترین هێزی سەربازی ڕووسیایان لێ پێکهات ـ زۆر ئەستەمە بتوانین کاریگەری ژینگەی کراوە و بەرفراوان و ژیانی ئازادیخوازانەی سنور نشینی لەسەر ڕۆحی یەی ئەمانە بەدی بکەین.

ژیانی شارنشینی لە کۆمەلگەی ئەمریکادا، ئەگەر بەرگێکی دیموکراسیانەی کرا بەبەردا، ئەوا ڕەهنی بیرکردنەوەکانی سەردەمی لیبرالیزم بوو. ڕەگ و ڕیشەی ئەم بیرکردنەوانەش لە ئەورووپا و بۆچوونە فەلسەفی و سیاسیەکانی سەردەمی ڕۆشنگەریەوە سەرچاوەی دەگرت. هەلبەت سنور نشینی و بوونی سەرچاوەی سروشتی دەولەمەند و بەنرخ، هەلومەرجێکی لەباری بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سەرمایەو بەرەو پێش چوونی کۆمەلاّیەتی فەراهەم هێنا، بەلاّم ئەو شێوازەی کە گۆڕانی بەسەر کۆمەلگەدا دەهێنا، ئەو کەلەپوورە فەرهەنگی یە بوو کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاری تێدەکرد. ئسپانیەکان کە پێش کۆچبەرانی ئینگلیز گەشتنە ئەمریکا، نەیانتوانی گۆڕانێکی سیاسی و کۆمەلاّیەتی ئەوتۆ لە ئەمریکای باشوردا بەدی بهێنن.

فەرهەنگی((ئەنگلۆ ساکسۆن)) کە لە ژێر کاریگەری ڕاپەڕینی سەرمایەداری، گەشەکردنی چینی ناوەند، باوەڕ بە لێهاتوویی تاکەکەس لە چاککردنی ژیانی ماددی لەسەر بنەمای مافی ئازادی و یەکسانی کۆمەلاّیەتی، شێوازێکی دیاری کراوی وەرگرت و لەگەلّ کۆچبەرە ئینگلیزی و ئەلمانی و ئەسکەندەنافیەکاندا بۆ ئەمریکا گوازرایەوەو هۆکاری سەرەکی بوو، لە پێکهێنانی حکومەتی دیموکراسی ئەمریکادا.

تۆماس پێن

THE MISSOURI
COMPROMISE
1820-1821

(دانوستانی میسۆری) له ١٨٢٠-١٨٢١ شوێنی جوگرافی
ویلایەتە کۆیلەدارو بێ کۆیلەکان دیاری دەکات و هێلی ٣٠-٣٦ پله سنوری پەرەسەندنی
ویلایەتی دیاری دەکات

بزوتن بەرەو زەوییەکانی رۆژئاوا، ئەمریکیەکان تا کالیفۆرنیا نیشتەجێ کرد

هێلی ئاسن هۆکارێکی کاریگەر بەسەر نیشتەجێ بوونی ویلایەتەکانی رۆژئاوا

## بەشی پێنجەم:

# کۆیلایەتی و شەڕی ناوخۆ

لەساڵی ١٨٥٠ بەفراوانبوونی زەویەکانی ڕۆژئاوا ـ پاش لکاندنی ناوچەی ئۆرۆگون و واژووکردنی ڕێککەوتننامەی گوادولوپ هیدالگو ـ وولاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان زەویەکی فراوانی لە ئۆقیانوسی ئەتلەسی یەوە تا ئۆقیانووسی ئارام داگرتەوە، لەماوەی نیو سەدەدا لە سیازدە وولایەتەکەی ڕۆژهەلات وولاتێکی گەورە و بەهێز هاتە کایەوە. هەرچەندە هێشتا کانە دەولەمەندەکانی مس و یۆرانیۆم و سەرچاوە سرووشتیەکانی دیکەی ژێر زەوی و هێزی ئاوی سوودێکی ئەوتۆیان لێوەرنەگیرابوو ، بەلام لکاندنی ئەم ناوچە نوێیانە خۆی لەخۆیدا چاکترین هەلی بۆ بەکارهێنانی سەرچاوە سرووشتیەکان لەئاییندەدا دەرەخساند. لەرووی ڕێکخستنی سیاسیەوە هاوسەنگیەك لەنێو دەسەلاتی مەحەلی ویلایەتەکان و سنووری دەسەلاتی دەولەتی فیدرالی هاتە ئاراوە. پەرەسەندنی مافی سیاسی، گەشەکردنی دیموکراسی ئەمریکای لێکەوتەوە، باوەڕ بەئابووری ئازاد و سوودوەرگرتن لەشۆڕشی پیشەسازی ، کاریگەریەکی گەورەی لەسەر پێشکەوتنی هەمەلایەنەی ئابووری دروستکردو، بەکارهێنانی سیاسەتی بێلایەنانە ئەمریکای لەقەیرانە سیاسیەکانی ئەورووپا پاراست.

ئەو مەسەلە سیاسیەی کەلەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمیەمدا قسەوباسێکی زۆری لەسەرکرا، مەسەلەی بەرجەستەکردنی میللەتێکی یەکگرتوو لەویلایەتە جۆراوجۆرەکان بوو، ئەوەی کەویلایەتە یەکگرتووەکان دەبێت لەشێوەی یەکیەتیەکی خاوەن بەرژەوەندی هاوبەشدا بەرێوە ببرێت و، یان وەك دەستەیەکی ئەنجوومەنی سیاسی یەکگرتووی لێ پێك بهێنرێت. مەسەلەی کۆیلایەتیش زیاتر لەهەر هۆکارێکی دیکە زەمینەی بۆ سەرهەلدانی ململانێی نێوان دەسەلاتە مەحەلیەکان و دەسەلاتی حکومەتی فیدرالی ساز دەکرد. کۆیلە ، کرنگترین و سەرەکی ترین هێزی کارەکەی نێو ویلایەتەکانی باشووری پێك دەهێنا. لەبەرئەوەی بونیادی کۆیلایەتی لەلایەن ویلایەتەکانی باکورەوە هێرشێکی توندی کرایە سەر، مەسەلەی دەسەلاتەکانی دەولەتی مەرکەزیش هاتە پێشەوە. واتە ئایا حکومەتی مەرکەزی مافی دەست

تیوەردانی کاروباری لەویلایەتەکانی باشووردا لەڕوی مەسەلەی کۆیلایەتییەوە هەیە ، یان بەدەستووردانی خۆی، ئازادی ویلایەتەکان سنووردار دەکات. ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دوو بۆچوونە سیاسیە شەڕی ناخۆی ئەمریکای هەڵگیرساند. ئەم شەڕە چوار ساڵی تەواو ۱۸٦۱-۱۸٦٥ درێژەی کێشا. سەرکەوتنی دەوڵەتی فیدراڵ، دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی زیاتر کرد، بەرەی دانی بەئازادی کۆیلەکان و مافەکانیان دانا. ئەم سەرکەوتنە سیاسییەی حکومەتی مەرکەزی گەرەنتی دروستکردنی میللەتێکی یەکگرتووی دەکردو، هەروەها سەرەتاێکیش بوو بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشێکی گەورەی ئابووری، کەئەمریکای وەك یەکێك لەگەرەترین وڵاتە پیشەسازیەکانی جیهان ناساند.

زۆربەی ئەو ئەوروپیانەی کەلەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا بەرەو ئەمریکا سەفەریان دەکرد، لەگەڵ هەموو ئەو خەسڵەتە پۆزەتیڤانەی کەلەڕووی حوکمڕانی لەنێو ڕێکخراوە ئیداری و کۆمەڵایەتیەکانی ئەمریکادا دەیانبینی، بەڵام هەر نەیاندەتوانی چاویان لەئاست ئەو جیاوازیە کۆمەڵایەتیەی نێوان هەردو ئەژادی ڕەش و سپی و سیتەمی کۆیلایەتی ئەو وڵاتەدا داخەن. ((تۆکۆیل))، لەبەناوبانگترین بەرهەمیدا کەلەسەر کۆمەڵگە و حکومەتی ئەمریکا نوسیویەتی، کۆیلایەتی بەگەورەترین گرفتی کۆمەڵایەتی ئەمریکا پێناسە کردوە. ((جۆن ستیوارت میل))، ئاماژە بەو دژیەکیەی کۆمەڵگەی ئەمریکا دەکات، کە ئەو وڵاتە لەکاتێکدا کەبانگەشەی ئەوە دەکات، کەبوونیادە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی لەسەر بنچینەی یەکسانی بونیاد نراوە ، کەچی بەپاراستنی سیتەمی کۆیلایەتی و کەلەپچەکردنی ڕەشەکان ئەو بنەمایە پێشێل دەکات.

پێشینەی کۆیلایەتی ڕەشەکان بۆسەدەی کۆچنشینی و دەسەڵاتی ئەو کاتەی ئینگلیز لەئەمریکادا دەگەڕێتەوە. لەداگیرکەکانی ئینگلیزدا، هێزی کاری پێویست لەبەر دەستدا نەبوو و، کرێکاریش زۆر کەم دەست دەکەوت. کۆمپانیا بازرگانیەکانی ئینگلیز کە بەڕێوەبردنی داگیرگەکانیان لەئەستۆدابوو، تەنها ڕێگا چارەیان لەوەدا دەبینی کەژمارەیەك لەخەڵکی هەژاری وڵاتەکەیان ڕەوانەی ئەمریکا بکەن و، لەبەرامبەر چەند ساڵ ئیشی بەردەوامدا، پارچە زەویەکی بەپیتی کشتووکاڵی لەگەڵ تۆوی کشتوکاڵی و پێداویستە سەرەکیەکانی زەراعەت کردنیان بۆ دابین دەکردن ، تاوەکو بتوانن وەك کرێکارێکی ئازاد لەو زەویانەی خۆیان ئیش بکەن و ببنە یەکێك لە وورده سەرمایەدارەکانی ئەم ناوچەیە. ئەم بڕیارە لەسەر زۆرێك لەخەڵکە بێ دەرەتانەکانی ئینگلتەرا، هەر لەتاوانبارانی سیاسی و لات و لوت و ئاوارەکانەوە

تاوەکو کرێکار و جووتیارە بێ سەرمایەکان جێبەجێ کراوە و ، وەك هێزێکی گرنگی کاریگەر لەچاندنی توتندا سوودیان لێوەرگیرا. خزمەتکارە سپی پێستەکانیش، بەپێی ڕێککەوتنێك بۆماوەیەکی دیاریکراو نیشیان دەکرد و لەڕووی یاساییەوە بەفێرکار دەژمێران و دەیانتوانی سکاڵا پێشکەش بەدادگا بکەن و، بەکۆتای هاتنی ماوەی ڕێککەوتنەکە، ئازادیە دانپێدا نراوەکەی خۆیان بەدەست دەهێنا.

یەکەمین دەستەی ڕەشپێستەکان کەهاتنە ناو کۆچنشینەکانەوە، لەڕووی یاساییەوە بەخزمەتکار دادەنران، بەڵام لەبەر ئەوەی بەحەز و خواستی خۆیان نەهاتبوون و، لەکەنارەکانی ئەفریقیاوە لەلایەن چەت دەریاییەکانەوە دەست بەسەر دەکران و بەکەلەپچەکراوی دەهێنرانە ناو خاکی ئەمریکا، نەیانتدەتوانی مافی خاوەنداریەتی خۆیان بەشێوەیەکی یاسیی بەدەست بهێنن و یان پاش کۆتایی هاتنی ماوەی بۆندەکە، وەك کرێکارانی سپی پێست، بەئازادی ببنە خاوەنی زەوی و تیایدا نیش بکەن.

بۆیەکەمین جار لەساڵی ١٦١٩، لەلایەن کەشتیەکی هۆڵەندییەوە، بیست ڕش پێست هێنرانە ئەمریکا، بەڵام هیچ گرفتێکی نەژادی لەو کاتانەدا نەهاتە ئاراوە. بەدرێژایی پەنجا یان شەست ساڵی سەرەتا ، نیشتەجێکردنی کۆچ نشینەکان، هاتنی ڕەشەکان زۆر لەسەرخۆ ئەنجام دەدرا و هێزی کاری پێویست زیاتر لەکرێکارە سپی پێستەکان دابین دەکرا ، کەبەپێی بۆندی نێوان کرێکار و خاوەن کار لەناوچە کشتوکاڵیەکاندا نیشیان دەکرد و پاش تەواوبونی خزمەتەکەیان وەك کرێکارێکی ئازادیان لێدەهات. لەکۆتایەکانی سەدەی حەڤدەیەمدا هاتنە ناوەوەی ڕەشەکان بەرە بەرە زیادی دەکرد. ڕێژەی دانیشتوانی ڕەشپێستی ڤێرجینیا، کەلەو ڕۆژگارەدا گەورەترین و بەناوبانگترین داگیرگەی ئینگلیز بوو ، لەئەمریکا و ، مەڵبەندی سەرەکی کشتوکاڵی توتن بوو، گەیشتە نزیکەی لە ٥٠٪ی تێکڕای دانیشتوان.

کۆچ نشینەکان لەسەرەتای جێگیر بوونیاندا دژی کۆیلایەتی بوون و چەند یاسێکی جۆراوجۆریشیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم سیستەمە لەڤێرجینیا و ماساچۆسێت دا دەرکردبوو.

ئەوان بەشێوەیەکی گشتی کۆیلایەتیان بەپێچەوانەی بنەما مەزهەبی و ئەخلاقیەکان دەزانی، لەم پێناوەشدا کۆمەڵە یاسایەکیان بۆ ڕێگەگرتن لەبەکارهێنانی کۆیلە لەکۆچ نشیندا دەرکرد. بەڵام بازرگانە ئینگلیزیەکان تەنها بیریان لەبەرژەوەندیەکانی خۆیان دەکردەوە و دەرباری ئینگلیزیش ، پشتیوانی خۆی بۆ ئەم بازرگانانە و پەرەسەندنی بەرژەوەندیەکانیان لەداگیرگەکاندا ڕاگەیاند، وردە وردە کەچاندنی توتن پەرەی سەندو سوود و قازانجێکی زۆری

بژنابووری داگیرگەکان لێکەوتەوە، خاوەن زەویە کشتوکاڵیەکان لەکۆچ نشینەکانی ڤیرجینیا، مری لەند، کارۆلینا و ناوچەکانی دیکەی باشور پێشوازیەکی گەرمیان لەبازرگانی کۆیلە کرد و پەرەیان پێدا.

هەموو ئەو رەش پێستانەی کە دەهێنرانە ئەمریکا، سەر بەیەك هۆز و خێڵێکی دیاریکراو نەبوون و بەزمانی جۆراوجۆر قسەیان دەکرد، بەڵام بەگشتی لەکەنارەکانی رۆژاوای ئەفریقاوە کۆکرابوونەوە و بەکۆت کراوی هێنرابوونە خاکی ئەمریکا. خەڵکی کەنارەکانی ئەفریقای رۆژئاوا ، شارەزاییەکی باشیان لەکشتوکاڵدا هەبوو و ، هەندێك لەخێڵە بەناوبانگەکانیشیان وەك داهوومی، ئاشانتی و، یۆروبا، جگە لەرووی کشتوکاڵیەوە ئەزموونێکی باشیشیان لەئاڵوگۆڕی بازرگانی و هەندێك پیشەی دیکەدا پەیدا کردبوو.

هەندێکیشیان وەك نەتەوەی یۆروبا، لەگەڵ فەرهەنگی ئیسلامیدا ئاشنا بوون و لەژێر کاریگەری ئیسلامدا، بەبنەماکانی هاوڵاتی بوون و شارستانیەتەوە خۆیان گرتبوو.

دابین کردنی کۆیلە کارێکی ئاسان نەبوو هەروەها بازرگان و کەشتیوان و هەموو ئەو کەسانەی کەلەم بازرگانیە پڕ سوود و قازانجەدا بەشداریان دەکرد، لەپێناو ئامانجەکەی خۆیاندا هەموو جۆرە رێ و شوێنێکیان بۆ وەرگرتنەوەی کاڵاکانیان دەگرتەبەر. زۆرجار یان لەرێگەی خەڵەتاندنی سەرۆك خێڵەکانەوە، لەبەرامبەر مادده بێهۆشکەرەکان، چنراوە خۆش نەخش و نیگار و ، کەرەستەکانی رازاندنەوەی هەرزان ، ئەم ئاڵوگۆڕەیان ئەنجام دەدا و یان بەرفاندنی رەشەکان و بەکارهێنانی زەبر و زەنگ ئەوانیان بەرەو کۆیلایەتی پەلکێش دەکرد.

ئامانجی سەرەکی لەم نێوانەدا ، ئەو سوود و قازانجە زۆرەبوو کەلەرێگای بەکارهێنانی کۆیلەکان لەبواری کشتوکاڵ، دەرهێنانی کانەکان و ، بەرهەمهێنان لەهەموو بوارەکاندا دەستی خاوەنەکانیان دەکەوت و بازرگانەکان، کۆیلەیان لەبەرامبەر ئەو رەواجە گەورەیەی کەلەبازاڕدا هەیبوو بۆزیادکردنی دەرامەت بەکار دەهێنا.

بەم شێوەیە رەشەکان بۆ مەبەستی ئیشکردن لەزەویە کشتوکاڵیەکانی باشوور ، بەرەو ویلایەتەکان گوازرانەوە. بەڵام تاکۆتاییەکانی سەدەی هەڤدەیەم بەهۆی نەبوونی پێویستی لایەنی ئابووری سوودێکی ئەو تۆیان لێوەر نەدەگیرا و ژمارەشیان زۆر کەم بوو. لەو هۆکارانەی کە رەشەکان بەرەو کۆیلایەتی رادەکێشا و پۆشاکی خزمەت کاریشی لێ سەندنەوە ، لەلایەکەوە مەسەلەی کەمی کرێکاری سپی پێست و لەلایەکی تریشەوە رەونەقی جیهانی بازاڕی توتن و گرنگیدان بوو بەم بەروبومە. هەرچەندە ئەگەری شۆڕشیش لەلایەن کرێکارە سپیەکانەوە

هۆکارێکی دیکە بوو. لەساڵی١٦٧٦ ڕاپەڕینی گشتی کرێکارەکان دژ بەحکومەتی ڤێرجینیا، کەبەناوی سەرکردەکەیەوە ، بەیاخی بوونی ((بیکن))ناوبانگی دەرکرد، ترسی کاربەدەستانی ڤێرجینیا لەیاخی بوونی ئەو سپی پێستە ئینگلیزیانەی کە هەمیشە مایەی دەردی سەری ناوچەکە بوون زیاتر کرد و ئەو بیرۆکەیەی لەلا درووستکردن ، تا بەسوود وەرگرتن و بەکارهێنانی سیستەمی کۆیلایەتی شوێن پێی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆیان بەهێزتر بکەن. پێویست ئەوەش لەبیر نەکەین ، کاتێك کەئاماژە بەڤێرجینیا دەکرێت ، بەهیچ جۆرێك مەبەستمان ئەو ویلایەتە بچووکەی ئێستا نیە. لەو ڕۆژگارەدا ڤێرجینیا بەفراوانترین و قەرەباڵغترینی کۆچ نشینەکان دەژمێررا و نەتەنها ڤێرجینیای ڕۆژئاوای ئەمرۆ ، بەڵکو ناوچە بەرفراوانەکەی باکووری ڕۆژئاوایش بەشێك بوو لەو کۆچ نشینە. لەئەنجامدا زنجیرە یاسایەك لەلایەن ئەنجوومەنی ڤێرجینیاوە دەرکرا ، کەبەرەسمی دانی بەکۆیلایەتی ڕەشکاندا نا. یەکێك لەو یاسایانە ئەوەبوو کەمنداڵی کۆیلە شوێنکەوتووی ئەو بارودۆخە دەبێت کەدایکی تیایدا ژیاوە، مەگەر لەحاڵەتێکدا کە بەهۆی باوکێکی سپی پێستەوە چاوی بەدنیا هەڵهێنابێت. جگە لەوەش کۆیلەکان لەنێو سنووری کۆچنشینەکاندا، بەبەشێك لەدارایی و ژێردەستەیی دەستەڵاتدارانی ناوچەکە دەژمێرران و خاوەنەکانیان دەیانتوانی ژمارەی کۆیلەکانیان وەکو کەرەستە و بەرووبومەکانی دیکە لەنێو دەفتەری حیسابەکەیاندا بنووسن.

هەرئەندازەکە بازرگانی کۆیلە سوود و قازانجی زیاتری لێ دەکەوتەوە، ژمارەی ڕەشەکانیش کەمی دەکرد. لەسەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمەوە، وورده وورده مافی خاوەنداریەتی و بەدەست هێنانی زەوی، گواستنەوەی چەك و بەشداریکردن لەشەڕ لەڕەش پێستەکان سەندرایەوە. هاوسەرگیری نێوان دوو نەژادی ڕەش و سپی مەنعی یاسایی کرا و ڕەشەکان لەمافی شکات کردن لەدادگاکان و شکایەتی دانیش بێ بەشکران. چەند یاسایەك هاوشێوەی یاساکانی ڤێرجینیا لەدژی ڕەشەکان و لەپێناو بەهێزکردنی سیستەمی کۆیلایەتی لەزۆربەی کۆچنشینەکاندا جێبەجێ کران و سزایەکی سەخت و دژوار بەمەبەستی تەمێ کردن و پەند وەرگرتنیان دەستنیشان کرا. ڕەنگی دەم و چاو و تایبەتمەندیە نەژادیەکان، تائەو ئەوپەڕی ڕاددەی ژێر دەستەیی و کۆیلایەتی پەرەی سەند. ((تۆکۆیل)) جیاوازی نەژاد، بەهۆکاری سەرەکی مانەوەی کۆیلایەتی لەئەمریکادا دەزانێت. بیری پایە بەرزی سپی پێستی ئەورووپی و ئاغایەتی و حاکم بوون ـ کۆیلایەتی لەگەڵ تایبەتمەندیە نەژادیەکاندا ئاوێتە کرد. جیاوازی نەژادی و ڕەنگی دەم و چاو ئەم کۆیلانەی لەکۆیلەکانی دونیای کۆن جیاکردەوە. لەم سەردەمەدا

کۆیلەکان سەر بەنەژادی خاوەنەکانیان بوون و پەروەردە و ئاستی رۆشنبیریشیان بۆ پلە و پایەی ئاغاکانیان دەگەڕایەوە. تەنها جیاوازی نێوانیان ئازادی بوو، کاتێك کۆیلەیەك ئازاد دەکرا بەناسانی دەیتوانی بچێتە ناو کۆمەڵگەوە. بەسەرهەڵدانی مەسیحیەت و رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆم، ئازادی کۆیلەکان گشتێنرا و بنچینەی کۆیلایەتی بن و بارگەی خۆی پێچایەوە.

بەڵام بەگۆڕانی سەرمایەداری، درووستبوونی بازارە جیهانیەکان و قەیرانی دەستی ئیشکەر، جۆرێکی نوێ لەسیستەمی کۆیلەداری لەقارەی ئەمریکادا سەری هەڵدا. پێویستی داگیرگەکانی دونیای کۆن، سەرنجی بازرگانە ئەوروپیەکانی بۆ قارەی ئەفریقا راکێشا، تاوەکو لەرێگەی کۆتکردنی رەشەکانەوە هێزی کاری دونیای نوێ دابین بکەن. چەسپاندنی سیستەمی کۆیلەداری لەکیشوەری ئەمریکا، لەهەمان پێویستی سەرمایەداری و گۆڕانی بازرگانی نوێوە سەرچاوەی دەگرت.

گۆڕانی سەرمایەداری و مەبەستی سوود و قازانج لەدونیای رۆژئاوا، رەشەکانی بەرەو کۆیلایەتی پەلکێشکرد و سیستەمی باوك سالاری بەسەر پەیوەندیەکانی ئاغا و کۆیلەدا سەپاند. بەپێچەوانەی ئاغا و غایبەکانی ئەمریکای مەرکەزی ،کەزۆربەیان ئیسپانی بوون، لەکۆچ نشینەکانی باشوری داگیرگەکانی ئینگلیز لەئەمریکا، خاوەن زەویەکان لەناوچە فراوانەکانی خۆیاندا دەژیان و راستەوخۆ چاودێری ئیش و کاردکانی کۆیلەکانیان دەکرد و ، پاش راگەیاندنی قەدەغەکردنی فرۆشتنی کۆیلە لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، چاودێریەکەیان چڕتر کردەوە. لەئەنجامداو لەکۆی ئەو چوار سەد هەزار رەش پێستەی کەبەناوی کۆیلەوە لەئەفریقاوە هێنرانە ئەمریکا ـ لەساڵی١٨٦٠ و دەستپێکردنی شەری ناوخۆ ـ ئەوەیەکی بەرچاو لەکۆیلەکان کەزیاتر لە چوار ملیۆن رەش پێستی ئەمریکی دەبوون سەری هەڵدا. کۆمەڵگەی باوك سالاری باشوور ، بەپاراستنی مەودای نەژادپەرستی و چینایەتی و لەسەر بنەمای پێشگیری و پارێزگاری کردن لەکۆیلەکان لەبەرامبەر سوود و قازانج، پەیوەندیەکی دیاریکراوی لەنێوان سەرکەوتو و ژێرکەوتودا بەرقەرار کرد، کەلەبنچینەدا واتای تەسلیم بوون و کوێرایەڵی کردنی بێ کسپ و تەگەرەی لەبەرامبەر خاوەن سەرمایەکاندان دەگەیاند.

جیاوازی نەژاد ، رەنگی دەم و چاو و پێویستی بەهێزی کاری رەشەکان، جیاوازی و نامۆبونێکی کۆمەڵایەتی گەورەی لێکەوتەوە و ، ئەوانی لەئاستێکی پەست تری کۆمەڵگەدا جێگیر کرد. هەرچەندە لەسەردەمی سەربەخۆیدا رابەرانی ئەمریکا دەرکیان بەم گرفتە گەورەیە

کردبوو و ، ((واشنگتۆن))یش بڕیاری ئازادکردنی کۆیلەکانی دەرکرد. بەڵام ئەو کاتە لەبەر بەرژەوەندی سیاسی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ویلایەتەکانی باشوور لەنوسینەوەی قانوونی ئەساسیدا، مەسەلەی ئازادی کۆیلەکان بەتەواوەتی پشت گوێ خرا. ((جفرسۆن)) لەبیرەوەریەکانی خۆیدا نوسیویەتی :((هیچ شتێك بەنرختر و بەرزتر لە ئازادی ڕەشەکان نیە. لەم حاڵەتەشدا شتێکی براوەیە کەئەم دوو نەژادە بەشێوەیەکی ئازاد ناتوانن پێکەوە لەژێر سەرپەرشتی یەك حکومەتی یەکگرتوودا بژین. سرووشت، بیروباوەڕ و داب و نەریتەکان، بەربەستێکی کارتێنەکراوی لەنێوانیاندا درووست کردووە.))

((مدیسۆن))یش لەنامەیەکدا بۆ ((لافایت)) نوسیویەتی، کەئاماژەکردن بەکۆیلایەتی لەنێو ئەنجوومەنی ویلایەتەکاندا و لەکاتی نوسینەوەی قانونی ئەساسیدا ((وەك پزیسکێك وابووە لەنێو ئەنبارێکی بارووتدا.)) پاراستنی سیستەمی کۆیلایەتی و پشتگوێ خستنی ئەم گرفتە کۆمەڵایەتیە ، لەڕاستیدا بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ویلایەتەکانی باشوور بەکارێکی زەروور پێویست دەژمێررا و تەنها ڕێگایەکی پاراستنی یەکیەتی و یەکڕیزی بوو. قانونی ئەساسی قەوارەیەکی جوداگانە و دەسەڵاتێکی کەورەی بەحکومەتی فیدراڵی بەخشی و ئەو مافەشی پێدا کەبەناوی میللەتەوە فەرمان دەربکات و پراکتیکیان بکات و ، بشتوانێت لەبەرامبەر دوژمنی هاوبەشدا سەرکردایەتی سوپایەکی میللی بکات. حکومەتی ویلایەتەکان پاش ئەوەی یەکیەتیەکەیان بەناوی خۆیان دامەزراند، مافی بەدواداچونی ئەو بابەتانەی کە پەیوەندیان بەحکومەتە مەحەلیەکانەوە هەبوو بۆخۆیان پاراست و مافی دیاریکردنی پێگەی سیاسی و شارستانی تاکەکان و ڕێکخستنی پەیوەندی تاکەکان لەگەڵ یەکتردا و مافی دادوەری و بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەو مافانەی کەپەیوەندیان بەگشتەوە هەبوو بەڵام پێویستی نەدەکرد کە حەتمەن بخرێتە ئەستۆی حکومەتی مەرکەزیەوە تایبەتکرد بەخۆیانەوە. مەسەلەی کۆیلایەتی لەڕووی ئابووریەوە بۆ ویلایەتەکانی باشوور بایەخێکی زۆر زۆری هەبوو و، وەك مەسەلەیەکی مەحەلی لێك درایەوە و درایە دەست خوودی ویلایەتەکان.

ڕاپەڕینە ئازادی خوازەکان کەلە ئینگلتەرا بە ئازادی بڵاوکراوەکان و چاکسازی پەرلەمان کۆتایی هات و، یان لەئەمریکا یاخی بوونی دژ بە ئینگلیزی لێکەوتەوە و لەفەرەنسا بوو بەهۆی سەرهەڵدانی شۆڕش، نەیاندەتوانی لەبەرامبەر مەسەلەی کۆیلایەتیدا دەستەوسان بوەستن. پاش شۆڕشی فەرەنسا، کۆیلەداری لەهەموو داگیرگەکانی سەر بەفەرەنسادا، لەساڵی١٧٩٤ لەغو کراو لەساڵی١٨٠٨ پەرلەمانی ئینگلتەرا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی

بازرگانی کۆیلەی بەرەسمی ڕاگەیاند. هەر لەم کاتەدا لەئەمریکا لەنێوان بەرژەوەندی ویلایەتەکانی باکور و بەرژەوەندی کۆیلەداری باشووردا دانوسانێك کرا، بەو واتایەی کەبازرگانی کۆیلە لەو ویلایەتیانەی کەسیستەمی کۆیلایەتیان تێدا باو نەبوو، قەدەغەکراو بەردەوامبوونیشی لە ناچەکانی باشوور تایبەت سالی تر زەمانەت کرا. لەویلایەتەکانی باکووردا، پەیرەوکردنی ئەم سیستەمە لەڕوی ئابووریەوە بێ سوود و قازانج بوو، لەبەر ئەوە وورده وورده بەتالکرایەوە و لەویلایەتەکانی باشووریش ئەم بیرۆکەیە گەشەی کرد، کەکۆیلەداری لەڕووی ئابووری و کۆمەلایەتیەوە بەردەوام نابێت. توتن وەك بەرووبومێکی سەرەکی باشووریەکان، کە درووستبونی ئەو هەموو زەویە کشتوکالیە فراوانە و زیاد بوونی کۆیلەکانی لێکەوتبویەوە، لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، بازاڕە پڕ ڕەونەق و گەرمەکەی خۆی لەدەست داو لەئەنجامدا بازرگانی کۆیلە بایەخەکەی جارانی نەما و ئەم بیرۆکەیە گەشەی کرد، کەسیستەمی کۆیلەداری هێدی هێدی لەویلایەتەکانی باشووردا بن و بارگەی خۆی دەپێچێتەوە.

دووگۆڕانکاری گەورە لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، ووزە و تینێکی زیاتری بەبازرگانی کۆیلە بەخشییەوە و دووبارە بازاڕەکەی بوژاندەوە، یەکێك لەم گۆڕانکاریانە دەرئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی ئینگلتەرا بوو، کارگەکانی ڕستن و چنینی خستە گەڕ و پێویستی بازاڕەکانی جیهانی بۆ بەرهەمی لۆکە زیاتر کرد. گۆڕانکاریەکی دیکە درووستکردنی ئامێرێکی نوێ بوو، کە بەئاسانی ناوکی پەمووەکەی لە قۆزاغەکەی جیادەکردەوە و بووە هۆکارێکی سەرەکی لەپەرەسەندنی بەرهەم هێنانی لۆکە لەئەمریکادا ـ بەرووبومێك کەڕاستەوخۆ پشتی بەهێزی کاری کۆیلەکان دەبەست. ئەم ئامێرە نوێیە لەلایەن ((ئیلی ڤێتنی))یەوە کەیەکێك بوو لەدانیشتوانی ناوچەی (کانکتیکت) و دەرچووی زانکۆی ییل، دروستکراو بەخێرایی لەسەرتاسەری ناوچەکانی باشووردا بلاوبویەوە. چاندنی توتن کەلەبازاڕە جیهانیەکاندا فەشەلی هێناو، شوێنی خۆی بۆ بەرهەمهێنانی لۆکە چۆل کرد و کۆیلایەتی دووبارە ڕەواجەکەی جارانی پەیداکردەوە. ئەو ویلایەتانەش کەڕاستەوخۆ چاندنی لۆکەیان تێدا ئەنجام نەدەدرا، بەفرۆشتنی کۆیلەکانیان ئاهەنگی بەشداری کردنیان لەم بازرگانیەدا گێڕا. جگە لەپەموو، چاندنی قامیشی شەکر، برنج، کەتان و توتنیش لەزەویە کشتوکالیەکانی باشووردا پەرەی سەند. بەرووبومی کشتوکالی ویلایەتەکانی باشوور بەهێزی کاری ڕەشەکانەوە بەسترا بوو. زۆربەی سپی پێستەکانی ویلایەتەکانی باشوور، جووتیار و وورده سەرمایەداربوون، بەتەنهایی ئیشیان دەکرد یان یەك دوو کۆیلەیان بۆ خۆیان کڕیبوو. زەویە کشتوکالیە فراوان و بەپیتەکان لەژێر دەستی

چەند بنەماڵەیەکی دەوڵەمەنددا بوون، کەبەکڕینی سەدان کۆیلە بەروبوومی کشتوکاڵی باشووریان بۆ خۆیان مۆنۆپۆل کردبوو. لەسەرتا سەری ویلایەتەکانی باشووردا تەنها چواردە سەرمایەداری سەرەکی هەبوون کە زیاتر لە پێنج سەد کۆیلەیان هەبوو. ژمارەیەکی دیکەیان نزیکەی سەد کۆیلە ئیشی بۆدەکردن، ئەم کۆمەڵە سەرمایەدارە زیاتر لە سێ لەسەر چواری تێکڕای کۆیلەکانیان لەلای خۆیان کۆکردبوویەوە و، زەویە کشتوکاڵیەکانیان لەپێناو بەرهەمهێنانی بازاڕە جیهانیەکاندا ئامادە کرد.

بەردەوامبوونی ژیانی ئابووری باشوور بەبێ پشت بەستن بە سیتەمی کۆیلەداری مومکن نەبوو، لەهەمان کاتیشدا پاراستنی ئەم سیستەمە هۆکاری سەرەکی دواکەوتویی ویلایەتەکانی باشوور بوو. خاوەن زەویە کشتوکاڵیەکان بەپشت بەستن بەبووژەی کۆیلەکان پێویستی بازاڕە جیهانیەکانیان لەبەروبوومەکانی وەك پەموو، شەکر، کەتان، برنج، توتن و بەردی بەنرخ پڕدەکردەوە و لەبەرامبەریشدا هەموو پێویستی و ئامێرەکانی خۆیان لەڕێگەی ئینگلیز و بازاڕە ئەوروپیەکانی دیکەوە دابین دەکرد. بەرژەوەندیە بەدەستهاتوەکان لەبەروبوومی ناردەنی، کۆسپێکی گەرەی لەبەردەم هەرجۆرە سەرمایە گوزارییەك لەپێناو چاککردنی بارودۆخی کشتوکاڵی، بەکارهێنانی ئامرازی چاکتر، دامەزراندنی کارگە و ئامێرە پیشەسازیەکانی دیکەدا درووست کردبوو. ڕەنگدانەوەیەك لەسیستەمی سەرمایەداری، وەك بانکداری، بەکارهێنانی قەرز و متمانە لەباشووردا سەری هەڵدا بوو، بەڵام ئەم ئیمکاناتانە لەژێر دەسەڵاتی سەرمایەدارە گەورەکاندا چڕبووبوونەوە و بۆبەرژەوەندی تایبەتی و ئامانجی خۆیان بەکار دەهێنران، لەئەنجامدا، سەرمایەداری بەو شێوەیەی کە لەویلایەتەکانی باکوور و ڕۆژئاوا گەشەی کرد، لەباشووردا ئەو هەلەی بۆ ئەڕەخساو سووربون لەسەر پاراستنی سیستەمی کۆیلەداری، فەنابوونی ئابووری وڵاتی بەدوادا هات.

جگە لەو سوود و قازانجە زۆرەی کەسیستەمی کۆیلەداری بۆ ژمارەیەکی کەمی سەرمایەدارەکانی باشوور دەستە بەریکرد، پشتیوانیکردنی زۆرینەی کۆمەڵگەی سپی پێستی هەژار و کەم دەرامەت بۆ پاراستن و بەردەوامبوونی کۆیلەداری، هیچ پاساو ئابووریانەی نیە. ئەم چینەی کۆمەڵگە هیچ سوودێکیان لەم بارودۆخە نەدەبینی. ئەوەی ئەمانی بۆ پشتیوانی کردن لەسەرمایەدارەکانی باشوور ناچار دەکرد، هەستی نەژاد پەرستی بوو. بەرژەوەندی ئابوری بوو بە هۆکاری سەرەکی جێگیر بوونی کۆیلایەتی و بیرکردنەوەی نەژاد پەرستیانەش هۆکاری پاراستنی. بەدرێژایی ساڵانێکی دوور و درێژ سپی پێستە هەژارەکان بەهۆی تەلقیناتی

سەرمایەدارەکانی باشوورەوە، باوەڕیان وابوو کە نەژادی ڕەش پەستترە لەنەژادی سپی، ئازادکردنی دەبێتە مەترسیەکی گەورە بۆ هەڵوەشاندنەوەی خێزان و بنچینەی ژیانی کۆمەڵایەتیان. تێکەڵکردنی نەژادی دەبێتە هۆی لەناوچوونی نەژادی سپی و، یەکسانی ماف و بەها کۆمەڵایەتیەکان، سپی پێستەکان هەراسان دەکات. بەکورتی باوەڕی باشووریەکان لەسەر ئەم خەیاڵە بەتاڵەیان ڕاوەستاوە، کەڕەشەکان بەهیچ شێوەیەك ((شیاوی ئەوە نین کە لەنێوان سپی پێستەکاندا ئازاد بن.))

ئەم بیرکردنەوە کۆمەڵایەتیە بوو، کەپاش ئازادی کۆیلەکان و لەناوچوونی ئەو شێوازە پڕ سوود و قازانجەی کشتوکاڵکردن لەناوچەکانی باشوور، توند و تیژی ڕاشکاوانەی دژ بەڕەشەکان و بێ بەش کردنیان لەهەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لێکەوتەوە. لەویلایەتەکانی باکوریش هەمان دەمارگیری نەژادی هۆکاری بێ بەشکردنی ڕەشەکان بوو لەزۆربەی مافە کۆمەڵایەتیەکانیان.

لە هزری کۆمەڵگەی سپی پێستدا، وێنەی ڕەش لەگەڵ کۆیلەبوندا یەکیان گرتبوویەوە. ئەو کۆچبەرانەی کە لە هەموو نەتەوە جیاوازەکانەوە ڕویان لە ئەمریکا کرد، بە ئارەزوو و خواستی خۆیان و لەپێناو گەشتن بە ژیانێکی چاکترو بارودۆخێکی ئابووری لەبارتردا نیشتمانەکەی خۆیان واز لێ هێناو ڕەنجی غەریبیان بەگیان کڕی و هیچ کاتێکیش وەك ڕەشەکان بە ژیانی نێو زیندان تاوانبار نەکران و، ووردە ووردە شوێن و پلەو پایەێکیان لە کۆمەڵگەی سپی پێستی((ئەنگلۆ ئەمریکەن))دا بۆ خۆیان دۆزیەوە. ڕەشەکان زیاتر لە سەدەو نیوێك، بەردەمی لە ژێر ستەمی کۆیلایەتیدا ژیان و لە هەموو مافە کۆمەڵایەتیەکان بێ بەش بوون و پاش ئازاد بونیشیان نەیان توانی تێکەڵ بە سپی پێستەکان بن و وەك خەڵکانی دیکە لە کۆمەڵگەی ئەمریکیدا ژیان بەسەر بەرن .

هەندێك لە مێژوونوس و کۆمەڵناسان بۆ پاساو هێنانەوەی کۆیلایەتی جەختیان لەسەر ئەوە کردووەتەوە، کەکۆیلەکان بەو بارودۆخەی کەتێیدا دەژیان ڕازی بوون و نەبوونی شۆڕش و یاخی بوون لە لایەن ڕەشەکانەوە چاکترین بەڵگەیە لە سەر ئەم هەڵوێستەیان. هەڵبەت شۆڕشێکی وەها کە بیەوێت کۆیلایەتی لە بنەوە ڕیشە کێش بکات سەری هەڵنەدا، بەڵام ئەمە بەڵگە نیە لە سەر ڕەزامەندی ڕەشەکان لەو بارو دۆخەی کە تیایدا دەژیان. بە شێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵ خەڵکێکی کۆت و زنجیر کراو، بەهیچ شێوەیەك چاوەڕوانی شۆڕش و ڕاپەڕین نە دەکرا. سزای توندو تیژو بێ ڕەحمانە، بەدکاری ستەمی ئاغاکان و، یاسای سەخت ودژواریەکانی

ولایەتەکان دژ بە کۆیلە هەڵهاتوو یان شۆڕش گێڕەکان، هەر جۆرە جم و جوڵێکی ئازادی خوازانەی سەرکوت دەکرد. سیستەمی باوك سالاری و سەر پەرشتیاری، کەخاوەن مولکەکان لە پەیوەندیان لەگەڵ ڕەشەکاندا بە کاریان دەهێنا، پەیوەندیەکی تایبەتی لەنێوان ئاغاو کۆیلەدا دروست کردبوو ـ هەمان پەیوەندی کە لە کۆمەڵگەی فیودالی سەدەکانی ناوەڕستدا ئاغای بە باوك و پشتیوانی ژێر دەستەکانی ناو زەد دەکرد. زۆربەی ئەو کۆیلانەی کە لە کۆشکی ئاغاکانیاندا خزمەتیان دەکرد، بەو هەموو ترس و لەرزەی هەیان بوو، بەلاّم هەر بەرامبەر بەخاوەنەکانیان وەفاداربوون و ئەوانیان لە هەر جۆرە پیلان و شۆڕشێك ئاگادار دەکردەوە. ئەوانەشیان کە هەر بە کۆیلەیی[لە ژێر تارمایی] ئەم سیستەمەدا لەدایك بووبوون، بیریان لە بارو دۆخ و ژیانێکی دیکە نەدەکردەوە و، نەبوونی هۆشیاری کۆمەلاّیەتی، ئەگەری سەرکەوتن و شۆڕش جەماوەری لاوازتر و ڕاپەڕینە پەرش و بلاّوەکانیشی بێ ئاکام دەکرد. تێکڕای ئەم هۆکارانە کاریگەریکی زۆریان لەسەر دامرکانەوەی هەموو ئەو نارەزایانە هەبوو، کە دژ بەکۆیلایەتی و چەوسانەوە ئەنجام دەدران ، بەلاّم هیچ کات واتای ڕازی بوونی ڕەشەکانی لەو بارودۆخەی کەبەزۆر بەسەریاندا سەپێنراوە، نەدەگەیاند. ئاوازی ڕەشەکان و گۆرانیەکانیان چیرۆکی غەم پەژارە و کاریگەری قوڵ و برینی سەختی ئەوانی دەگێڕایەوە. هەرکات هەلێکی گونجاویان بۆ بڕەخسایە، هەڵ هاتن و دەرباز بوونیان لەو حاڵ و گوزەرانە بەو هەموو کرفتانەی کە ڕیەڕوویان دەبوویەوە بەدڵ بەگیان دەکڕی.

ستایش و باوەڕ بە لێهاتووی تاکەکەس، کەلەبیرکردنەوەی پرۆتستاندا گرنگیەکی زۆری پێدراوە، هۆکاری سەردکی پێشکەوتنی ئابوری سپی پێستەکان بوو و، بە نیسبەت ڕەشەکانەوە بە تەواوەتی پشت گوێ خرا. ڕش پێستی بێچارە بەشێوەیەك تەلّقین دەکرا کە مرۆڤێکی تەمەڵ، بێکارە، بێ هۆش و نەزانەو جگە لە ئیش کردنی جەستەی چاوەڕوانی هیچی لێناکرێ. فێرکردنی پەروەردەکردن و پیشەو هونەر بۆ ئەوان قەدەغە بوو. چونکە فێرکردن و هۆشیارکردنەوەی کۆمەلاّیەتی ڕەشەکان یەکسان بوو بە شۆڕش و هەستانەوەیان. یاساکانی نێو ولایەتەکان هەموو جۆرە دەرفەتێکی بەرەو پێش چونیان لە ڕەشەکان سەندەوە. سپی پێستەکان باوەڕیان وابوو کە ڕەشەکان لە ڕوی ئاستی ئاوەز و هۆشیریانەوە تەمەڵ و بێ توانان. جیاوازی ڕواڵەتی نێوان هەردوو نەژاد بەڕاستی بەڵگەیە لە سەر عەقڵ و بیرکردنەوایان. سووربون لەسەر بەرزی پلەی نەژادی سپی، باوەڕ بەپەستی فکری و مرۆیی ڕەشەکانی بەهێزتر کرد. ئەم بیرکردنەوانە، تەنها پیشانی دەدا کە بەرژەوەندیە ئابوریەکان هەندێك جار تا چ

ڕادەیەك بنچینەی مرۆڤەکان لە داواکاریەکانی عەقڵی سەلیم دورر دەخاتەوەو لە شانازی و بونیادی مرۆڤایەتی بەری دەکات.

دام و دەزگاکانی کۆیلەداری لە باشوردا کاریگەریەکی قوڵیان لەسەر سیستەمی کۆمەلایەتی ئەو ویلایەتانە بەجێ هێشت. لەڕێگەی خاوەن دارێتی کۆیلەوە، چینی سنوورداری سەرمایەداری باشوور، کۆنترۆڵی سیاسی و ئابوری وولایەتەکانیان گرتبوویە دەست. نوێنەرانی کۆنگرەو لێپرسراوە ئیداریەکان بە پشت بەستن بەدەسەلاتی ئەم گرووپە هەڵ دەبژێردران، و هەمرو یاسا ولایەتیەکانیش لە باشوردا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی ئەم گرووپە دەسەلاتدارە کاریان دەکرد. کۆیلەداری، واتای سەروەتی دەگەیاند، باشوریەکان کۆیلایەتیان وەك کەلەپورێکی تایبەت بە خۆیان لێك دەدایەوەو، کۆششی سیاسەتمەدارەکانی باشوریش هەمان مەبەست بوو. هزری کۆمەلایەتی باشور، خۆی بەوەسوەسەی ترسان لە ڕەشەکانەوە سەرقاڵ کردبوو . باشوور بە وەها سەنگەر گیریەك، دەستی بە تەقاندنەوەیەکی فکری کرد. لە ئازادی ڕادەربڕین، بلاّو کردنەوەی ئەندێشەو بیرکردنەوەی ئەدەبیانە ـ کەلە ولایەتەکانی باکوردا پشکوتن زانست و زانیاری لێکەوتبویەوە ـ لە ویلایەتەکانی باشوردا هیچ یەك لەوانە بەدی نەدەکراو، گەندەڵی ئیداری ، خنکاندنی فکری، سنوورداری ئازادی سیاسی و کۆنترۆڵی بیرو باوەڕو هزر، کۆسپێکی گەورەیان لەبەردەم گەشەو پێشکەوتنی باشوردا دروست کرد. ئەم کۆششە بۆ پاراستنی کۆیلایەتی، بە پێچەوانەی یەکێك لە گەورەترین سیاسەت مەدارەکانی دەست پەروەردەی باشوورو پشتیوانی ڕاگەیاندنی سەربەخۆی ئەمریکا واتە ((تۆماس جفرسۆن)) دەژمێررا.

باشوور، کەلەسەردەمی شۆڕشی ئەمریکیدا بە مەڵبەندی سەرەکی بیرکردنەوەکانی سەردەمی لیبرالیزم دەژمێردرا، لەماوەی پەنجا ساڵدا و لە ژێر کاریگەری سیستەمی کۆیلەداری و هەوڵدان بۆ پاراستنی، لەرووی فکری کۆمەلایەتیەوە دواکەوت. بیرکردنەوە چاکسازی خوازەکانی سەردەمی ((جەکسۆن))و ڕێك بەدوادا چوون و چاك کردنی بارو دۆخی زیندانیەکان، پەرە پێدانی مافی ژنان، و بەژداری کردن لەدەنگدان و چالاکیە سیاسیەکان کە لە باکووردا مشت و مڕێکی زۆری لە سەر دەکرا، بە تۆمەتی ئەوەی کە ئەوەی کە ئەم بیرۆکانە پەیوەندیان بەڕاپەڕینی لایەنگرانی هەڵوەشانەوەی کۆیلایەتیەوە هەیە، لەباشووردا قەدەغە دەکران. لەنێو ئەو هەمرو بەرهەمە ئەدەبیانەی کەلەم ڕۆژکارەدا بلاّو کرانەوە، تەنها نووسەرێك کەمەرنجی باشووریەکانی بۆلای خۆی ڕاکێشا، ((ڤالتەر نۆسکات))بوو،کە ناوێتەیەك لە ڕۆحیەی

محافزەکارانەی ئینگلیزی و سیستەمی کۆمەلایەتی خانەدانی لە نووسراوەکانیدا ڕەنگی دەدایەوە. ئەو داستانە ڕۆمانتیکیانەی کە ((ئۆسکات)) دەربارەی پیاوە دلاوەرەکانی سەدەی ناوەراست و سیستەمی خانەدانی ئەو سەردەمەوە راڤەی دەکردن، لەگەلّ بیرکردنەوەی باشوریەکاندا چاکتر دەکونجا تا بەرهەمی نووسەرانی وەك ((چارلز دیکنز))، کە یەکێك بوو لەرەخنەگرە کۆمەلایەتیکان و بە ناوی کەسێکی کافرو خودا نەناس بەرهەمەکانی لە باشووردا بلاّو نەدەبونەوە. لەرووی دامەزراوەکانی کلێسەشەوە، باشوور شێوازێکی جیاوازی وەرگرت. بۆ پاساو هێنانەوەی ئەخلاقیانەی کۆیلایەتی، لێکدانەوەی کەلامی ئینجیل سنورێکی بۆ دیاری کراو لە سالّی ١٨٤٠ بەدواوە کلێسەی مەسیحی ((بابتیست))ی باشوور لە دامەزراوەکانی تری کلێسە جیاکرایەوە. هەر ئەندازە کەباشوور لەپێناو بەرگریکردن لە سیستەمی کۆیلایەتی زیاتر هەولّیدەدا، هەمان ئەندازەش لە گۆڕانکاریە فکری و کۆمەلایەتیەکانی نیوەی یەکەمی سەدەمی نۆزدەیەم دواکەوت و، لە کۆتایدا هەر بۆ بەرگریکردن لەم ئامانجەی خۆی بوو کە شەڕی لەگەلّ باکوردا هەلّ گیرساند.

کۆیلایەتی نەتەنها بووبە هۆی جیابوونەوەی ویلایەتەکانی باشوور لە بەشەکانی دیکەی ئەمریکا، بەلکو دامەزراندنی چەندەها ئەنجومەن و ڕێکخراوی جیاوازی دژ بە کۆیلایەتی لە ویلایەتەکانی باکوردا لێکەوتەوە.

بلاّو بونەوە ڕۆژنامەی ((ئازادی))کە یەکەمین ڕۆژنامەی ڕەش پێستەکان بوو، لە سالّی ١٨٢٧ بە هیممەتی ژمارەیەك لە سپی پێستەکانی باکور ڕەونەقێکی زۆری پەیدا کرد. لەوەش گرنگتر ڕۆژنامەی ((لیبراتۆر )) بوو کە لە سالّی ١٨٣١دەستی بەکار کرد و سەرنووسەرەکەی ((ویلیام للوید گاریسۆن))بوو، کە یەکێك بوو لە پێشەنگەکانی ڕاپەڕینی دژ بە سیستەمی کۆیلەداری.

ئەم بلاّو کراوەیە، هەولّی بەرزکردنەوەی هەستی ئەژادی و خۆڕاگری ڕەشەکانی دەدا و ئامۆژگاری دەکردن کە سود لە لایەنە چاکەکانی فێرکردن و هاوکاری وەربگرن، جگە لەمەش ئەرکی بلاّوکردنەوەی ووتاری لایەنگرانی هەلّوەشاندنەوەی کۆیلایەتی دەگرتە ئەستۆ.

ژمارەیەکی زۆر لە ژنان و پیاوان کە لە ڕوداوە چاکسازی خوازیەکانی ئەم سەردەمەدا ئەو پەڕی چالاکیان ئەنجام دەدا، دەستیان بە پشتگیری ڕەشەکان کرد. کۆیلەدارەکانیان بەشایەنی هەر جۆرە بێ ڕێزیەك زانی، سیستەمی کۆیلەداریان لەڕووی ئاکاری و مەزهەبیەوە ئیدانە کردو هەزاران وێنەیان لە نا مرۆڤایەتی بوونی ئەو سیستەمە دەخستە ڕوو.

بزوتنەوەی دژ بەکۆیلەداری لەگەڵ بزوتنەوەی ئازادی ژنان و راپەرینە چاکسازیە خوازەکانی دیکەی ئەو سەردەمەدا یەکیانگرتبوو. ژنە ناودارەکانی وەك((ئیلیزابێت کەدی ئستانتۆن)) و ((لوکر سیامات)) لەگەڵ پیاوە خۆشمەندەکانی وەك(( ویلیام للویدگاریسۆن))،(( چارلز سامنر))،((لاو جوی)) و ((ڤیتیر))لە راپەرینی دژ بەکۆیلایەتیدا هاورێ و هاو هەڵوێست بوون. چەند ئەنجومەنێکی جۆراو جۆری دژ بە کۆیلایەتیان پێك هێناو، بۆ دەربازبوونی ڕەشەکان لەکۆت و بەندی زیندانی کردن، جۆرەها چالاکیان بەئەنجام گەیاند، لەو جۆرە چالاکیانەش بریتی بوو لە دامەزراندنی کۆچنشینێك لە کەنارەکانی ئەفریقا کە ڕەشەکانی بۆ کۆچکردن بەرەو ئەو ناوچەیە بانگهێشت دەکرد. بەدامەزراندنی کۆماری لیبریا، ژمارەیەك لە ڕەش پێستەکان خۆیان بۆ گەڕانەوە بەرەو ئەفریقا ئامادە کردو بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی سەربەخۆ هان دران. چالاکیەکی دیکەی ئەم گروپە، بریتی بوو لە یارمەتیدانی ڕەشەکان بۆ ئەوەی لە ویلایەتەکانی باشوورەوە هەڵبێن، کەبەچالاکی ((هێڵی ئاسنی ژێر زەمینی )) ناو بانگی دەرکردو توانی پێداویستیەکانی هەڵهاتن بۆ زیاتر لە هەشتا هەزار کۆیلە بەرەو ویلایەتەکانی باکوور و کەنەدا فەراهەم بکات .

بەڵام هەر ئەندازە ویلایەتەکانی باکوور چالاکیەکانی دژ بەکۆیلایەتیان زیاتر دەکرد، باشووریەکان لەسەر پاراستن و پاسەوانی کردنی ئەم سیستەمە زیاتر سوور دەبوون. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم، بە پەرە سەندنی سنوری وولایەتەیەکگرتووەکان تا کەنارەکانی ئۆقیانوسی ئارام و لکاندنی ویلایەتەنوێیەکان، مەسەلەی کۆیلایەتی بوو بە مەسەلەیەکی سیاسی و ، بابەتی دابەش کردنی ویلایەتەکانی باشوور و درووستکردنی حکومەتێکی جودای هێنایە پێشەوە.

دەر ئەنجامی ئەو ڕووبەڕووبوونەوە سەربازیە و شەڕی ناو خۆش، هەمووی لە پێناو پاراستنی یەکێتی ویلایەتەکان و بەهێزکردنی سیاسەتی ئەمریکا بوو:

## قەیرانە ناوچەییەکان:١٨٤٨ ـ ١٨٦١

لکاندنی ناوچە نوێیەکان و پەردپێدانی ئەو زەویەی کە فراوانیەکەی لە هەموو ئەورووپای ڕۆژئاوا زیاتر بوو، بەدڵنیایەوە چەندەها گرفتی کۆمەڵایەتی و ئابوری نوێی هێنایە کایەوە. ناوچە جۆراو جۆرەکان، لە ڕوی شوێنی جوگرافی و سیستەمی ئابوریەوەجیاواز بوون. لایەنی ئابوری گرنگترین خاڵی ناکۆکی نێوان باکوروو باشوربوو ئەمەش جیاوازی بیروباوەڕی سیاسی

نێوانیانی لەگەڵ خۆی دەهێنا. ویلایەتەکانی باشوور بەروو بومی لۆکەی خۆیان بۆکارگەکانی ڕستن و چنینی ئینگلیز دەناردو بۆ کڕین ئامێرەپیشەسازیەکانیان پێویستیان بە بازاڕەکانی ئەورووپا هەبوو.

ویلایەتەکانی باکووریش کە خۆی بۆ خۆی خاوەنی چەندەها کارگەی جۆربەجۆر و بەرهەم هێنەری بەرووبومی پیشەسازی بوو، پێویستیەکی زۆری بە پشتیوانی دەوڵەت لە دانانی باجی گومرگ و باجی گشتی هەبوو بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ بەرووبومی هەرزانی ئەورووپیدا ڕکەبەری بکات. کارگەکانی ویلایەتەکانی باکوور و ڕۆژهەلات، بەرووبومی سەرەکی ناوچەکانی ڕۆژئاوایان دابین دەکرد و ویلایەتەکانی ڕۆژئاواش بەروو بوومە کشتوکاڵیەکانی خۆیان لە ناوچەکانی باکور و ڕۆژهەلاتدا نمایش دەکرد. دانانی باجی گومرگ لە ویلایەتەکانی باشوور قازانجێکی ئەو تۆی نەدەبوو، لەبەرئەوە نوێنەری ئەو ویلایەتانە لەکاتی پێشنازکردنی ئەو جۆرە باجە لەکۆنگرێسدا بەتوندی ناڕەزاییان لەسەری دەربڕی. ئەم کێبڕکێ و جیاوازی بیرورایە مەسەلەی ((بنەمای هەڵوەشانەوەی)) هێنایەکایەوە، ویلایەتەکانی باشوور هەر لەبنچینەدا بەرامبەر بەدەسەلاتی حکومەتی فیدراڵ بۆ دانانی ئەم جۆرە یاسایانە بەدگومان بوون.

مەسەلەی کۆیلایەتی بەچاندنی لۆکە ڕەواجی زیاتری پەیدا کرد و بەپەرەسەندنی زەویە کشتوکاڵیەکان، بازاڕەکانی کڕین و فرۆشتنی ئەم بەرووبوومە پەرەیان سەند. ویلایەتەکانی باشوور لەڕووی سیاسیشەوە داوای پاراستنی سیستەمی کۆیلایەتیان دەکرد. پاش دەرکردنی قانوونی ئەساسی، هەرچەندە کۆیلەکان وەك هاولاتیەکی ئەمریکی دانیان پێدا نەنرا، بەلام بەپێی ئەو یاسایانە هەر کەسێکی ئازاد بەرامبەر سێ کۆیلە لەڕووی مافی دەنگدان و دانی باج و سەرانەوە حیسابی بۆ دەکرا. هەرچەندە کۆیلەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نایاندەتوانی لەهەڵبژاردندا بەشداری بکەن، بەلام هەر ویلایەتێك کەکۆیلە نشین بوایە و دانیشتوانێکی زیاتری هەبوایە، دەیتوانی ژمارەی نوێنەرەکانی خۆی لەکۆنگرێسدا زیاد بکات. ویلایەتەکانی باشووریش کە ئەم قانونەیان بەدەستکەوتێکی سیاسی بۆ خۆیان دەزانی، نەیان دەویست بەلکاندنی ویلایەتە نوێیە بێ کۆیلەکان، شوێن پێی سیاسی خۆیان لەکۆنگرێسدا لەدەست بدەن و ببنە دەسەلاتێکی کەمینە. کاتێك ویلایەتی میسۆری داوای لکاندنی بەویلایەتە یەکگرتووەکانەوە دەکرد، بۆ یەکەمین جار مەسەلەی کۆیلایەتی وەك مەسەلەیەکی سیای خرایە ڕوو. ئەم مەسەلەیە مشت و مڕێکی زۆری نێوان ئەندامانی کۆنگرەی لێکەوتەوە و، دواتر بەپێشنیازی ((دانوسانی میسۆری)) لەساڵی ١٨٢١کۆتایی پێهات. بەپێی ئەم ڕێککەوتنە

میسوری وەك ویلایەتێکی کۆیلەدار بەیەکیەتی فیدراڵیەوە لکێنرا و مین وەك ویلایەتێکی ئازاد و بێ کۆیلە هاوکات دانی پێدا نرا. هەرلەو کاتەوە کەلێنی سیاسی نێوان باکوور و باشور ئاشکرا کراو، بەپێی رێککەوتن نامەی ((گوادولوپ هیدالگۆ)) لەکاتی لکاندنی زەویە تازەکانی رۆژئاوا، بەشێوەی ویلایەتێکی نوێ، ئەم مەسەلەیە دووبارە سەری هەڵدایەوە. پلانی دانوسان کەلەلایەن یەکێك لە نوێنەرانی کۆنگرێسەوە بەناوی ((هێنری کلی)) پێشنیاز کرا، لەساڵی١٨٥٠ رەزامەندیان لەسەر دەربری. بەپێی ئەم پلانە بڕیاردرا کالیفۆرنیا ببێتە ویلایەتێکی ئازاد و، بەشێك لەتەکزاس بخرێتە سەر نیو مەکسیکۆ، یوتا و نیو مەکسیکۆ سیستەمی کۆیلایەتی لەو ویلایەتانە پەرە پێنەدەن، سەبارەت بەلکاندنی ئەم ویلایەتانە بەیەکیەتی فیدراڵەوە، خۆیان بڕیار بدەن و کۆیلایەتی لەشاری واشنگتۆندا قەدەغە بکرێت. بەدوادا چوونی کۆیلە هەڵاتوەکان و گەڕاندنەوەیان بۆ باشوور کە ئاواتی باشوریەکان بوو، بڕیاری لەسەر درا. بەڵام ئەم پلانی دانوسانە ڕێگاچارەیەکی بنچینەیی نەبوو. ویلایەتەکانی یوتا و نیومەکسیکۆ، بۆ دیاریکردنی بابەتی کۆیلایەتی ئازادیەکی تەواویان پێدرا، بەدوادا چوونی کۆیلە هەڵهاتووەکان غەیرە مومکن دەهاتە بەرچاو ـ چونکە ژمارەیەك لەم کۆیلانە ساڵانێکی دوورودرێژ لەویلایەتەکانی باکوور ژیابوون و خێزانیان پێك هێنابوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو هەنگاوانەی کەبۆ گەڕاندنەوەیان بۆ باشوور جێبەجێ کران، تەنها پەرسەندنی چالاکیەکانی ڕێکخراوی ((هێڵی ئاسنی ژێرزەمینی)) بەداودەهات، کەبەویەری شەوق و زەوقەوە هۆکارەکانی هەڵهاتنی کۆیلەکانی فەراهەم دەکرد. یەکێك لەو کەسانەی کە چالاکانە لەم بەرنامەیەدا بەشداری دەکرد، لەیاسای بەدواداچوونی کۆیلە هەڵهاتووەکان هەڵگەڕایەوەو، کتێبێکی بڵاوکردەوە کەسەرنجی تێکڕای ئەمریکیەکانی بەرەو ژیانی ڕەشەکان ڕاکێشا. کتێبی ((کۆلێتی مامەتام)) بەپێنووسی کەسێکی شۆڕشگێڕ بەناوی ((هاریت بچراستۆ))، بلیمەتی، بەدبەختی و بەندکردنی کۆیلەکانی شیکردەوە و کۆیلایەتیشی لەڕووی ئاکاری و مرۆڤایەتی یەوە مەحکوم کرد. بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە لەساڵی ١٨٥٢ کاریگەریەکی زۆری لەسەر ڕاکێشانی سەرنجی گشتی بۆ مەسەلەی کۆیلایەتی هەبوو.

دروستکردنی هێڵی ئاسن لەناوچەکانی رۆژئاوا، یەکێکی تربوو لەو مەسەلانەی کە قەیرانە ناوچەییەکانی زیاتر ئاڵۆز کرد. بەشێوەیەکی گشتی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم، بەپەرسەندنی ویلایەتەکانی رۆژئاوا، دەستبەسەرداگرتنی ناوچە نوێیەکان، دۆزینەوەی زێڕ لەکالیفۆرنیا و لێشاوی کۆچکردن بەرەو ئەمریکا ـ درووستکردنی ڕێگاو هێڵی ئاسن بەخاڵێکی

هەرەگرنگ و پێویست دەژمێررا. بەمەبەستی پەرەپێدانی لایەنی ئابووری، دروستکردنی هێڵی ئاسنی سەرتاسەری خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە و بۆ ڕاکێشانی هێڵی ئاسن لەشیکاگۆوە بۆ ئۆقیانوسی ئارام، یەکێك لەنوێنەرانی ویلایەتی ئیلی نوا بەناوی ((ویلیام داگلاس)) پێشنیازی کرد کەهەر دوو ویلایەتی نوێی کانزاس و نبراسکا لەناوچەی بەرفراوانی لئونزیانا جیابکرێتەوە و هێڵی ئاسن لەم ویلایەتە تازە دامەزراوانە تێپەڕێت و بەرەو ڕۆژئاوا بکشێت. بەهۆی پێشنیازەکەی ((داگلاس))ەوە پلانێکی ئاسراو بەناوی ((یاسای کانزاس و نبراسکا))خرایە پێش چاو، کەتیایدا بڕیاردرا بەدرووستکردنی دوو ویلایەتی نوێ و دانیشتوانەکەشی مافی ئەوەیان هەبوو کەدەربارەی مەسەلەی کۆیلەداری یان ڕەتکردنەوەی ئەو سیستەمە خۆیان بڕیار بدەن. لایەنگرانی کۆیلایەتی و ئەوانەش کەرەتیان دەکردەوە هەستیان بەچالاکی کردوو ژمارەیەکی زۆر لەخاوەن کۆیلەکان لە کانزاس جێگیر بوون و سنووری ناکۆکیەکان زیادی کرد. ((جۆن براون)) کە یەکێك بوو لە خەباتگێرە سپی پێستە دەمارگیرەکان، دژ بەم سیستەمە دەستی بە کوشتاری سپی پێستەکان کرد و بەهۆی ئەم کارەیەوە لەو ویلایەتە دوور خرایەوە و لەساڵی ١٨٥٩ لەگەڵ ژمارەیەك لەشوێنکەوتوانی، هێرشێکی کردە سەر بنکەیەکی چەك و تەقەمەنی لە((هارپر زفری))لەویلایەتی ڤێرجینیا و دەستی بەسەردا کرت، ڕۆژێك دوای ئەو ڕوداوە دەست گیر کراو لەبەر ئەو کارانەی سزای سێدارەدانی بەسەردا سەپێنرا. ڕووبەڕووبونەوەکانی نێوان هەردوو دەستەی لایەنگر و نەیارانی کۆیلایەتی لە کانزاس، نیشانەیەکی دیکە لەو ناکۆکیە بنچینەییەی نێوان باکوور و باشوورە. ئەو گروپە جۆراوجۆرانەی کە نەیاری کۆیلایەتی بوون، بۆ ئامانجێکی هاوبەش پێکەوە کۆبونەوە و حیزبێکی نوێیان دروست کرد کە بە حیزبی ((کۆماریخواز)) ناوبانگی دەرکرد.

لەو بابەتانەی کە پاش مەسەلەی کانزاس و نبراسکا هات و هاوارێکی زۆری نایەوە. داستانی ((دەرد ئسکات))ی ڕەش پێستێکی ئەهلی میسۆری بوو. لەگەڵ خاوەنەکەی بەرەو ئیلی نوا، ویلایەتی ئازاد و بێ کۆیلە سەفەری کردبوو. پاش ساڵانێکی دوورودرێژ بەرەو میسۆری گەڕایەوە و سکاڵایەکی پێشکەش بە دادگا کرد و داوای ئازادی کرد.((ئسکات)) لە داواکەیدا ئاماژەی بەوە کرد، کەپاش نیشتەجێ بوونێکی دوورودرێژ لە ویلایەتێکی ئازاد، ئەرکەکانی (وەك کۆیلەیەك) لە خۆیانەوە هەڵوەشاونەتەوە. دادگای میسۆری سکاڵاکەی ئسکاتی بۆ دادگای باڵا بەرز کردەوە. بۆچونی دادوەرەکانی دادگای باڵا بەم شێوەیە بوو، کەلەبەر ئەوەی بەپێی یاسا کۆیلەکان هی خاوەنەکانیانن و لەمافەکانی پەنا بەریەتی ئەو وڵاتە

بێبەشن، کەواتە ناتوانن سکاڵاکانی خۆیان بۆ دادگای باڵا بەرز بکەنەوە. لەکاتێکدا کە ژمارەی ڕەشپێستەکان (سێ ڕەش پێست بەرامبەر بەیەك سپی پێست) لەسەر ژمێریەکانی کاتی هەڵبژاردندا تۆمارکرابوو، ئەم بڕیارەی دادگا بەبڕیارێکی نامەنتیقی دەهاتە بەرچاو. لەسەر ئەم مەسەلەیە گفتوگۆیەکی زۆر ئەنجام درا.

لەساڵی ١٨٥٨، ئەوکاتەی کە ((داگلاس)) بۆ بەدەستهێنانی پۆستی سیناتۆری لە ویلایەتی ئیلی نوا هوڵی دەدا، ڕووبەڕووی ناڕەزاییی یەکی توندی ((ئابراهام لینکلن))ی پارێزەر بوویەوە. ((لینکلن))ناوبراوی بۆ گفتوگۆکردن لەسەر مەسەلەی کۆیلەداری بانگهێشت کرد. گفتوگۆی ئەم دوو سیاسەت مەدارە سەبارەت بە ((دەرد سکات)) جارێکی دی جیاوازی بیروڕای لەسەر بنەمای کۆیلایەتی هێنایە ئاراوە. ((داگلاس)) کەوتە مەوقیفێکی سیاسیەوە، ئەگەر دەیووت بڕیاری دادگای باڵا دادوەریەکی ڕاست و درووست نەبووە، باشووریەکانی لەخۆی دەرەنجاند و بەپێچەوانەشەوە، لایەنگرانی هەڵوەشانەوەی کۆیلایەتی و ئەندامانی حزبی تازەدامەزراوی کۆماریخواز لێی زویر دەبن و ناڕەزاییان لەسەری دەردەبڕی. وەڵامی ((داگلاس)) ئەوەبوو، کەئەگەر دام و دەزگای حکومەتی مەحەلی و ویلایەتی پشتیوانی لەکۆیلەداری نەکەن، سیستەمی کۆیلەداری بەردەوام نابێت و بەم پێیەش بەبێ ئەوەی بڕیاری دادگای باڵا هەڵیسەنگێنێت، مەسەلەی دەسەڵاتی حکومەتی ویلایەتەکانی هێنایە پێشەوە. هەرچەندە ناوبراو لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی١٨٥٨ سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەڵام گفتوگۆ سیاسیەکانی نێوان ئەم دوو سیاسەتمەدارە بووە هۆی ناوبانگ دەرکردن ((لینکلن)) و لەهەڵبژاردنەکانی ١٨٦٠ ، لینکلن بەو پێشینەیەی کە دەربارەی کۆیلایەتی و لایەنگری هەڵوەشانەوەی ئەو سیستەمە بەدەستی هێنا بوو، توانی متمانەی زۆرینەی ئەندامانی حزبی کۆماریخواز بەدەست بهێنێت و لەلایەن ئەم حیزبە تازە دامەزراوەوە بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری کاندید بکرێت.

بەدرێژایی ماوەی گفتوگۆکانی هەڵبژاردنی ١٨٥٨، ((لینکلن)) وەك سیاسەتمەدارێکی بەرگریکاری مافی ڕەشەکان ناوبانگی دەرکرد. ئەو لەیەکێك لەووتارەکانیدا ڕایگەیاند :((ماڵێك لەنێوان ئەندامەکانیدا دوبەرەکی و پەرتەوازەیی هەبێت، بەردەوام نابێت. دەوڵەتێك بەبارودۆخێکی نیوە کۆیلە و نیوە ئازاد ناتوانێت بەردەوام بێت. من ناڵێم کە یەکیەتیەکەی ئێمە هەڵوەشێتەوە و ئەم ماڵەمان بتەقێنرێتەوە. بەڵام دەڵێم کەپێویستە دووبەرەکی و جیابوونەوە تیایدا کۆڵ و باری خۆی بپێچێتەوە.)) لەوتەیەکی تریدا جەختی لەسەر ئەو یەکسانیە کردەوە کە کۆمەڵگە لەرووی هەلومەرج و پێداویستیەکانەوە دەستە بەری کردبوو،

ئاماژەشی بەوە کرد کە:((ڕەش پێست لەگەڵ مندا یەکسان و هاوسەنگ نیە، ڕەنگی دەم و چاوی ئێمە جیاوازە و لەوانەشە لەڕووی ئاکار و فیکریشەوە جیاوازیەك هەبێت، بەڵام ڕەش پێست لەمافی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی مووچە و پشت بەستن بەووزەی خۆی لەگەڵ مندا یەکسانە و لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتیشدا یەکسانە.)) لەکاتی کێبەرکێکانی هەڵبژاردندا، ((لینکلن)) جەختی لەسەر پاراستنی یەکگرتوویی ویلایەتەکان کردەوە ـ بەپێی لەبەرچاو گرتنی تاك بەرامبەر بەتاك، نەژادێك بەرامبەر نەژادێکی دیکە ـ لەو ڕووەوە کە ((خەڵکی ئەم زەویە پان و بەرینە یەکبگرن و بەسەربەرزی ڕای بگەێنن کە هەموو تاکەکان و مرۆڤایەتی بەیەکسانی دروستکراون و خاوەنی مافی یەکسانی خۆیانن.))

لەهەڵبژاردنەکانی ١٨٦٠دا، ((ئابراهام لینکلن)) پارێزەری ویلایەتی ئیلی نوا وەك یەکەمین کاندیکرای حیزبی کۆماریخواز بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری هەڵبژێردرا.

لەم سەردەمەدا یەکیەتی فیدراڵ لەهەژدە ویلایەتی ئازاد و پانزە ویلایەتی کۆیلەدار پێکدەهات. لەو هەڵبژاردنەدا تەواوی ویلایەتە ئازادەکان دەنگیان بە ((لینکلن)) داو لەبەرامبەردا، زۆرینەی ویلایەتەکانی باشوور دژ بە سەرۆکایەتیەکەی وەستانەوە. لەسەرتاسەری ویلایەتەکانی باشوور ((لینکلن)) تەنها بیست و چوار هەزار دەنگی بەدەست هێنا. سیاسەتی ناوبراو بۆ پاراستنی یەکرێزی و یەکیەتی ویلایەتەکان بوو، هەروەها لایەنگری ئەو بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و سەرکەوتنی ناوبراو، قەیرانی سیاسی ئەمریکای ئاشکرا کرد. باشووریەکان هەڵبژاردنی ((لینکلن)) یان بەمەترسییەکی گەورە لەسەربەخۆیی خۆیان دەزانی، چونکە ((لینکلن)) لەڕاستیدا نوێنەری تێکڕای ویلایەتەکانی باکوور بوو، (لە٩٩٪ی دەنگەکانی خۆی لە ویلایەتە ئازادەکاندا کۆکربوویەوە)، لەبەر ئەوە ویلایەتەکانی باشوور بڕیاریاندا جیاببنەوە. هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری، وەك نەریتێك لەمانگی نۆڤەمبەردا ئەنجام دەدرێت، بەڵام سەرۆك کۆماری نوێ بەشێوەیەکی ئاسایی لەمانگی مارچدا کاروبارەکان دەگرێتە دەست. لەماوەی ئەم چوار مانگەدا، ویلایەتەکانی باشوور پلانەکانیان بۆ جیاکردنەوەی خۆیان لەگەڵ یەکیەتی فیدراڵ داڕشت. بەڵگەشیان ئەوەبوو کەلەبەرئەوەی لەکاتی پەیوەندی کردنیان بەیەکیەتی دەوڵەتی فیدراڵیەوە تەواوی ماف و ئازادیەکانی خۆیان پاراستبوو و بە پارێزکاریکردن لەم مافەنە بوونەتە ئەندام لەم یەکیەتیەدا، واتە هەرکاتێك کەسایەتی دەوڵەتی فیدراڵی پێچەوانەی بەرژەوەندیەکانیان بێت، ئەوا دەتوانن لەو یەکیەتیە پاشەکشێ بکەن. لەمانگی فێبریوەری ساڵی ١٨٦١، یەك مانگ پاش دەسەڵاتگرتنە دەستی ((لینکلن))

نوێنەرانی ویلایەتەکانی کارولینیای باشوور، می سی سی پی، فلۆریدا، ئالاباما، جۆرجیا، لوئیزیانا و تەکزاس لەشاری مونتگمری سەر بەویلایەتی ئالاباما کۆبوونەوە و جیابوونەوەی خۆیان لەیەکیەتی دەوڵەتی فیدراڵ ڕاگەیاند و ئەو شارەشیان وەك چەقی حکومەتەکەیان هەڵبژارد. یەکێك لەسەرمایەدارە ناودارەکانی ویلایەتی می سی سی پی یان بەناوی ((دیویس)) بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار دەستنیشان کرد. بەم شێوەیەش پێش ئەوەی ((لینکلن)) بەشێوەیەکی فەرمی دەست بەکارەکانی بکات، ویلایەتەکانی باشوور لەم یەکیەتیە جیابوونەوە. هەموو بنکە حکومیەکانی نێو ئەم ویلایەتانە لەژێر ئاڵای کۆنفدراسیۆنی ویلایەتەکانی باشووردا یەکیان گرت. تەنها دووبنکەی سەربازی لە کارولینای باشوور لەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی فیدراڵیدا مانەوە. یەکێك لەو بنکانە ناوی ((فۆرت سومتر)) بوو، کە ڕووبەڕووی پەلاماری سەربازەکانی باشوور بوویەوە. بەم دەست درێژیکردنە، شەڕی ناوخۆی نێوان باشوور و باکووریەکان دەستی پێکرد. شەڕی ناوخۆی ئەمریکا لە ئاپریلی ساڵی ١٨٦١دا دەستی پێکرد و چوار ساڵی تەواو درێژەی کێشا. پاش دەست پێکردنی شەڕەکە ویلایەتەکانی دیکەی باشووریش وەك ڤیرجینیا، تەنسی، ئاراکانزاس، کارولینیای باکوور پەیوەندیان بە کۆنفدراسیۆنی ویلایەتەکانی باشوورەوە کرد.

نووسەرانی قانوونی ئەساسی ئەمریکا لەساڵی ١٧٨٩ هەوڵیان دابوو کە دەسەڵاتێکی جوودا و هێزێکی باڵا بەحکومەتی فیدراڵی ببەخشن. ئامانجیشیان ئەوەبوو کەلەکاتی پێکهێنانی حکومەتێکی یەکگرتودا، لەنێوان ویلایەتیەکاندا هاوبەشیەك دروست بکرێت و لەهەمان کاتیشدا ویلایەتەکان بتوانن بوون و دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن. بیروباوەڕی گشتیش بەشێوەیەك بوو کە تاوەکو ویلایەتەکان پێکەوە یەکگرتوو نەبن و وواڵت ناتوانێت دەسەڵاتی تەوای خۆی بسەپێنێت و لەبەر ئەوەی هەموو ویلایەتەکان خاوەنی بەرژەوەندی هاوبەشن، کەواتە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان پارێزگاری لەو یەکیەتیە دەکەن. لەکاتی هەڵگیرسانی شەڕەکەدا، باشووریەکان و مەسەلەی ((بنەمای هەڵوەشانەوە))یان هێنایە باسەوە. لەواقیعیشدا چونکە بەرژەوەندیەکانی خۆیان بەپێچەوانەی بەرژەوەندیەکانی ویلایەتی باکوور دەبینی، مەسەلەیەکی دیکەشیان هێنایە پێشەوە کە ئەویش ئازادی پێش یەکیەتی بوو. لەم ڕووەوە باشووریەکان باوەڕیان وابوو، کە شەڕی ناوخۆ لەسەر مەسەلەی کۆیلایەتی نەبوو، بەڵکو گرفتی سەرەکی مافی ویلایەتی لەبەرامبەر دەسەڵاتی مەرکەزی بوو و، هەر ئەمەش بووە هۆی

ئەوەی کەدەوڵەتی فیدراڵی بەیارمەتی ویلایەتەکانی باکوور شەڕەکە دەست پێبکات و ڕێگە لەجیابوونەوە و سەربەخۆی باشوور بگرێت.

مێژوونوسانی باکوور بەدانانان بەوەی کە ویلایەتەکانی باکوور هەرگیز خۆیان لەبەرامبەر ((بنەمای هەڵوەشانەوە))دا تەسلیم نەکردووە، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە سیستەمی کۆیلەداری هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی شەڕی ناوخۆی ئەمریکا بوو. مێژوونوسانی مێژووی ئابووری بۆچوونێکی تریان هەیە، بەو واتایەی کەسیستەمی ئابووری باکوور و باشوور لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم، جیاواز لەیەکتری گۆڕانکاریان بەسەردا هات. مەترسی دابەشبوونی سیاسی و ویلایەتەکانی باشوور، بەهۆی جیاوازی سیستەمی ئابووریەوە سەری هەڵدا، کۆیلایەتی هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی شەڕەکە نەبوو، بەڵگەشیان ئەوەبوو کە ((لینکلن)) ئەوەندە مەبەستی ئازادکردنی کۆیلەکان نەبووە ـ جگە لەوەش یەك ساڵ پێنج مانگ دوای دەستپێکردنی شەڕەکە ئەوجا بڕیاری ئازادکردنی کۆیلەکانی دەرکرد.

ناکۆکی و دژایەتی نێوان هەردووجۆری سیستەمی ئابووری، واتە ڕووبەڕووبونەوەی سیستەمی پیشەسازی باکوور لەگەڵ سیستەمی کشتوکاڵی باشوور، جیاوازی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی نێوان باکوور و باشوور و، دژیەکی دووژینگەی جیاوازی کۆمەڵایەتی، هۆکارەکانی سەرهەڵدانی شەڕی ناوخۆی ئەمریکا بوون. بەهەر حاڵ تەنها مەسەلەی کۆیلایەتی بوو کەتەواوی ئەم جیاوازی و دژیەکیەی ئاشکراکرد. دەرئەنجامە سیاسیەکانی پەرەسەندنی سنوورەکانی ئەمریکا، ئانۆقیانووسی ئارامیش هەر کاریگەری خۆی هەبوو ـ هەرچەندە ئەو کاریگەریە کەمیش بووبێت. بەپیشەسازی بوونی ویلایەتەکانی باکوور و ڕۆژئاوا، دەسەڵاتی مەحەلی لە ویلایەتەکانی باشوورەوە بۆ باکوور دەگوازرایەوە. هاوکات لەگەڵ ئەم گۆڕانکاریانە، بوونی یەکیەتیەکی بەهێز و حکومەتێکی مەرکەزی زلهێز، زۆر بەپێویست و زەروور دەژمێررا، شەڕی ناوخۆ لەپێناوی پاراستنی یەکیەتی سیاسی، یەکڕیزی ئابووری و لەناوبردنی دژیەکی و کۆمەڵایەتی نێوان باکوور و باشوور ڕویدا.

شەڕی ناوخۆی ئەمریکا هاوکات لەگەل بەلووتکە گەیشتنی هەستی ناسیۆنالیزمی لە ئەوروپا دەستی پێکرد.

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، ناسیۆنالیزم هۆکاری سەرەکی یەکیەتی و یەکڕیزی نێوان ئەو میللەتانە بوو، کەهەریەکە و لەبەر هۆکارێکی سیاسی پێکەوە یەکیان نەگرتبوو. یەکیەتی ئیتالیا بەڕابەرایەتی ((کاڤور)) و ((گاریبالدی)) و یەکگرتویی ئەڵمانیا

بەسەرکردایەتی((بسمارك)) لەساڵەکانی نێوان ۱۸٦۰-۱۸۷۰ ئەنجام درا. لەئەمریکاش مەترسی هەڵوەشانەوەی یەکریزی و یەکیەتی ویلایەتەکان بوو کە ئەو شەڕە درێژخایەنەی لێکەوتەوە.

شەڕی ناخۆی ئەمریکا چوارساڵی خایاند لە۱۸٦۱-۱۸٦٥. ئاگری شەڕ سنووری هەموو ویلایەتەکانی بەزاند. لەکۆی چواردە ملیۆن پیاوی ئازاد، دووملیۆن و هەشت سەد هەزار کەسیان لەریزەکانی سوپادا خزمەتیان دەکرد. هێزەکانی باکوور بەدرێژایی ماوەی شەڕەکە لەو سەربازانە پێکدەهاتن کەبە شێوەیەکی خۆبەخش پەیوەندیان بەسوپاوە کردبوو، چونکە تائەو کاتەش خزمەتی سەربازی و بەزۆر سەربازی کردن لەنێو ویلایەتەکانی باکووردا باو نەبوو. لەکۆی ئەم رێژەیە ژمارەی سەربازەکانی ویلایەتەکانی باکوور دووملیۆن و هەشت سەد هەزارەکەی دیکە بۆ بەرژەوەندی ویلایەتەکانی باشوور شەڕیان دەکرد.

لەسەرەدەمی ئاشتیدا ژمارەی سەربازەکانی ئەمریکا لە سیانزە هەزار کەس تێپەڕی نەدەکرد. لەرووی مەشقی سەربازیشەوە ئەزموونێکی وەهایان نەبوو کە شایەنی باسکردن بێت. ئەم شەڕە بۆ هەردوولا شێوازێکی ئەزموونی هەبوو. زۆربەی ئەو سەربازانەش کە پەیوەندیان بەهەردوولاوە دەکرد، خۆبەخش بوون، لەپاش دووساڵی یەکەمی شەڕ یاسایەك تایبەت بەسەربازگرتن دەرکرا. پاش دەرچوونی یاسای سەربازگیری، ئەو کەسانەی کە نەیان دەویست لەشەڕەکەدا بەشداری بکەن بەتەرخان کردنی بڕی سێ سەد دۆلار دەیانتوانی لەشەڕەکە خۆیان بەدوور بگرن. زۆرێك لەرەش پێستەکان پاش راگەیاندنی هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی لەساڵی۱۸٦۳، بەشێوەیەکی خۆبەخشانە چوونە نێو ریزەکانی سووپای باکوورەوە. زۆربەی کۆچکەرە تازە هاتووەکانی ئەڵمانیا، ئێرلەندا، ئەسکەندەنافیاش ئامادەی خزمەتی سەربازی و سەلماندنی هەستی نیشتیمانپەروەری خۆیان بوون. ژمارەی کوژراوەکان زۆر زۆربوو - زیاترلە ۲۰٪ی تێکڕای سەربازەکان بوونە قوربانی. هەڵوێستی قارەمانانەی هەزاران ژن و پیاوی خۆبەخش چ لەرووی پەرەستاری و تیمارکردنی سەربازان و چ لەبەرەکانی شەڕدا بەرادەیەك بوو کە رەنگی ئەفسانەی بەخۆوە گرتبوو.

لەسەرەتای شەڕەکەوە بەئاشکرا هەست بەبەهێزی باکووریەکان دەکرا، هەم لەرووی ژمارەی سەربازەکان و هەم لەرووی دەسەڵاتی ئابووریەوە. رێژەی سپی پێستەکانی نیشتەجێی ویلایەتەکانی باشوور کەمێك زیاتر بوون لەپێنج ملیۆن کەس، لەکاتێکدا کە ئەم رێژەیە لە باکووردا گەشتبوویە نۆ ملیۆن کەس. لەرووی ئابووریشەوە ژمارەی کارگەکانی باکوور چوار

ئەوەندە و ڕێژەی بەرهەمهێنانیان شەش ئەوەندەی ویلایەتەکانی باشوور بوو. لەرووی هۆکارەکانی پەیوەندیکردن و گواستنەوەشەوە، باکووریەکان ئاستێکی بەرزتریان هەبوو، زۆربەی تۆڕی هێڵەکانی ئاسن لەباکووردا ڕاکێشرابوون و ڕێگا سەرەکیەکانی پەیوەندی کردنی ناوچەکان لەدەست ویلایەتەکانی باکووردا بوون. هێڵەکانی ئاسن لەگواستنەوەی ئازوقە و تەقەمەنیدا ڕۆڵێکی گرنگ و سەرەکیان لەدیاریکردنی ئاراستەی شەڕەکەدا دەگێڕاو بۆیەکەمین جار لەمێژووی شەڕەکاندا سوود لەهێڵەکانی ئاسن وەرگیرا.

شکست هێنانی ویلایەتەکانی باشوور لایەنێکی غەیرە سەربازی پێوە دیار بوو، چونکە باشوور نەیتوانی دام و دەزگایەکی ئابووری بەهێز بۆ کاتی شەڕەکە پێکەوە بنێت. ناوچە پیشەسازیەکانی باکوور بەدەست پێکردنی شەڕ کارگەکانی خۆیان زیاتر پەرە پێدا، بەڵام لەبەرامبەردا کشتوکاڵی باشوور پێویست بەدوو شتی سەرەکی هەبوو: کڕینی بەرووبوومی پیشەسازی بەتایبەت بەرهەمی پیشەسازی کارگەکانی ئینگلتەرا و زیاد کردنی بەرووبوومی کشتوکاڵی بۆ بەدەست هێنانی ئازوقە و سوود وەرکرتن لەهۆکاردکانی گواستنەوە، بەڵام نەیتوانی بەهیچ کامیان بگات. لەلایەن حکومەتی فیدراڵیشەوە کەنارەکانی باشوور گەمارۆی ئابووری خرایە سەر و ڕێگەیان لەهاتووچۆی ئەو کەشتیانە دەگرت کە بەرووبوومی لۆکەیان بۆ ئەورووپا دەگواستەوە، ئەوانەش کە شتومەك و تەقەمەنی، داو دەرمان و پێداویستەپزیشکیەکان و کەلوپەلی دیکەیان بەرەو باشوور دەهێنا. دەوڵەتی ئینگلیزیش هیچ ناڕەزاییەکی لەسەر ئەم سیاسەتەی حکومەتی فیدرالی دەرنەبڕی. کڕینی چەك و تەقەمەنی لەلایەن هێزەکانی باشوور لەووڵاتی ئینگلیز، سوود و قازانجێکی زۆری بەدەوڵەتی ئینگلیز گەیاند. لەلایەکیشەوە هەست و سۆزی دژ بەکۆیلایەتی، کۆسپێکی گەورەی لەبەرامبەر لایەنگیری ئەو ووڵاتەدا بۆ باشووریەکان درووست کردبوو. هەرلەبەر ئەم هۆیەش بوو حکومەتی ئینگلیز لەشەڕی ناوخۆی ئەمریکادا بێلایەن مایەوە و باشووریش لەگەڵ قەیرانی ئابووریدا دەست بەیەخە بوو ـ قەیرانێك کە لێ دەربازبوونی زۆر ئەستەم بوو.

ئەگەر چارەنوسی شەڕکە بەخێرایی ڕوون دەبویەوە و ماوەکەشی کورت خایەن بوایە، لەوانەبوو باشووریەکان سەرکەوتنیان بەدەست بهێنایە. بەڵام بەدرێژبوونەوەی ماوەی شەڕەکە، ئامادە باشی ویلایەتەکانی باکور، لاوازی ئابووری باشوور، شکستی باشووریەکان مسۆگەر بوو و لەسەر ئەنجامدا هێزەکانی باشور بەسەرکردایەتی ((رابێرت ئی لی)) لەئاپریلی ساڵی١٨٦٥دا خۆیان تەسلیمی سوپای باکوور کرد و شەڕی ناوخۆ کۆتایی پێهات.

شەڕی ناوخۆ چەند دەرئەنجامێکی گرنگی لێکەوتەوە. هیچ کارەساتێك وەك ئەم ڕووداوە کاریگەری لەسەر بەهێزبوونی هەستی نەتەوایەتی و یەکگرتوویی سیاسی ئەمریکا نەبووە. ((ئەمرسۆن)) نووسەری بەناوبانگی ئەمریکی، شەڕی ناوخۆی بەهۆکاری بەهێزبوونی هەستی نیشتیمان پەروەری و نەتەوایەتی و ئەمریکیەکان ناوبرد:((پێش شەڕی ناوخۆ هەستی نیشتیمانپەروەری و نەتەوە خوازی لەرێزگرتنی ئاڵاوە یادی یاریە ئاگرینیەکان و بۆنەکاندا کورت دەکرایەوە، بەڵام دڵێری ملیۆنەها ژن و پیاو، کوژرانی هەزاران کەس لەپێناو پاراستنی یەکیەتی و یەکرێزی وولاتەکەیان، واتایەکی نوێ و واقیعی بەچەمکی نیشتیمان پەروەری بەخشی.)) ((ئۆلیڤەر فندل هولمز)) دادوەری ناوداری ئەمریکی، سەبارەت بەم شەڕە ڕوونی کردەوە:((ئیمە لە تەمەنی لاویەتیدا بەختەوەر بووین کە دڵمان بەئاگری نیشتیمان پەروەری ڕووناك بوویەوە و فێریش بووین کەژیان گەورە و شکۆمەندە.)) بڵاوکردنەوەی بابەتە جۆراوجۆرەکان دەربارەی شەڕی ناوخۆ، نیشانەیەکی گەورەیە لەسەر ئەم هەستە نەتەوایەتیە. لەماوەی شەڕی ناوخۆ تاکۆتایی سەدەی نۆزدەیەم زیاتر لەپێنج سەد کتێب دەربارەی ئەم ڕووداوە بڵاوکرانەوە. دوو کتێبی بەناوبانگ کەتائێستاش لەریزی پڕ فرۆشتنی کتێبەکانی ئەمریکادان، لەلایەن دوونوسەری ئافرەتەوە نوسراون و هەردووکیان پەیوەندیان بەشەڕی ناوخۆی ئەمریکاوە هەیە. یەکێکیان ((کوڵێتی مامە تام)) ئەوی تریان ((بەباد چوو))ە، کەیەکەمیان باس لەهۆکاری شەڕەکە دەکات، ـ واتە مەسەلەی کۆیلایەتی ـ و ئەوی دی لەسەر چارەنوس و ئەنجامی شەڕەکە لەباشووردا ـ واتە کۆتایی سەردەمی ئابووری کشتوکاڵی ـ دەدوێت.

شەڕی ناوخۆ بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا هێزی بەرهەمهێنانی پیشەسازی و مەرکەزیەتی ئابووری باکووری بەرز کردەوە، هەروەها دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتی فیدراڵیشی زیاتر کرد، سەلماندنی حکومەتە ویلایەتیەکان بەتەنهایی ناتوانن گرفتە ئابووری و قەیرانە سیاسیەکان چارەسەر بکەن. ئامانجی شەڕ، درووستکردنی یەکیەتیەکی کامڵی لەنێوان ویلایەتەکان و ئازادی کۆیلەکان بوو. خودی ((لینکلن)) باوەڕی وابوو کە یەکیەتی نێوان ویلایەتەکان بەپاراستنی سیستەمی کۆیلەداری دەستە بەر نابێت، بەڵام بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە جەنگ و ڕاکێشانی هاوکاری ویلایەتەکانی باشوور، بەووردی بەدوای ئەم ئامانجە دەکەوێت. یەك ساڵ و پێنج مانگ پاش دەستپێکردنی شەڕەکە ((لینکلن)) ئازادی کۆیلەکانی لەساڵی ١٨٦٢ ڕاگەیاند، جەختی کردەوە کەلە سەرتای جێنیوەری ١٨٦٣ بەو لاوە هەموو کۆیلەکانی نێو ئەو ویلایەتانەی کەسیستەمی کۆیلایەتیان تێدا باوە ئازادن. جگە لەوەش بۆ ئەوەی ڕێگای

دانوسان و ناشتبوونەوە لەگەڵ باشووریەکاندا بەکراوەیی بێنێتەوە، پێشنیازێکی خستە بەردەمیان کەئەگەر لەماوەی نەوەد ڕۆژدا پەیوەندی بکەنەوە بەیەکیەتی فیدرالیەوە، دەتوانن کۆیلەکانی خۆیان بهێڵنەوە و تەنانەت داوای لێکردن کە بەزیادکردنی برگەیەك بۆ قانوونی ئەساسی، ئازادی کۆیلەکان زۆر بەهێواشی و وورده وورده تا ساڵی ۱۹۰۰ بکەوێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. بەڵام ئەم پێشنیازە لەکۆتایدا ڕەتکرایەوە، دواتر ویلایەتەکانی باشوور کە سووربوون لەسەر شەڕ کردن، بەهیچ جۆرە پێشنیازێکیان بۆدانوسان و ناشتبوونەوە قەبوڵ نەدەکرد. لەکۆتایداو بەشکست خواردنی باشووریەکان لەساڵی ۱۸٦٥، هەڵوەشانەوەی کۆیلایەتی جێبەجێکراو بەزیادکردنی برگەی سیانزەی قانوونی ئەساسی کۆیلایەتی لەهەموو ویلایەتەکانی ئەمریکا سڕایەوە.

سیاسەتی ئابووری ((لینکلن))، هاندانی سەرمایەگوزاری تایبەت و دانانی باجی قورسی گومرگی بۆ پشتیوانی کردنی بەرهەمی ناوخۆبوو. پلانی دروستکردنی هێڵی ئاسنی سەرتاسەری ئەمریکا لەساڵی ۱۸٦٢ لەلایەن کۆنگریسەوە بڕیاری لەسەر دراو بەپشتیوانی و پشتگیری دەوڵەت و سەرمایەگوزاری تایبەتی لەساڵی ۱۸٦٩ جێبەجێکراو ناوی هێڵی ئاسنی ((پاسیفیك))ی لێنرا. دامەزراندنی سیستەمێکی بانکی نوێ لەو پرۆژانەبوو، کەلەلایەن حکومەتی کۆماریخوازەکان و ((لینکلن))ەوە پێشنیاز کرا لەڕووی ئابووریەوە. بیرۆکەی دامەزراندنی بانکێك کە مەرکەزیەتێکی زیاتر و دەسەڵاتێکی دارایی فراوانتری هەبێت لەساڵی۱۸٦٣، دروستکردنی بانکی میللی ئەمریکای بەدوای خۆیدا هێنا. ئەرکی کۆنترۆڵکردنی بانك، دەرکردنی سکەو ڕێگە گرتن لەنزم بوونەوەی نرخی دۆلار و بەرەنگاربوونەوەی هەڵاوسانی دارایی لەبەرنامەکانی دەوڵەتی فیدرالی بوو.

لەساڵی ۱۸٤٨ ((لینکلن))، بۆ جاری دووەم بەبەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکان بۆ سەرۆك کۆمار هەڵبژێررایەوە و دەورەی دووەمی سەرۆك کۆماریەتەکەی بەهەڵبژاردنی جێگرێك بەناوی ((جانسۆن)) لەحیزبی دیموکراتی باشوور دەست پێکرد. لەمانگی ئەپریلی ۱۸٦٥، هێزەکان باشوور بەفەرماندەیی جەنەراڵ ئی ـ لی خۆیان بەیەکجاری دایە دەستەوە. بەم بۆنەشەوە شاری واشنگتۆنیان لەڕۆژی سیانزەی ئاپریل بەچراکانیان ڕازاندەوە و گرووپە جۆراو جۆرەکانی خەڵك ڕژانە سەر شەقامەکان و شەوی دواتریش کەدەکاتە چواردەی ئاپریل، ((لینکلن))ی سەرۆك پاش ئەوەی بۆ سەیرکردنی شانۆیەك لەو شارە بەشداری لە شانۆگەریەکەدا کرد، بەدەستی کەسێکی دەمارگیر بەناوی ((جۆن ویلیکس بۆت)) بەگوللە کوژرا. ((جانسۆن))ی جێگری وەك

سەرۆك كۆماری نوێ جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست و مەرگی لەناكاوی ((لینكلن)) بۆ وڵاتێك كەتازە بەتازە لەشەڕێكی دژوار و خوێناوی ڕزگاری بووبوو، كارەساتێكی گەورەبوو. وولاتی ئەمریكا كەوتە ژێر دەسەڵاتی كەسێكەوە كە ئەزموونێكی پێویستی نەبوو، هۆكار و پێداویستیەكانی بۆ فەراهەم نەكرابوون و لەڕاستیدا نەیدەتوانی شوێنی ((لینكلن)) بگرێتەوە و بەتایبەتی لەم ساتەدا كە [دەبوو ئەو ئەركە گەورەیەی كە پێی سپێرراوە] وەك بژانەوەی وولات، قەرەبووكردنەوەی زیانەكانی شەڕ و درووستكردنی هەماهەنگی نێوان خەڵكی ویلایەتەكان بەباشی جێبەجێ بكات، شەڕی ناوخۆ بۆ ئەمریكا چەند ئەنجامێكی لێكەوتەوە كە هەندێكیان بەسوود و هەندێكی دیكەشیان زیانبار بوون، لەلایەكەوە شەڕ یەكیەتی و ڕێككەوتنێكی بتەوی درووست كرد، لەو لاشەوە كۆمەڵێك گیر و گرفتی كۆمەڵایەتی و ئابووری زۆری بەدوای خۆیدا هێنا كە پێویستی بەسەركردایەتیەكی لێهاتوو و كارامە دەبوو بۆ ئەوەی ئەم برینانەسارێژ بكات و شێوەیەكی واقیعی بەڕاگەیاندنی ئازادی كۆیلەكان بدات.

## ئازادی و سەر لەنوێ بونیادنانەوە

دەورەی دوانزە ساڵەی پاش شەڕی ناوخۆ بەسەردەمی تازە بوونیادنانەوە ناو براوە. ئامانج و تێكۆشانی دەوڵەتی فیدراڵ لەم ماوەیەدا چەسپاندنی مافی سیاسی ڕەشەكان و ڕووبەڕوو بوونەوەی گیروگرفتەكانی سەردەمی كۆیلایەتی بوو. بڕگەی سیانزەی قانوونی ئەساسی لە ڕووی یاساییەوە ڕەشەكانی وەك كەسێكی ئازاد پێناسە كرد، لەماوەی كەمتر لەپێنج مانگدا بڕگەكانی چواردە و پانزەی قانوونی ئەساسی دەركان و دانیان پێدا نرا. بەپێی ئەو بڕگانە ڕەشەكان مافی هاوڵاتیەكی (پەنابەر) تەواو، مافی یەكسانی و سیاسی، مافی دەنگدان و بەشداریكردن لە هەڵبژاردنیان هەیە. بۆ چەسپاندنی ئەم مافە دەوڵەتی فیدراڵی باروودۆخی سەربازی لەویلایەتەكانی باشوور ڕاگەیاند. ئەم ویلایەتانە دابەشكران بەسەر پێنج ناوچەی سەربازیدا و فەرماندە سەربازیەكانیش لەلایەن كۆنگرێسەوە ئەركی بەدوادا چوونی بارووددۆخی ژیانی ڕەشەكانیان پێ سپێررا. دەست بەسەرا گرتنی سەربازی باشوور تاساڵی ١٨٧٧كەواتە درێژەی كێشاو بۆ چەسپاندنی مافی سیاسی ڕەشەكان، ڕاكێشانی ئەنجوومەنی ویلایەتەكانی بۆ دەركردنی بڕگەكانی قانونی ئەساسی، پشتگیری و هاندانی ڕەشپێستەكان بۆ بەشداریكردن لەكاروباری هەڵبژاردن و یارمەتیدانیان بۆ دامەزراندنیان لەسەر پیشە جۆراوجۆرەكان بەرنامەیەكی ڕێك و پێك داڕێژرا. ئامانج لەو كۆنترۆڵە سیاسی و سوربازیەی لەباكوور بۆ

ماوەیەکی درێژخایەن لەباشووردا پەیڕەوی دەکرد ئەوەبوو، کەبەهەر شێوەیەك بێت-تەنانەت بەکارهێنانی زەبر و توندو تیژی-باشووریەکان بمرازیبوون لەسەر ئازادی و دانیان بەمافی سیاسی ڕەشەکان ناچار بکەن. مادەی چاکسازی ژمارە چواردەی قانونی ئەساسی، دەسەڵاتی ویلایەتەکانی بۆ دیاریکردنی پلەوپایەی هاوڵاتی بوون هەڵوەشاندەوە و ڕوونی کردەوە، کەهەموو ئەو کەسانە ی لەئەمریکادا لەدایك دەبن و یان ڕەگەزنامەی ئەو وولاتە دەردێنن، هەموو مافێکی هاوڵاتیەکی ئەو وولاتەیان پێدەرێت. مادەی چاکسازی ژمارە پانزەش مافی دەنگدان و بەشداریکردن لەهەڵبژاردنەکان بەڕەشەکان دەدات. یاسایەکی دیکە کەلە ساڵی ١٨٧٥ دەرکرا، جەخت لەسەر یەکسان بوونی ڕەش و سپی دەکاتەوە لەبەکارهێنانی ئامێرە گشتیەکان و بەشداریکردن لەشوێنە گشتیەکانی وەك شانۆگەری، ئۆتێل،هێڵەکانی ئاسن و پێداویستیەکانی دیکە. هەرچەندە دوای چەند ساڵ دادگای باڵا لەساڵی ١٨٨٣ ئەو یاسایەی بەپێچەوانەی قانوونی ئەساسی لێکدایەوە و ڕێگەی لەپراکتیککردنی یاساکە گرت، بەلام تازە ڕەشەکان لەسەر پیشە جۆراوجۆرەکان دامەزرابوون و دوای ماوەیەك چەند نوێنەرێکی خۆیان ڕەوانەی کۆنگرێس کرد، هەڵبەت هەمو ئەو نوێنەرانە هۆشمەند و دانانە بوون و هەندێ جار دەبوونە گاڵتەجاڕی دەستی ژمارەیەك کەسی تاڵانکەر و گەندەڵ. چونکە ماوە حکومەتی سەربازی لەویلایەتەکانی باشووردا لەڕووی ئیداریەوە گەندەڵیەکی زۆری تێدا دەکرا و کۆمەڵێك لەسپی پێستانی باکوور و باشوور دەرفەتێکی لەباریان لەو بارودۆخە بێ سەرو بەرەی پاش شەڕەکە بۆ پڕکردنی باخەڵی خۆیان قۆستەوە و دەستیان بەکارە ئەشیاوەکانی خۆیان کرد. لەژێر کاریگەری وەها بارودۆخێکدا، سەردەمی پاش شەڕی ناوخۆ، ئاشتی و ئارامیەکی وەهای لەنێوان ڕەشەکان و سپیەکاندا نەهێنایە ئاراوە کەشایەنی باسکردن بێت. ڕق و قین، نیگەرانی و دوژاندنی شەڕ، خەلکی ویلایەتەکانی باشووری لەئامانجی باکووریەکان بەد گومان کردبوو. سیاسەتی باکوریش نەیتوانی چارەسەرێك بۆ ئەو ئالۆزیە بدۆزێتەوە. بەرنامەی تازە بوونیادنانەوە و بووژانەوەی باشوور بەشێوەیەکی گشتی شکستی خوارد. لەجیاتی ڕزگاربوونی باشوور لەو گومان و دڕدۆنگیەی کە دانیشتوانەکەی دژ بە ڕەشەکان هەیانبوو، ئەوانی بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی و کردەوەی ڕەگەز پەرستانە دژ بەڕەشەکان زیاتر هان داو، لەبری بەرقەرارکردنی سیستەمی دوو حیزبی و بەدگومانیان بۆ ئەو کۆماریخوازیانەی کەبووبوونە مایەی شکست خواردنی ویلایەتەکانی باشوور، ئەوانی بەرەو تەشکیلاتی محافظەکارانەی حیزی پەلکێش کرد، حیزبی دیموکراتی باشوور لە جیابوونەوەی سیاسی، ڕق و کین بەرامبەر ئەو

گۆڕانکاریانەی کە باکووریەکان هێنابویانە کایە، دەمارگیری دژ بەڕەشەکان رێگایەکی بەتەواوەتی جیاوازی گرتەبەر.

مافی ئابووری ڕەشەکان دەربارەی مافی خاوەنداریەتی کە لەسەرەکیترین مەسەلەکانی باشوور بوو بەتەواوەتی پشت گوێخراو هیچ جۆرە گرنگیەکی پێنەدا.زۆربەی کۆیلەکان ڕویان لەسیستەمی بەکرێ گرتن کرد، بۆنەوە لەبەرامبەر کرێیەکی دیاریکراو لەنێو مولکی خەلکیدا نیش بکەن یان پارچە زەویەك بەکرێ بگرن تیایدا خۆیان بە کشتوکالکردنەوە خەریك بکەن، بەلام ئەم شێوازەش دەردی ڕەشەکانی دەوا نەکرد، چونکە نرخی کرێی زەوی و ئامێرەکانی کارکردن هەندێ جار ئەوەندە گران بوو کە نەیاندەتوانی بەفرۆشتنی بەرهەمەکەیان کرێی زەویەکە بۆخاوەن زەویەکە بگێڕنەوە. لەسەردەمی حکومەتی ((جەکسۆن))دا کەخۆی لەدیموکراتەکانی باشوور بوو، سیاسەتێکی نەرمتر بەرامبەر بەباشووریەکان گیرایەبەر. ئەو ویلایەتانەی کە خاوەن مولك و کۆیلەدارەکانی لەبەرد ردوو یان خۆیان سەرزەنشت دەکرد و پەشیمان دەبوونەوە لەیەکیەتی فیدرالیدا وەردەگیران و هیچ پرسیارێکی دەربارەی ڕەشەکان نەدەخرایە ڕوو. لەڕاستیدا کاروباری ڕەشەکان خرایە ئەستۆی ویلایەتەکان.

پلانی بووژانەوەی باشوور و کشتنی هێزە سەربازیەکانی باکوور بۆ چەسپاندنی مافی ڕەشەکان سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. هەرچەندە ڕەشەکان ئازادی خۆیان بەدەستهێنایەوە، بەلام مەسەلەی ناکۆکی نەژادی هەروەکو خۆی مایەوە. لەڕووی کۆمەلایەتیشەوە ئەو بابەتەی کەباس و خواسی لەسەر دەکرا، بریتی بوو لەوەی کەئایا کۆیلەی پێشوو دەبوو وەك کەسێکی یەکسان لەگەل سپی پێستێك لەکۆمەلگەدا وەربگیرێت و یان کەسێك بێت کەلەمافە کۆمەلایەتیەکان بێبەش بکرێت. ئامانجی سیاسی دەولەتی فیدرالی پشتگیری کردنی ڕەشەکان بوو بۆ چەسپاندنی مافی سیاسیان، نەك پەرەپێدانی مافی کۆمەلایەتیان ـ کەلەوانەیە رزی بوون لەسەر ئەم گریمانەیە بۆ باکووریەکانیش زۆر ئەستەم بێت. یەکێکی تر لەچالاکیە گرنگەکانی ئەم سەردەمە بریتی بوو لەپەرەپێدانی قوتابخانە دەولەتیەکان لەسەرتا سەری ویلایەتەکانی باشووردا، کەتا پێش شەڕی ناوخۆش ئەم قوتابخانانە زۆر دەگمەن بوون، فێرکردن زۆرجار بەشێوەیەکی تایبەتی ئەنجام دەدرا و تەنها بنەمالە خۆشگوزەرانەکان سوودیان لێوەردەگرت. لەم سەردەمەدا قوتابخانەی تایبەت بەڕەشەکان کرانەوە کەیارمەتی دەرێکی باش بوو بۆ پەرەپێدانی فێرکردن و هونەری و پیشەیی و بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندەواری لەنێوان نەژادی ڕەشدا، بەلام بەهیچ شێوەیەك هەولی تێکەلکردنی هەردوو نەژادەکە لەئارادا نەبوو.

بەشێوەیەکی گشتی هەرچەندە مەسەلەی ڕەشەکان لەرووی یاسایی یەوە چارەسەرکرا ـ بەڵام لەرووی ناکاری و کۆمەڵایەتیەوە لەشێوەی گرفتێکی گەورەی کۆمەڵگەی ئەمریکادا دەرکەوت. سیستەمی کۆیلەداری سڕایەوە، بەلام دڕدۆنگی و دەمارگیری سپی پێست دژ بەڕەشەکان هەر مایەوە، لەویلایەتەکانی باشووردا دامەزراندنی چەند ئەنجوومەنێکی نهێنی نەژاد پەرستانەی وەك ((کولکس کلان))ی تێکەوتەوە.

ئەم ئەنجوومەنە نهێنیە بەمەبەستی تۆقاندن و کوشتنی ڕەشەکان، هەروەها ئەو سپی پێستانەی کەکۆیلەکانی پێشوویان بۆ بەدەستهێنانی مافی سیاسی خۆیان هان دەدا، دامەزرا. ئەم گروپە دەمارگیرە، بەمەبەستی ترساندن و تۆقاندنی ئەو ڕەشە پێشینانەی کەنەزان و نەخوێندەوار بوون جلوبەرگێکی تایبەتیان کە دووقۆڵی بەرینی هەبوو ـ دەمامکێکیش کەتەنها سێ کونی تێکرابوو بۆ بینین و هەناسەدان ـ لەبەر دەکراو زەندەقیان دەبردن. چالاکیەکانی گروپی دژە نەژادی ((کلان)) پاش کۆتایی هاتنی حکومەتی سەربازی لەباشوور، لە (١٨٧٧) بەرادەیەکی زۆر زیادی کرد، بۆماوەیەکی دوور و درێژیش کردەوەکانی ئەم گروپە دژ بەڕەشەکان هەر بەردەوام بوو.

تێکەڵکردنی نەژادی، لەژینگەیەکی پڕ لەدووڕەلی و دەمارگیریە نەژادیەکاندا، غەیرە مومکن بوو. بیروڕای گشتی، پرۆسەی هاوسەرگیری نێوان هەردوو نەژادەکەی ڕتکردەوە. بەرواڵەت ڕەشەکان خاوەنی مافی دەنگدان بوون، بەڵام ئەنجومەنە مەحەلیەکان بە زیاتر کردنی مەرجە قورسەکانی وەك دانی باج و باجی تایبەت بەهەڵبژاردن، تاقیکردنەوەی ئاستی زیرەکی و خوێندەواری، بەئاشکرا کۆسپێکی نێجگار گەورەی لەبەرامبەر بەشداری کردنی ڕەشەکان لەدەنگداندا درووست کرد. ئەگەریش بەڕێککەوت ڕەش پێستێك هەموو ئەو مەرجانەی تێدا بووایە، تاوەکو دەگەشتە بەردەم سندووقەکانی دەنگدان، دەبوو کیانی خۆی بخاتە مەترسییەکی گەورەوە. لەدەستی بەناو قوڕگی شێران کرد. ئەگەر ڕووبەڕوی ستەم و ناعەدالەتی دەبوویەوە دەیتوانی سکاڵای خۆی بەرز بکاتەوە، بەڵام دادوەرەکان لەسپی پێستە دەمارگیرەکان بوون، لەبەرامبەر تاوانبارە ڕەش پێستەکاندا توندو تیژو لەگەڵ تاوانبارە سپی پێستەکاندا بەو پەڕی نەرم و نیانی هەڵسەکەوتیان دەکرد. منداڵە ڕەش پێستەکان نیاندەتوانی پێ بخەنە ناو قوتابخانەی سپی پێستەکانەوە و تەنانەت لەیەك کڵێسەشدا نەیاندەتوانی لەگەڵ سپیەکاندا نزا بکەن. هۆکارەکانی سەفەرکردن و گواستنەوەیان جودا بوو. لەزۆربەی شارەکاندا تەنها گەڕەکە ڕەش نشینەکان تەنگ و پیس و قەرەبالغ بوون. لەتەنیشت خانوە بچوکەکانیاندا چەندەها

بنکەی بەد ڕەوشتی دروست کرابوون. لەڕووی بەدەستهێنانی پیشەو شارەزاییەوە پێبشکرابوون. بێکاری و هەژاری مەترسیەکی گەورەی لەسەر ژیانیان درووست کردبوو، ڕەگەز پەرستی تەنانەت پاش مردنیش لەکۆڵیان نەدەبوویەوە، چونکە گۆڕستانەکانیشیان جیاکرابوونەوە.ئەم بڕودۆخە بەئاشکرا بەو پەڕی توندوتیژیەوە لەباشووردا پەیڕەو دەکرا. بەڵام ڕەشەکان لەویلایەتەکانی باکوریش هەڵسوکەوتێکی چاکتر و شیاوتران لەباشوور لەگەڵ نەدەکرا و مەرجەکانی جیاوازی ڕەش و سپی و خەسڵەتەکانی نێوانیان وەك ئاینێکی دانپێدا نراو لەکۆمەڵگەدا چەسپابوو. لەڕاسیدا تاناوەڕاستەکانی سەدەی بیست شوێنەوارەکانی ئەو جیاوازیە کۆمەلآیەتیە، لێکۆڵینەوە و لێ پرسینەوەیەکی جدی لەگەڵدا نەکرا. لەساڵی ١٩٥٤ دادگای باڵای وولات ئەشیکردنەوەی بڕگەی چواردەیەمی قانونی ئەساسیدا فەرمانی تێکەڵکردنی نەژادی لەنێو قوتابخانەکاندا دەرکرد. زنجیرە یاسایەکی چاکسازیش لەپێناو دانان بەمافی شارستانی ڕەشەکان و یەکسانییان لەڕووی فێرکردن، پۆشاك، بەدەست هێنانی پیشە و شارەزاییەوە لەساڵەکانی ١٩٦٠دا دەرکران و جێبەجێکران و ئەمریکا چەند هەنگاوێك لەڕووی یەکسانی نەژادیەوە هاتە پێشەوە: هەرچەندە بەتەواوەتی پراکتیککردنی ئەم یاسایانە پێویستی بەبارودۆخ و ماوەیەکی پێویست هەبوو.

ویلیام للوید کاریسۆن

**کاریگەری شەڕی ناوخۆ لەسەر شاری ئەتلانتدا**

**پەرەسەندنی پیشەسازی لە باکوور**

بازاڕی فرۆشتنی کۆیله

کۆمەڵێك له کۆیلەکان لەناو هەواڵی خاوەنەکانیان

## بەشی شەشەم:

# ئەمریکای پیشەسازی

ئەمریکای پاش شەڕی ناوخۆ، کۆمەڵێك گۆڕانکاری گەورەی لەگەڵ خۆی هێنا. لەماوەی نێوان شەڕی ناوخۆ و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، سەرمایەداری پیشەسازی گۆڕانی بەسەردا هات و کۆمەڵگەی نوێی ئەمریکا هاتە دامەزراندن. گرنگترین ئەو گۆڕانکاریان، دروستکردنی کارگە مەحەلیەکان و کۆمپانیا پشك دارەکان بوو کەلە سەرمەکایەیەکی زۆرەوە وردە وردە بازرگانیە مەحەلیەکان و سەرمایە کچکەکانیان لەنێو خۆیاندا تواندەوە. مۆنۆتۆڵ و سەنتەریزمی [سەرمایە] شوێنی کێبڕکێی لەئابووری ئازاددا گرتەوە، بەرژەوەندی سەرمایەدارەکان و بازرگانیە گەورەکان لەگەڵ بەرژەوەندیە سیاسیەکاندا تێك ئاڵان و بەرەبەرە دەسەڵاتی سیاسی لەژێر کاریگەری دەسەڵاتی ئابووریدا کەلەپچە کرا و بەسەرکەوتنی ((سەرمایەداری سیاسی)) کۆتایی پێهات و بەهەمان ئەندازەش کاریگەری لەسەر ژیانی کۆمەڵگەی ئەمریکی دروستکرد. ژیانی کشتوکاڵی و نێو گوندەکان خۆی بەژیانی شارنشینیدا، پەرەسەندنی ڕێگاکانی هاتووچۆ، فراوانکردنی هێڵەکانی ئاسن و تەلەگراف و تەلەفۆن، بەرێکەوتنی شاڵاوی کۆچکردن، لەکۆتاییشدا دەرکەوتنی ئەمریکا وەك هێزێکی گەورەی جیهانی ـ هەموو ئەو گۆڕانکاریانە بوون کەپاش شەڕی ناوخۆ لەماوەیەکی کەمتر لە پەنجا ساڵدا سەریان هەڵدا. سەرکەوتنی ئامێر و پیشەسازی لەگەڵ هەموو ئەو داهێنانە هونەریانە، هۆکاری سەرەکی دامەزراندنی ئەم هێزە گەورەیەبوو.

خێرایی گەشەکردنی ئابووری ئەمریکا لەم ماوە کەمەدا، لەگەڵ هیچ وڵاتێکی دیکە ناتوانرێت بەراوورد بکرێت، ڕێژەی دانیشتوانی ئەمریکا سێ ئەوەندە زیادی کرد، ژمارەی کرێکاران گەیشتە پێنج ئەوەندە، سەرمایە گوزاری لەبواری پیشەسازیدا بوو بەبیست ئەوەندەی ساڵەکانی پێش شەڕی ناخۆ. پەرەسەندنی پیشەسازی ئەمریکا نێوان ساڵەکان ١٨٦٥ ـ ١٩٠٠ دەتوانرێت بەشۆڕشی ئابووری و سەرکەوتنی ڕژێمی سەرمایەداری لێك بدرێتەوە. هێڵەکانی ئاسن لەسی هەزار میلەوە گەیشتە سەدونەوەدوسێ هەزار میل. سەرمایەگۆزاری تایبەتی لەیەك ملیار دۆلارەوە بۆ بیست ئەوەندە زیادی کرد. دانیشتوانی ئەمریکاش لەبیست و سێ ملیۆنەوە بوون

بەحەفتاو پێنج ملیۆن کەس. ژمارەی کرێکاران لەیەك ملیۆن و سێ سەد هەزار کەسەوە گەیشتە پێنج ملیۆن، نرخی بەرووبوومی بەرهەمهێنراوی پیشەسازیش سێ ئەوەندەی جاران بەرز بویەوە.

تانزیکەی ساڵەکانی ١٨٨٠، کشتوکاڵ کردن بەسەرچاوەی سەرەکی سامانی نەتەوە دەژمێررا. لەساڵی ١٨٩٠دا، رێژەی بەرووبومی پیشەسازی زیاتر لەبەرهەمی کشتوکاڵی پەرەی سەند و، دوای دەساڵ نرخی بەرووبومی کارگەکان دوو ئەوەندەی بەرووبومی کشتوکاڵی بەرز بووەوە. بەپێی پێوەری جیهانی ئەم پێشکەوتنە زۆر خێرابوو، ئەمریکای لەروی نرخی بەرووبوومەکانی پیشەسازییەوە لەماوەی پەنجا ساڵدا ئەپلەی پێنجەمەوە گەیاندە پلەی یەکەم. هۆکاری سەرەکی ئەو گۆرانکارییەی کە بەرووی ئابوری و کۆمەڵایەتییەوە لەئەمریکادا روویاندا، بریتی بوو لەسیاسەتی دەوڵەتی کۆماریخوازی و ئەو سەرمایە گوزاریە گەورانەی کە دەخانە گەر. فراوانی سەرچاوە سرووشتیەکان و زیاد بوونی هێزی کارکەر بەهۆی کۆچکردنی ملیۆنەها ئەوروپی و ئاسیایی بەرەو ئەمریکا، زەمینەیەکی لەباری بۆ گەشەکردنی ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکان فەراهەم کردبوو. یەك لەسەر سێی سەرچاوەکانی ئاسن و دوولەسەر سێی مس و یەك لەسەر سێی کانەکانی سوریی جیهان لەزەویە بەپیتەکانی ئەمریکادا جێگیر بوو بوون و کانە فراوانەکانی خەڵوز و سەرچاوەکانی ئەوت لەگەڵ ناوچە سەوزەکان و زەویە بەپیتەکانی هەلومەرجێکی لەباریان [بۆ بەرەو پێش چوون و پێشکەوتنی ئەو وڵاتە] دەستەبەر کردبوو. لەماوەی نێوان ساڵەکان ١٨٦٥ ـ ١٩٠٠ زیاتر لەچوارده ملیۆن کۆچبەر روویان لەویلایەتە یەکگرتووەکان کرد، کەزۆربەیان لەشارەکاندا جێگیر دەبوون و لەکارگەکانیشدا وەك کرێکار دادەمەزران. سەرمایەدارەکان لەلایەن دەوڵەتەوە هان دەدران و پشتگیری دەکران، بەهۆی دانانی یاسا گومرگیەکانی وەك یاسا پێشنیازکراوەکەی ((مریل)) لەساڵی ١٨٦١ پلانەکانی ((مەك کنیلی)) لەساڵی ١٨٩٠، ((ویلسۆن ـ گورمان)) لە١٨٩٤و، ((دینگلی)) لە ١٨٩٧، باجێکی قورستر خرایە سەر بەرووبومی هاوردەی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بۆ ئەوەی کارگەکانی ناوخۆی وڵات لەکێبەرکێی وڵاتانی دەرەوە ئاسوودە بن و بەرهەمی پیشەسازی ساوای ئەو وڵاتە زیاتر پێبگات.

حیزبی کۆماریخواز پاش سەرکەوتنی لەشەری ناوخۆدا توانی بەسەر سیاسەتەکەی خۆیدا زاڵ بێت. ئامانجی گروپە دەسەڵاتدارەکانی حیزبی کۆماری خوازیش، کە حیزبی سەرمایە و سامان ناوبانگی دەرکرد، پەرەپێدانی کاروباری ئاووری بوو، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە گۆرانێك لە بونیادی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بکرێت. مەسەلەی رەشەکان پاش هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی بە

فەرامۆشی سپێرا و بۆ گەیشتن بەئامانجە ئابوورییەکان سوودێکی زۆریان لەو هەل و مەرجە وەرگرت لەشەڕی ناوخۆ هێنابوویە ئاراوە. دروستکردنی سیستەمێکی میللی بانکی، دانانی باجی گومرگی، فراوانکردنی ئیمکاناتی ئعتباری، پەرەپێدانی هێڵەکانی ئاسن و هۆیەکانی پەیوەندیکردن، هاندانی کۆچکردن بۆ دابین کردنی دەستی ئیش کەری پێویست و هەرزان و، دەستەبەرکردنی پێداویستی سەهل و ئاسان بۆ نیشتەجێ کردنی خەڵکی لەناوچەکانی ڕۆژئاوا بەدانانی یاسای ((هوم ستەد)) لەپێناو دابەشکردنی زەویەکان، بەرنامەی گشتی کاری کۆماریخوازەکان بوو. بیرۆکەی دروستکردنی بانکێك کەمەرکەزیەتێکی زیاتر و دەسەلاتێکی ئابووری فراوانتری هەبێت، لەساڵی ١٨٦٣ بەکردنەوەی بانکی مەرکەزی خرایە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە. تاپێش ئەم بەروارەش بارودۆخی بانکەکان لەو پەڕی ئاڵۆزیدا بوو. ئازادی بانکی تەنها مافی دەرکردنی دراو بوو، کەزۆر جاران لەهەموو مەرجێکی ئالەباردا و بەپێی پشتیوانی دارایی لەلایەن بانکە جۆراوجۆرەکانەوە ئەنجام دەدرا و تەزویرکردنی دراویش شتێکی ئاسایی بوو. ئەم هەنگاوەی دەوڵەتی کۆماریخوازی بۆ درووستکردنی بانکی مەرکەزی، کاریگەریەکی زۆری لەسەر کۆتایی هێنان بەو ئاڵۆزیە داراییە هەبوو هەروەها گەرەنتی کردنی سەرمایەی بانکی بەدەرکردنی یاسای بانك خرایە ئەستۆی دەوڵەتی فیدراڵی. ئەم هەنگاوە لە چەسپاندن و جێگیرکردنی مامەڵەی بانکی و دەستەبەرکردنی پاشەکەوتی پێویست بۆ سەرمایە گوزاری لەپێناو گەشەکردنی ئابووریدا بەهەنگاوێکی گرنگ و جەوهەری دەژمێررێت. تاریفەی گومرگی بۆ پشتیوانیکردن لەبەرهەمە پیشەسازیەکانی ناوەوەی وڵات، ئاسن، پۆڵا، خەڵوز، خوری، تەختە و ڕستن و چنینە جۆربەجۆرەکان ئاستەنگێکی گەورەی لەبەردەم بەروبوومی هاوردەدا دروست کرد. ڕێگا سەرتاسەریەکان، کەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای وڵاتی لە ساڵی ١٨٦٩دا پێکەوە دەبەستەوە، بەهۆی سەخاوەتی دەوڵەت و قەرزە جۆراوجۆرەکانەوە درایە بەدەست سەرمایە گوزارەکان. کۆنگرەی ئەمریکا کە لەژێر دەسەلاتی کۆماریخوازەکاندا بوو، بۆ دابینکردنی کرێکاری پێویست لەپێناو بەرەو پێش بردنی پیشەسازی وڵاتەکەی، بەدانانی چەند یاسایەکی ئاسانکاری پشتیوانیەکی زۆری لەکۆچکردن و کۆچبەران کرد. لەپێناو ئاوەدانکردنەوەی زەویەکانی ڕۆژئاوا، یاسای بەخشینی زەوی پوخت بۆ هەرتاکێکی ئەمریکی و کۆچبەرەکان بڕیاری لەسەر درا، کە پێی ئەو یاسایە هەر خێزانێکی دانیشتوی ئەمریکا بڕی سەدوشەست جریب زەوی بەبێ بەرامبەر لەو ناوچانە پێدەبەخشرا، بەمەرجێك کەلەو شوێنەدا نیشتەجێ ببێت و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ئاوەدانی بکاتەوە.

لەم سەردەمەدا چەندەها داهێنانی زانستی و هونەری ئەنجام دران، کە پێشکەوتنی پیشەسازی ئەمریکایان خێراتر کرد. تەلەگراف، کەلەساڵی ١٨٤٤ خرایە بەردەستی هاوڵاتیان، پاش شەڕی ناوخۆ وەك پێداویستیەکی سەرەکی سوودی لێوەر دەگیرا. ((گراهام بێل)) لەساڵی ١٨٧٦ توانی نامێری تەلەفۆن وەك هۆکارێکی گرنگی پەیوەندی کردنی نوێ نمایش بکات. گلۆپ و بەکارهێنانی هێزی کارەبا، کەکاریگەریەکی زۆری لەبەکارخستنی مەکینە پیشەسازیەکاندا هەبوو، داهێنانە هونەریەکان لەڕووی چاپکردنەوە، بەسوود وەرگرتن لەماتۆری کارەبایی گۆڕانێکی گەورەیان لەبواری چاپەمەنیەکاندا بەئەنجام گەیاند. پێشکەوتنی چاپەمەنی، ناساندن و نمایش کردنی کاڵا بازرگانیەکانی لەرێگەی پروپاگەندە و ریکلام کردنەوە لێکەوتەوە، کەئەمەش خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی گرنگی بەرقەرارکردنی پەیوەندی نێوان بەرهەمهێنەر و بەکار بەربوو.

ئەو پێشکەوتنە خێرایەی ئابووری ئەمریکا وگۆڕانی بۆ وولاتێکی پیشەسازی گەورە بەهۆی بارودۆخی تایبەتی ژینگەکەیەوە بوو، کەسەرکەتنی سیستەمی سەرمایەداری لەو وولاتەدا مسۆگەر کردبوو. سامانی سرووشتی فراوان و هەمەجۆر، سەرچاوەی هێزی مرۆیی و، سیستەمی سیاسی دەوڵەتی کۆماریخواز لەهاندانی سەرمایەگوزاری و باوەڕ بە ئابووری ئازاد لەخزمەتی بەرژەوەندی تایبەتیدا، بارودۆخ و دەرفەتێکی لەباریان بۆ نوێگەرانی دونیای پیشەسازی و بازرگانی رەخساند بوو، کە بەگرتنە بەری رێگای یاسایی یان نایاسایی، هێدی هێدی کۆنترۆڵی ئابووری وولاتەکەیان بگرنە دەست.

خاوەن کار و سەرمایەدارە نوێیەکان، دەسەڵاتیان لە کۆلکە بازرگان و خاوەن زەویەکان سەندەوە.کێبڕکێ ، کە بنچینەی ئابووری ئازادی پێك دەهێنا، بە چڕبوونەوەی دەسەڵاتی ئابووری و یەکریزی بەهێزی سەرمایەدارەکان گۆڕا و بۆ قۆرخکاری. چینی بازرگان، بە دەست بەسەراگرتنی هێڵەکانی ئاسن و هۆکارەکانی پەیوەندی کردن، دامەزراندنی چەندەها کۆمپانیای گەورەی بەرهەمهێنانی پۆڵا و پاڵاوتنی نەوت و کۆمپانیاکانی دیکەی بەرهەم هێنان، بەپشتیوانی دەوڵەت بەتەواوەتی کۆنترۆڵی ئابووری وڵاتی کرد. ئەنجامی هەموو ئەم گۆڕانکاریانەش، بریتی بوو لە درووستکردنی کۆمەڵگەیەکی پیشەسازی و پێشکەوتوو و خۆش گوزەران کەلەلایەکەوە فراوانبوونی دەسەڵاتی سەرمایەدارەکان، گیروگرفتی ئەمریکای شانشینی و بەکارهێنانی خێرای سەرچاوە سرووشتیەکانی بەدوادا هات و، لەلایەکی ترەوە لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا، سەرمایەی ئەمریکیەکانی بۆ کردنەوەی بازارە جیهانیەکان خستە گەڕ.

بەرەو پێش چوونی ئابووری ئەمریکا پاش شەڕی ناوخۆ، بەپاڵپشتی کردنی کۆماریخوازەکان لەسەرمایە گوزاری فراوان و بەربلاو، دەرفەتێکی گەورەی بۆ کۆمەڵێك ڕەخساند، کە بەسوود وەرگرتن لەسەرچاوە سرووشتیەکان، پێگەی سیاسی، دەست بلاوی حکومەت، سامانێکی زۆر پێکەوە بنێن و وەك یەکێك لەرابەرانی دەسەلاتداری ئەمریکا و فەرمان ڕەوایانی سەروەت و سامان خۆیان بنوێنن. ناوی کەسانێکی وەك ((ڤاندەر بیلت))، ((کارنگی))، ((ڕاکفلر)) و ((مۆرگان))، بوو بەهێمای دەسەلات و قۆرخکردن، بەدەست بەسەراگرتنی هێڵەکانی ئاسن، پیشەسازی پۆلا، نوت و بانکداری وولاتدا. ئەو سەرمایەدارە گەورانە لەکاتی شەڕی ناوخۆ تاکۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دەسەلاتیان بەسەر دونیای پیشەسازی و بازرگانی ئەمریکادا گرت و بەکۆت و بەندە سیاسیەکان، لێهاتوویی و دووربینی و لەناوبردنی ڕکە بەرەکانیان هەندێك جار بەشێوەیەکی ناجوامێرانە، توانیان نازناوی فەرمانڕەوایانی سەروەت و دەسەلاتدارانی وولات لەگەردن کەن.

یەکێك لەهۆکارە سەرەکیەکانی پێشکەوتنی پیشەسازی، ئەو گۆڕانکاریە بوو کەلەبواری پەیوەندیەکاندا سەری هەلدا. سەرکەوتوویی بازرگانی کەنالی ئێریە کەهەرێمەکانی ناوەڕاستی ئەمریکای لەڕێگەی دەریاچە بنچینەکانەوە بەنیۆ یۆرك و ئۆقیانووسی ئەتلەسیەوە دەبەستەوە و پەرەپێدانی کەشتیوانی بەسوود وەرگرتن لەئامێری هەلمی لەسالەکانی ١٨٢٠دا، دەریخست کەهێلەکانی پەیوەندی نێوان ناوچەکان، یەکێکن لەو هۆکارە سەرەکیانەی پێشکەوتنی کاروباری ئابووری ئەو وولاتە. هێلەکانی ئاسن لەسالەکان ١٨٣٠، بوونە هۆی نزیککردنەوەی ناوچەکان لەیەکترو، پاش شەڕی ناوخۆ پێشکەوتنێکی بەرچاویان بەخۆوە بینی، بەڕاددەیەك کەئەم هێلانە هەموو ناوچە گرنگەکانی ئەمریکایان لە ڕۆژهەلاتەوە بەناوەڕاست و ڕۆژئاواوە دەبەستەوە. پەرەسەندنی هێلەکانی پەیوەندی بەلەبەرچاو گرتنی ڕووبەری ویلایەتە یەکگرتووەکان کەلە ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاوا زیاتر لەپێنج هەزار کیلۆمەتر پانتایی هەیە و بەدرێژایی سێ هەزار کیلۆمەتر لەباکوورەوە بۆ باشوور درێژ دەبویەوە، بەئاشکرا دەردەکەوێت. هێلەکانی ئاسن پشکێکی وەها گەورە و گرنگیان لەگواستنەوەی کالاو بەرقەرارکردنی پەیوەندی ناوچەکاندا هەبوو، کەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمیان بەسەردەمی هێلی ئاسن یان بە قسەی ((مارك تواین))ی نوسەری ئەمریکی بە(سەردەمی تەقەتەق)ناوبردووە. لەنێوان سالەکانی ١٨٣٠ ـ ١٨٦٠، تێکڕای هێلەکانی ئاسنی ویلایەتە یەکگرتوودکان لەسێ هەزار میل تێپەڕی نەدەکرد. بەلام لەسالەکانی ١٨٦٠ ـ ١٨٩٠ کۆی درێژی ئەم هێلانە گەیشتە نزیکەی دووسەد هەزار میل.

واتەدرێژترین هێڵی ئاسن کەزیاتر لە لە ٤٠٪ی تێکڕای هێڵەکانی ئاسنی گیتی پێك دەهێنا، ڕاکێشرا. سەرچاوە سرووشتیەکان کەبەشێوەیەکی بەربڵاو لەناوچەدوورەکانی ئەو سرووشتە فراوانەدا ئەفرێندرابوون، بەهۆی هێڵەکانی ئاسنەوە بەناوەندەکانی بەرهەمهێنانەوە بەسترانەوە. بوونی کانەکانی خەڵوز، مس، سورب و کانزاکانی دیکە یارمەتی دەرێکی باش بوون لەپەرەسەندنی تواندنەوەی کارگەکانی ئاسن و پۆڵا و پیشەسازیە قورسەکانی دیکەدا. سەرمایە گوزاری بۆ فراوانکردنی هێڵەکانی ئاسن و کڕین و فرۆشتنی پشکەکان ڕەواجی پەیدا کرد. لەو کەسانەی کە ڕۆڵێکی گەورەیان لەسەرمایە گوزاری هێڵەکانی ئاسندا گێڕا، دەتوانین ناوی ((ڤاندەر بیلت)) بهێنین، کەپێشتر لەسەردەمی شەڕی ناوخۆدا سەرمایەیەکی زۆریان لەڕێگەی پەرەپێدانی کەشتیوانی لە ڕووباری می سی سی پیدا کۆکردبوویەوە. ئەو توانی بەوپەڕی زیرەکی و هوشیاریەوە ڕکەبەرەکانی خۆی وەلاوە بنێت و ئەرکی دروستکردنی هێڵی ئاسنی ناوەندی نێوان نیویۆرك و شیکاگۆ بگرێتە ئەستۆ. دروستکردنی ئەم هێڵە بەگرنگترین خاڵی سەرکەوتنی ((بیلت)) دەژمێررێت، چونکە لەرێگەی ئەم پرۆژەیەوە توانی تێکڕای کانەکانی خەڵوزی ئەو ناوچانە و هاتووچۆی نێوانیان بۆخۆی کۆنترۆڵ بکات. ((ڤاندەر بیلت)) بەو سوود و قازانجە زۆرەی کەلەم ڕێگایەوە کۆی کردەوە، توانی یەکەمین ئیمپراتوریەتی گەورەی هێڵی ئاسن دابمەزرێنێت، ڕکا بەری هێنا ئاسنی ناوەندی، سێ سەرمایەداری دیکە بوون کە هێڵکانی ئاسنیان تاناوچەکانی ڕۆژئاوا پەرەپێدا. پەرەپێدانی هێڵی ئاسنی پاسیفیك کەهێڵێکی دیکەی پەیوەندی کردنی نێوان ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوابوو. گرنگی دان و دەست بڵاوی دەوڵەتی فیدراڵ و حکومەتی ویلایەتەکان هۆکارێکی سەرەکی ئەم بەرەو پێشەوە چوونە بوو. لەنێوان ساڵەکان ١٨٥٠ ـ ١٨٧١ کۆمپانیا تایبەتەکانی هێڵەکانی ئاسن زیاتر لەسەدوسی ملیۆن جریب زەویان بەخۆڕایی لەلایەن دەوڵەتەوە پێ بەخشرا و چل و نۆ ملیۆن جریبی دیکەشیان لە ویلایەتەکان وەرگرت. بەخشینی زەوی لەگەڵ قەرزی زۆر و زەمەندەی دەوڵەت بە ئارەزووی خودی کەسەکان بوو. لەهەنگاوێکی دیکەدا لەلایەن دەوڵەت و حکومەتی ویلایەتەکانەوە نزیکەی سەدوپەنجا ملیۆن دۆلار قەرزی نەقدی درا بەسەرمایەدارەکان. هەمان ئەندازەش بەڵگەی متمانە لەخاوەنی هێڵەکانی ئاسن کرا. بەشێوەیەکی گشتی یارمەتیەکانی حکومەت و قەرز و پێشکەشکردنی داریی ـ وەك بەخشینی زەوی ـ نزیکەی لە ٦٠٪ی تێکڕای نرخی تێچوونی هێڵەکانی ئاسنی ئەمریکای دابین کرد. پلان و نەخشەی ڕووداو خوازانە، کێشمەکێشی زیرەکانە و، ڕووبەڕووبوونەوەی ئاناساییانە، سوود و

قازانجێکی زۆری بەنسیبی سەرمایەدارە زرنگەکانی هێڵەکان ئاسن کرد. ئەو ڕوویەڕووبونەوە و فێڵ و تەڵەکەبازیانە، وێنەیەك بوو لەسیفات و ڕەوشتە باڵاکانی ئەو سەردەمە.

کۆکردنەوەی ماڵ و سامان وەك ئافاتێك کەوتبوویە گیانیانەوە و نەتەنها خاوەن هێڵەکانی ئاسن بەڵکو ئەو کەسانەشی کەبە قۆرخکردنی زەوی و زار و دەرهێنانی کانەکان و دامەزراوە پیشەسازیەکانەوە سەر قاڵ بوون ڕوویەڕووی یەکتر کردەوە. ئەو کاتەی کەبەرژەوەندیان وای دەخواست ـ واتە پاش ساڵەکانی قەیرانی ئابووری ۱۸۷۰ و سەرهەڵدانی گرفتی کرێکاری ـ بەچڕکردنەوەی سەرمایەکانیان و تێکهەڵکێش کردنی دامەزراوە پیشەسازیەکان شوێن پێی خۆیان بەهێز و پتەو کرد. یاساش پشتیوانیەکی تەواوی لێکردن.

بڕگەی چواردەیەمی قانوونی ئەساسی پاش ئازادی ڕەشەکان بڕیارێکی دەرکرد، کە هیچ ویلایەتێك نەتوانێت بەبێ ئەمری یاسا پلەوپایە و مافی کۆمەڵایەتی تاکەکانی نێو ویلایەت یەکگرتووەکان سنووردار بکات و هیچ کەسێکیش لەمافی دان پێدانراوی تاك واتە ژیان، ئازادی و خاوەنداری بێبەش نەکرێت. ئەم بڕگە چاکسازییە لەساڵی ۱۸۸٦بەدواوە سنوورێکی زیاتر و فراوانتری گرتەوە، واتە ئەم یاسایە تەنها شمولی تاکەکانی نەدەکرد بەڵکو دادگای باڵا، ئەم یاسایەی بەسەر کۆمپانیا گەورە پیشەسازیەکانیشدا جێبەجێ دەکرد. بەهۆی ئەم یاسایەوە مافی کۆمپانیا و سەرمایەدارەکان زیاتر چەسپێنراو مافی خاوەنداریەتی خاوەن کۆمپانیاکان لەبەرامبەر هەر جۆرە دەست تێوەردانێکی ویلایەتەکان پشتیوانی لێکراو دادگای باڵا لەم ساڵانەدا وەك بنکەیەکی بەرگری لەسەرمایەدارەکان کاری دەکرد. هەر جۆرە هەوڵدانێکی دەستەی یاسادانان لەپێناو نوسینەوەی یاساکان چاکسازی کۆمەڵایەتی، یان چاککردنی کرێی ڕۆژانە و ماوەی کارکردنی کرێکاران بە چەکی ((پێچەوانە))لەگەڵ قانونی ئەساسی و بڕگەی چواردەیەم پووچەڵ کرایەوە.

ئەو زەمینەیەی کەلەلایەن دەوڵەتی کۆماریخواز و دەزگای دادوەریەوە فەراهەم کرابوو، بەپەرەسەندنی هێڵەکانی ئاسن بۆ پیشەسازی گەورەی دروستکردنی پۆڵا، بووە هۆی ئەوەی کە ((ئەندرۆ کارنگی))یش وەك یەکێکی تر لەفەرمانڕەوایانی سەروەت خۆی بە جیهان بناسێنێت. کارنگی لەکاتی شەڕی ناوخۆدا بەدروستکردنی کۆمپانیایەکی حەوجۆش ڕێژی و فرۆشتنی پێداویستیەکانی شەڕ سەرمایەیەکی فراوانی پێکەوەنا.

توانا و لێهاتوویی ناوبراو لەڕێکخستن و بەڕێوەبردندا، سوود وەرگرتن لەداهێنانە زانستیەکان لەبواری بەرهەمهێنان و لەگەڵ پەرەپێدانی هێڵەکانی ئاسن کاریگەریەکی زۆری لەسەر بەرەو پێش

بردن و پێشکەوتنی پیشەسازی پۆڵا هەبوو. ((کارنگی))بەلەناوبردنی ڕکەبەرەکانی و فیداکردنی هاوڕێکانی کەمزەمینەی سەرکەوتنی ئەویان دەستە بەرکردبوو، چەندەها کۆمپانیای جۆراوجۆری کڕی و لەساڵی ١٨٩٢ توانی کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنانی پۆڵا بەتەرخانکردنی ملیۆنەها دۆلار و سەرمایە بونیاد بنێت. دامەزراوەکانی ((کارنگی)) تەنها بریتی نەبوون لەکارگە گەورەکانی دروستکردنی پۆڵا، بەڵکو چەندەها دامەزراوەی دیکەی وەك بەرهەمهێنانی خەڵوزی کووك و کانەکانی خەڵوز و ئاسنیشی لەناوچە جۆراوجۆرەکاندا دەگرتەوە و کۆنترۆڵی تەواوی کارنگی بەسەر دونیای پیشەسازی و بەرهەمهێنانی پۆڵای ئەمریکا دەسەڵاتێکی بێ وێنەی بەناوبراو بەخشی.

هەربەو شێوەیەی کارنگی نازناوی سوڵتانی پۆڵای پێبەخشرا بوو، ((راکفلر)) یش توانیبووی پیشەسازی نەوتی تێکڕای ویلایەتە یەگکرتووەکان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. دۆزینەوەی نەوت لەساڵی ١٨٥٩ لە پەنسیلڤانیا، ئەمریکای کردە خاوەنی یەکێك لەبەناوبانگترین و بەنرخترین سەرچاوە سروشتیەکانی جیهان ((ڕاکفلر))، ڕاستەوخۆ بەرەزامەندی پاڵاوگەیەك و چاودێریکردنی کاروباری نەوت و ناردنی بۆ شوێنە جیاجیاکان توانی ببێتە یەکێك لەسەرکەوتووترین سەرمایەدارەکانی ئەو سەردەمە. لەسەرەتادا، دۆزینەوەی نەوت پێویستی بە چانسێکی زۆر هەبوو. مەرجەکانی بەرهەمهێنان پێشبینی نەکراو متمانەی پێنەدرا و بوون و زیاتر هەموو شتێك لەڕووی چیەتی نەوتەکە و کار و کارلێکردنەکانیەوە گرفتیان ڕووبەڕوو دەبوویەوە. چونکە نەوتی خاو لەقۆناغی یەکەمدا بەکار نەدەهێنرا و بەرهەمهێنەرەکانی ناچار بوون بۆ پاڵاوگەکان بیگوازنەوە.

((ڕاکفلر)) بۆی دەرکەوت کەبە کۆنترۆڵکردنی حۆکارەکانی گواستنەوە، نەوتی خاو دروستکردنی پاڵاوگەی پێشکەوتوو دەتوانێت هەموو بەرهەمهێنەرە سەربەخۆکان بۆ لای خۆی رابکێشێت. بەو سەرمایە زۆرەی کەدوای شەڕی ناوخۆ پێکەوەی نابوو، بەخەرجکردنی بڕی یەك ملیۆن دۆلار لەساڵی ١٨٧٠ کۆمپانیای ((ستاندارد ئۆیڵ ئۆهایۆ))ی دروستکرد، ئەم کۆمپانیایە بەکرنگترین دەزگای پاڵاوتنی نەوت دەژمێررا لەو کیشوەرەدا. کاری بەرهەمهێنانی نەوت لەپەنسیلڤانیا ئەنجام دەدرا، بەڵام بۆ پاڵفتە کردنی دەگوازرایەوە بۆ ئۆهایۆ. بنکەکانی بەرهەمهێنان و پاڵاوتن لەگەڵ هێڵەکانی ئاسندا پێکەوە بەسترانەوە، کێبەرکێ و ململانێی نێوان خاوەن هێڵەکانی ئاسن پشێویەکی زۆری لەنێو بازاڕەکانی نایەوە. ((ڕاکفلر)) ئەم هەلەی بۆ خۆی قۆستەوە و هەموویانی بەردایە گیانی یەکتر و ووردەووردە دەسەڵاتی بەسەر هێڵەکانی ئاسنی

ڕکبەریەکانیدا گرت، یەکیەتیەکی لێپێك هێنان. بەرهەمهێنەر و خاوەن پاڵاوگە سەربەخۆکان کەبەهۆی ململانێی نێوانیانەوە، دووبەرەکیان تێکەوتبوو هەروەها لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی شان بەشانی کۆمپانیای ((ئستاندارد)) هەنگاو بنێن، لەناو سکی ئەو کۆمپانیایەدا توانەوە. ((ڕاکفلر)) لەم بارەیەوە دەڵێ شێوازی پاڵفتەکردنی نەوت کارێکی زۆر گران نەبوو و، لەبەر ئەوە هەموو جۆرە خەڵکێك هەر ((قەسابەوە بیگرە تا نانەواو مۆم دروستکەر بەم کارەوە سەرقاڵ بوون))، ئەم کەسە ((نەشارەزایانە)) بەرهەمیان زیاد لەداوا خواست خستە بازاڕەوە و لەئەنجامدا نرخی بەرهەمەکان داشکێنران. لەو کاتەدا ((ڕاکفلر)) بە ((پێویست و زەروری)) زانی کەبازاری نەوت پەرە پێبدات و شێوازی پاڵاوتنەکەشی چاکتر بکات، بۆ ئەم مەبەستە ((لەپێناو ڕەونەق و برەودانی زیاتری لایەنی ئابووری هەموو پاڵاوگە بچووك و گەورەکانی)) کری و هەموبانی لەشێوەی دامەزراوەیەکی جێگیردا کۆکردەوە. لەو دەرامەتەی کە لەکۆمپانیای نەوتی نۆهایۆوە بەدەستی دەهێنا، چەندەها دامەزراوەی هاوشێوەی ئەو کۆمپانیایەی لە نیۆیۆرك و پەنسلڤانیا، فیلادلفیا و نیوجێرسی دروستکرد.

لەساڵی ١٨٨٢((ئستاندارد نۆیل))، بریتی بوو لەکۆمەڵگەیەك کە پێك دەهاتن لە چەند دامەزراوەیەك کە کاری داهێنان، پاڵاوتن، گواستنەوە و فرۆشتنی نەوتی تێدا ئەنجام دەدرا. بەپێی ڕێککەوتن نامەیەکی نهێنی تێکڕای پشکەکانی سی و نۆ کۆمپانیای جۆراوجۆر لەناو یەك تێهەڵکێش کران و دەستەیەکی بەڕێوەبردن کە ((ڕاکفلر))لەسەرووی هەموویانەوە بوو بڕیاری دامەزراندنی ((تراست)) ئستاندارد نۆیل یان پەسەند کرد. ((تراست)) لەکۆبوونەوەی چەند سەرمایەدارێك و دروستکردنی بەڕێوەبەرایەتیەکی مەرکەزی بەدەسەڵاتێکی مۆنۆپۆڵییەوە، بۆ کۆنترۆڵکردنی کاروباری کارگەکان پێك دەهات. لەساڵی ١٨٩٢ کاتێك کەدادگای باڵای نۆهایۆ دامەزراوەی ((تراست))ی بەدامەزراوەیەکی نایاسایی ناو برد ـ ڕاکفلر داهێنانێکی تازەی دۆزییەوە، واتە لەجیاتی کۆکردنەوەی چەند سەرمایەدارێك بۆ کۆنترۆڵکردنی کاروباری کۆمپانیا ـ بڕیاریدا کەبە کۆکردنەوەی چەند کۆمپانیایەك، سەنتراڵێکی یەکگرتووی ئابووری بۆ کاروباری تایبەت بەنەوت دابمەزرێنێت و پێش دەرکردنی بڕیاری دادگا واتە لەساڵی ١٨٨٩ ئەم دامەزراوەیەی لەنیوجێرسیدا جێگیر کرد. بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم کۆمپانیانە، بەڕێوەبەرایەتیەکی ناوەندی دامەزراو کۆنترۆڵکردنی کاروبارەکانی تایبەت بەنەوت لەلایەن ((ڕاکفلر))ەوە هەر بەردەوام بوو. ناوبراو توانی لەماوەی دەساڵدا توانی زیاتر لە٩٠٪ی چالاکیە نەوتیەکانی ئەمریکا بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. لەم ڕێگایەشدا، لەپشتەوەی دامەزراوەکە،

ترسناك و مەترسیدارترە، پیاوێکی گوماناوی و باریکەلە دانیشتبوو و لەبەکارهێنانی هەرهۆکارێك کەبێتە هۆی پێشکەوتن و هێنانەدی بەرژەوەندیەکانی سڵی نەدەکردەوە. بەو پەڕی دڵڕەقی و بەهەرشێوەیەك بوویێت ڕکابەرەکانی تێك دەشکاند، لەبەرامبەر مانگرتنە کرێکاریەکاندا بێ ڕەحم و توندوتیژ بوو و، بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیەکانی پابەندی هیچ بنەمایەکی ئاکاری نەدەبوو، لە واقیعدا ئەو هێما ڕاستەقینەی سەردەمی خۆی نوێنەری شارستانیەتێکی تایبەت بوو کە سەرمایەداری پیشەسازی هێنابوویە ئاراوە.

شێوازی مۆنۆپۆل (ئنحصاری) و دامەزراوەی تراست، پێچەوانەی بنەمای کێبڕکێی ئازاد بوو لەکاروباری ئابووریدا، چونکە کێبڕکێی گچکە و سنووردارەکانی لەناو دەبرد و دەسەڵاتی ئابووری لەناو دەستی کۆمەڵێکدا دەهێشتەوە و، لەهەمان کاتیشدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەستتێوەردانی دەوڵەت، هەرکاتێك بەرژەوەندی کۆمپانیا گەورەکان پێویستی دەکرد، ئابووری ((لسەفەر)) و ئازادی کاری ئاکەکەسیان لەچالاکیە ئابووریەکان، وەك بنەمایەکی دان پێدانراو بوونیادی لەئابووری ئەمریکادا دەهێنایە کایەوە. ڕاپەڕینی سەنتەریزەی کردنی(تمرکز) پیشەسازی و دەسەڵاتی سەرمایە گەورەکان هۆکاری سەرەکی فراوانبوون و بەرەوپێشەوە چوونی سەرمایەداری ئەمریکای ئەو سەردەمە بوو، هەروەها چەندەها شێوازی نوێی لەنێو ئەم سیستەمەدا ـ کاروباری پیشەسازی و بانکی بەیەکەوە دەبەستەوە ـ هێنایە ئاراوە. یەکێك لەو سەرمایەدارە گەورانە کەلەبواری بانکیدا کاری دەکرد ((مۆرگان))بوو، ئەو لەساڵی ١٨٧٧ بەدامەزراندنی سەندیکایەك لە بانکدارە گەورەکان، ئەرکی لێپرسراویەتی فرۆشتنی بەڵگەی بەهاداری خەزێنەی گرتە دەست و بەکۆنترۆڵکردنی کاروباری بانکی کەسایەتی و پێگەیەکی نێودەوڵەتی بۆ خۆی درووست کرد.

بانگەکەی مۆرگان و شەریکە ڕاستەوخۆ و ناڕستەوخۆکانی، دەستیان بەسەر تۆڕێك لەبانکە جۆراوجۆرەکان و سیاسەتی دارایی ئەمریکادا گرتبوو، جگە لەوەش چاودێریەکی ووردیشی خستبووە سەر کاروباری کۆمپانیا گەورەکان. لەلایەکی ترەوە، کاروباری زۆرینەی هێڵەکانی ئاسن، کۆمپانیاکانی هاتووچۆ و گواستنەوە و کەشتیوانی، دامەزراوە بازرگانیەکانی وەك جەنەراڵ ئەلەکتریك و کۆمپانیای تەلەفۆن و تەلەگرافی بەڕێوە دەبرد. بەقسەی یەکێك لەڕۆژنامەنوسەکانی سەردەمی مۆرگان، کەلە کتێبی ((سەرمایەداری ئەمریکا)) ئاماژەشی پێکردووە :((مۆرگان نوێنەری شارستانیەتێکی تایبەت بوو، ئەو پشك بوو، پەیماننامە بوو، بانك بوو، هێڵی ئاسن بوو، ((تراست))بوو، سەرمایە بوو، فێڵ و تەڵەکە بوو، بەرژەوەندی بوو، بەڵێ، ئەو هەموو ئەم شتانە

بوو. ئەو کەسێك نەبوو کەبەتەواوی کە بەتەواوی مانا بەمانادەمیزاد حساب بکرێت، ئەو بەشێوەیەکی ترسناك نامرۆڤانە بوو. ئەو سێبەری سەردەمی خۆی بوو.))

داروینیزمی کۆمەڵایەتی، هاندەری ئەم سەرمایەدارە گەورانە بوو. گریمانەی پەرەسەندنی داروین، بەربەرەکانێ بوو بۆ ژیان، هەڵبژاردنی سرووشتی و مانەوەی چاکتر لەگەڵ بنەماکانی زانستی کۆمەڵناسیدا ناوێتە کران. سوود وەرگرتن لەداهێنانە نوێیە زانستیەکان بۆ پێشکەوتنی پیشەسازی و گۆڕانکاری ئابووری پیشەسازی، لەگەڵ گریمانەی گۆڕان لەژینگەناسیدا و باوەڕ بەپەرەسەندنی تەدریجی لەناو یەکدا تێهەڵکێش کران و بیرۆکەی پێشکەوتن لەسەر بنچینەی کامڵ بوون وەك بیروباوەڕێکی گشتی لێهات، ((ئسپنسەر)) کەیەکێکە لەپەیڕەوانی ((داروین))، گریمانەی هەڵبژاردنی سرووشتی، پەرەسەندنی تەدریجی و مانەوەی چاکتری لەبواری کۆمەڵناسی و ئابووریدا بەکار هێنا. باوەڕی وابوو، کێبڕکێ و بەرەنگاربوونەوە بۆ ژیان نەتەنها لەسرووشتدا بەڵکو لەرێکخستنی کۆمەڵایەتیشدا هۆکاری سەرەکی و جوهەریە. لەژیانی مرۆڤی سەرەتایی و لە کۆمەڵگا داخراوەکانی پێشوودا، هەموو ئەندامەکان لەڕووی فیکری و پلەوپایەی تاکەکەسیەوە یەکسان و هاوتابوون، وردە وردە کاروباری کۆمەڵایەتیان رێکخست، کار دابەشکردن هاتە ئاراوە و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەڕووی ماف و گەرەنتی کۆمەڵایەتیەوە یاسا و رێسایان بۆ دانرا و پلەو پایەی کۆمەڵایەتی و مادی تاکەکان لەیەکتر جیاکرانەوە، ئەو کۆمەڵگانەی کەخاوەنی پێك هاتە و دامەزراوەیەکی رێك و پێك تر و بەهێز تربوون، مانەوە و بەرەو ڕووی پێشکەوتن و کامڵ بوون هەنگاریان نا.

گونجاندنی یاسای داروین و مانەوەی چاکتر لەلایەن ((ئسپنسەر))ەوە لەزانستی کۆمەڵناسیدا رەواجێکی لەرادە بەدەری پەیدا کرد و سەرمایەداری پیشەسازیش پاساوێکی زانستیانەی لە کۆمەڵناسی داروینیدا بۆ هێنرایەوە. ((راکفلر)) پێی وابوو کەفراوانکردنی پیشەسازیەکان و هێزی کارگە گەورەکان، دەرئەنجامی پایەداربوونی بەهێز و مانەوەی چاکترە: ((کوڵێکی سووری جوان کاتێك دەتوانێت ببێتە خاوەنی عەتر و بۆنێکی خۆشی بێ وێنە، کە بەلەناوبردنی خونچەکانی دەوروبەری خۆی یارمەتی گەشەکردنی درابێت.)) نایەکسانیە کۆمەڵایەتیەکان، وەك یاسایەکی سرووشتی دەتوانرێت پاساوی بۆ بهێنرێتەوە، چونکە مانەوەی بەهێز شتێکی سرووشتیە، بەواتیەکی تر ((نایەکسانی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای نایەکسانی سرووشتی راوەستاوە و ئەوەش خۆی لەخۆدا لەئەنجامی ئەو جیاوازیە هەییانەوە سەر هەڵدەدات کە لەلێهاتویی و هۆشیاری بە بۆماوەییەکاندا هەیە.)) بیرۆکەی پێشکەوتن بەئاراستەی گۆڕان و بەرەو پێش چوون هەنگاو دەنێت و کۆبونەوەی

دامەزراوە پیشەسازی بازرگانیەکان بە ووتەی ((کارنگی)) بۆ پێشکەوتن و بەرەوپێش بردنی ئایندەی مرۆڤایەتی، بەفاکتەری سەرەکی و جەوهەری هەژمار دەکرێت. هزری ((پیۆرتیانیزم))یش، کرا بەئامێرێکی پاساو هێنانەوەی ناکاریانە لە پایەدار بوونی بەهێزدا، چالاکی تاك، بەتایبەتی ئامانجی ئەو کۆکردنەوەی سەروەت بێت، بەخشینێکی ئیلاهییەو هەوڵدان لەپێناو بەدەست هێنانی سەروەت، لەڕاستیدا جێبەجێکردنی ئەرکێکە کە خواوەند لەمرۆڤە باوەڕدارەکان چاوەڕێی دەکات. چونکە ((سوڵتانی مەعنەوی ئێمە، کە خوداوەند بەهرەی کۆکردنەوەی سەروەتی بۆ مەبەستێکی چاك و چاك بەمرۆڤ بەخشیوە)) کە خێر و چاکەی کۆمەڵگەی لێدەکەوێتەوە. قەشە ((لارنس)) لە کڵێسەی ((ئێپسکوپل))ی ماسا چۆسێت، لەووتارەکانیدا دەیوت، کە :((تەنها پیاوی سەر بەرز سەروەت کۆدەکاتەوە. ئێمە ئیمانمان بەو هەماهەنگی و ڕێکخستنە دونیاییە هەیە کە خوداوەند ئافراندوویەتی... تەنها بەبیرکردنەوە و زیندەگی کردن بەپێی بنەما باڵاکانی ئەوە کەنهێنیەکانی سروشت و سەروەتە شاردراوەکانی بۆ ئێمە ئاشکرا دەبێت... دینداری و سەروەت پێکەوە گرێ دراون.))

بەم شێوەیە چڕبوونەوەی سەروەت و دەسەڵات لەنێو دەستی چەند کەسانێکی دیاریکراودا لەگەڵ یاسا ناکاری و مەزهەبیەکاندا گونجێنراو چەمکی ((ئینجیلی سەروەت)) پاساوێکی دان پێدانراوی بۆ هێنرایەوە. چەمکەکانی ئازادی، یەکسانی و دیموکراسیش بەشێوەیەك گۆڕانیان بەسەردا هات کەلەگەڵ فەرهەنگی پارە و کۆمەڵگەی سەرمایەداری پیشەسازیدا هەماهەنگ بکرێت. تاك گۆڕا بۆ مرۆڤێکی ئابووری، دیموکراسی بۆ سەرمایەداری، ئازادی بۆ مافی خاوەنداریەتی، یەکسانیەکان بۆ دەرفەتێك بۆ دەوڵەمەند بوون و پێشکەوتن بۆ گۆڕانی پیشەسازی و کۆکردنەوەی سەروەت و سامان، واتە خودا و سرووشت دەستیان دایە دەستی یەکتر کە ((ئینجیلی سەروەت)) وەك بنەما و بنچینەیەکی دان پێدانراو پێویستیەکی سرووشتی و حاشا هەڵنەگر لێ بکەن.

پەیدابوونی فەرمان ڕەوایانی سەروەت وەك گرێکی کۆمەڵایەتی تایبەت، باوەڕی بە هەلی سەرکەوتن و پێشکەوتن لە ئەمریکادا زیاتر کرد و ئەمریکا ـ بەواتای وڵاتێك بەرەخساندنی چانسی یەکسان بۆ هەمووان ـ وەك سەر زەمینەیەکی بڕیار لەسەر دراو (موعود) خۆی بەتێکڕای گەلەکەی ناساند. داستانە میللیەکانی ((هۆراشیۆلجەر)) ئەم خەونە ئەمریکاییە و ئەفسانەی پیاوی خۆ درووستکەری بەگوێی تێکڕای خەڵکی ئەمریکادا چرپاند. لەهەموو داستانەکاندا، پیاوی فەقیر بە کار و کۆشش و دەستپاکی و باوەڕ، بەسەر هەژاریدا زاڵدەبێت و خۆی بەسەروەت و پارە دەگەیەنێت، دەنوسێت: ((لەم مەملەکەتەدا، خۆشبەختانە کەمتر شوێنێك هەیە کە تاکی زەحمەت

کێش نەتوانێت ژیانێکی گونجا و بۆ خۆی درووست بکات و ئەگەر خۆی لە ئیشکردن نەدزێتەوە بەدڵنیاییەوە ڕێگا بۆپێشکەوتن و سەرکەوتن هەموار کراوە.)) ئەندرۆ کارنگی ((پسپۆری ووشە کورتەکان)) هێمای بیرۆکەی سەرکەوتن و پارە دروستکردنی ئەو سەردەمەیە، لەوەتەی ئەو ((هەژاری ڕەحمەتێکی ئیلاهییە، چونکە مرۆڤ ناچار بەکارکردن دەکات. پیرۆزبایی و دەستخۆشی لەلاوان بکەن کەلەم بارودۆخەدا لەدایك بوون لەبەرئەوەی کە ناچار دەبن بەو پەڕی تواناکانیانەوە ئیش بکەن)). ((ڕاکفلر)) باوەڕی وابوو، هەرچەندە مرۆڤێك فەقیر تربێت ئەگەری پێشکەوتنی ئەو زیاتر دەبێت و چەندەها دەرفەتی (گونجاو) چاوەڕێی دەکات، تەنها دەبێت فێری زیادە ڕۆیی نەکردن و شێوازی کار و چالاکی بکرێت. بیرۆکەی بەختەوەری و درووستکردنی پارە و ئەفسانەی پیاوانی خۆدرووستکەر، بەرهەمی نوسەرانێکی وەك ((هۆراشیۆئەلجەر))، چاپەمەنی و کڵێساکان بوو. هەر لەم ساڵانەدا چەندەها بڵاوکراوەی جۆراوجۆر دەربارەی ڕێوڕەسمی پارە درووستکردن و کۆکردنەوەی سەروەت وسامان دەرکران و زۆربەشیان لەناوچەکانی باکوور و ڕۆژهەلات کەناوەندێکی سەرەکی پیشەسازی و کارگەکان بوون بڵاودەکرانەوە. ئەم بیرۆکانە لەرێگەی ووتاری قەشەکانی پرۆتستانتیشەوە لەژێر درووشمی ((خودا ناسی و توانایی))دا بۆ خەلکی دەگوازرانەوە.

بەڵام واقیع لەگەڵ وێنەی ڕەنگینی پیاوی خۆدرووستکەردا نەدەگونجا. سەرمایەدارە ناودارەکان، ئەو گەنجە هەژارانە بوون کە لەلادێکامەوە بەرە و شار هاتبن، نەئەو کۆچبەرانەش بوون کە لە وولاتە فەقیرەکانی ئەورووپاوە پەنایان بۆ کەنارەکانی ئەمریکا هێنابێت، بەڵکو زۆربەیان سەر بەچینی ناوەڕاست و لە نەژادی ئەنگلۆ ساکسۆن بوون، خاوەن بڕوانامەی زانکۆ، ئەزموونێکی تەواویشیان لە بواری ئاڵوگۆڕی بازرگانیدا هەبوو. جگە لە ((کارنگی)) کەلە ئۆسکۆتلەنداوە بۆ ئەمریکا کۆچی کردبوو و یەك دوانێکی تر، هەموو ئەوانی دی لە ئەمریکادا لەدایك بووبوون و لەژیانێکی تارادەیەك خۆشگوزەرانیشدا، پەروەردە کرابوون، زۆربەشیان ئەو دەرفەتەیان بۆ خۆیان قۆستبوویەوە کە شەڕی ناوخۆ بۆیانی ساز کردبوو، هەرلەو کاتەشەوە ئەو هەموو سەروەت و سامانەیان پێکەوە نابوو، چینی میلیۆنەریش کە خاوەنی ئەو پلەوپایە کۆمەڵایەتیە تایبەتە بوون، سەر بەم کۆمەڵەیە بوون. بەرژەوەندی سەرمایەداری بەجۆرێك لەگەڵ بیرۆکەی پێشکەوتن خوازی و پێشکەوتن و سەرکەوتندا لێك درا، کە ڕەش بینی و نائومێدی گشتی دژ بەو ڕژێمە هەمیشە ماوەیەکی کورتی خایاندووە. سەردەمی رووداو و پێشکەوتن خوازیەکان پێش جەنگی جیهانی یەکەم، یان سەردەمی چاکسازیەکانی رۆزفلت، یان دەیەی ۱۹٦۰، کەسەردەمی نارەزاییەکان و دەربڕینی هەستی بەدبینی بوو بەرامبەر بەم تاقمە و مۆنۆپۆلکردنی سەروەت ـ هەمیشە ـ سەردەمی ستایش و شانازی

پێوەکردنی بەدوادا هاتووە. خەونی ئەمریکایی کەموژدەی ژیانێکی خۆشگوزەران و پێشکەوتنی بەهەر تاکێکی هەژار و زەحمەکەت کێش دەدا و هەروەها ئەفسانەی ((بزاوتی کۆمەلآیەتی ژندەپۆشان لەهەژاریەوە بۆ دەولەمەندی)) لەو ماوەیەدا گوڕ و تینێکی زیاتریان وەرگرت. سالآنە چەندەها خەلات بەناوی ((هۆراشیۆلجەر))ەوە پێشکەش بە چالاکترین و سەرکەوتووترین سەرمایەدارەکان دەکرا و فرۆشتنی ئەو داستانانەی کە باسیان لەسەرکەوتن و پێشکەوتنی تاکەکەس دەکرد، بازاڕێکی گەرمیان پەیدا دەکرد.

بازرگانە نوێیەکان تازە بە تازە بووبوونە خاوەنی سەروەت و سەرمایە، چینێکی تایبەتیان لەکۆمەلگەی ئەمریکیدا پێك هێنا و بۆ چاولێکەری یەکتر دەستیان بەدرووستکردنی کۆشك و تەلاری پڕ شکۆ و کڕینی کەل و پەلی ڕازاوە و گرانبەها کرد. شەیدای کڕینی کەل و پەلی ئەنتیك و دروستکردنی بالەخانەی گەورە و زەخم، کە بەکەرەستەکانی جوانکاری ئەفسانەیی و هەندێك جار پێکەنیناوی ئەڕازێنرانەوە، بازرگانی کردن بەکەرەستە و شتوومەکی بەنرخی خانەدانی، پێشبڕکێ کردن لە خوازبێنی کردنی کچانی نۆچاغ زادەی بێ کار و بێ دەرەتانی ئەورووپی، سازکردن و ڕێکخستنی میوانداری پڕ زەرق و برق، بێ سەر و بەری جۆراوجۆر و دەست بلاوی لەڕادەبەدەر، بەگشتی نیشانەی فەرهەنگێکی تازە پێگەیشتوو بوو، کە ((مارك تواین)) نووسەری ئەمریکایی بەگالتەجاڕیەوە بە((سەردەمی تکلیلی))ناودەبرد. پێشبڕکێی ئەم تاقمەی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی جەماوەر و درووستکردنی گیانی ڕێزلێنان و یەکسانی کۆمەلآیەتی، لەچالاکیە جۆربەجۆرەکاندا بەئاشکرا دەبینرا. زۆربەی بەرهەمە هونەریەکانی ئەورووپایان کڕی و چەند مۆزەخانەیەکی جۆراوجۆر لەرێگەی ئەو یارمەتیانەی کە پێشکەشیان دەکرد، وەك مۆزەخانەی ((ناشنال گالری)) واشنگتۆن، ((میترۆپۆلتێن و ڤتینی)) لەنیویۆرك و مۆزەی هونەری شیکاگۆ درووستکران. کڕینی شتوومەکی هونەری و دروست کردنی مۆزەی هونەری جۆراوجۆر، بەلگە لەسەر سەلیقەی هونەری و فەرهەنگ دۆستی ئەوان نەبوو، بەلکو وەکو هەموو پرۆژەکانی دیکەیان ـ دروست کردنی بالەخانەکان، زانکۆکان، کلێسەو کتێبخانە جۆراو جۆرەکان ـ هەموو بۆ دەرخستن و بیانوێکیش بوو بۆ خۆ دزینەوە لەدانی باج ، دەرفەتێك بۆ پەرەپێدانی دەسەلاتی سیاسی‌و نامێرێك بەدەست پێشەنگانی بیروڕای گشتیەوە کە وێنەیەکی موحتەرەمانەی بازرگانەکان پیشانی خەلك بدەن. لە تێکڕای بەرهەمە هونەریەکانی ئەم سەردەمە دا هیچ نوسەرێکی بەناو بانگ ، تەنانەت ووتەیەکی بۆ دان پێدانانی ئەم کەسانە نەووتوەو هیچ کام لەم کەسانەشیان بەپالەوانی داستان ناوزەد نەکردووە، ووشە بەکیشیان دەربارەی پیاهەلدان و ستایش کردنیان نەنووسیوە. تەنها شتێك کە ناتوانرێت نکولی لێ

بکرێت ـ بە هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەی لەڕووی ئەخلاقیەوە پەسەند بوون ـ لێهاتووی لە بواری بازرگانی ، شارەزایی و بەڕێوەبردن و ڕێکخشتنی کاروباری ئابوریان بوو کە ئەوانی گەیاندە ئەو ئاستە .

سیاسەتی ناوخۆی حکومەتی ئەمریکا لەم سەردەمەدا، وەك جاران بەهێز نەبوو. سەرۆك کۆماری ئەم سەردەمە هەرچەندە دەسەڵاتی جێبە جێکردن و بەڕێوەبردنیشیان هەبوو، بەڵام لەڕووی کەسێتی سیاسەتیەوە کەسانێکی مام ناوەند بوون. لەسەردەمی پەرەسەندنی پیشەسازی و سەرهەڵدانی کارگە گەورەکان و کۆمپانیا پێشکەوتووەکاندا، دەسەڵاتی جێبەجێکردنی دەوڵەتی مەرکەزی کەوتە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی سەرمایەدارەکانەوە. بانکدارە گەورەو خاوەن پیشەسازیەکان گەورەکان بوون کە کۆنترۆڵی کاروبارەکانیان دەکرد. بەدرێژای مێژووی ئەمریکا هیچ کاتێك سیاسەتی ئەو وڵاتە وەك سەردەمی بانکدارەکان و خاوەن کارگەکان لاوازو کەم بایەخ نەبووە. لە ڕاستیدا پێشکەوتنی باری ئابووری، یەکسانی و هاوسەنگی دەسەڵاتی سیاسی ئەمریکای تێك شکاند. سیاسەتی قۆرخکاری ودونیای پیشەسازی و بازرگانی، دیکتاتۆریەتێکی ستەمکاری ئابووری پێگەیاندو بەتوندی دەستی ڕژێمی دیوکراتی ئەمریکای کەلەپچەکرد. لەم بارەیەوە ((چارلز فرانسیس ئادامز))لەنەوەکانی دووەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا، لەساڵی ١٨٧١دا دەنوسێت: ((شێوازی بەکارهێنانی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی کۆمپانیا گەورەکان هێشتا لەقۆناغی سەرەتایی دایە، بەڵام دەسەڵاتێکە کەهیچ ناوێکی ناتوانرێت لێبنرێت. ئێمە دەربارەی سیستەمە جۆراوجۆرەکانی حکومەتکردن، لەئەرەستۆکراتی و دیکتاتۆریەوە تا دیووکراسی، شتانێك دەزانین، بەڵام هیچ دەستەواژەیەك ناتوانێت ئەو حکومەتەی کە لەلایەن بازرگانە بەهێزەکان و کۆمپانیا گەورەکانەوە بەڕێوە دەبرێت پێناسە بکات... هەروەك ئەو سەرمایەدارانەی کە بەڕێوەبردنی کاناڵی ئێریە یان بۆخۆیان قۆرخ کرد، پێناسی دەسەڵاتی ئەوانە لەکۆنترۆڵی پرۆلیتاریادا، ئەو کاتەش کە ((ڤاندەر بیلت)) دەسەڵاتی ئستیبدادی تزارەکانی بۆ بەڕێوەبردنی [کۆنترۆلکردن] کۆمپانیاکانی هێڵەکانی ئاسن بەکار هێنا، چاوەڕوان دەکرێت کە لەقۆناغی دواتردا ئەم سیستەمە ئستیبدادیە ئابووریە و قۆرخکاریەش دەسەڵاتی خۆی بەسەر بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیاکان و پرولیتاریدا بسەپێنێت.))

سیمای ئەندامی گۆنگرێس، دادوەرەکان و دەستەی جێبەجێ کەرانی مەملەکەت لەم ماوەی بیست و پێنج ساڵەدا ١٨٧٠ـ١٨٩٥ هێلکاریەکە لەگەندەڵی، کەم و کورتی و بەرتیل خۆری. سیاسەتی دەستتێوەرنەدانی دەوڵەت بەکاروباری ئابووری، کۆت و بەند و کێشمەکێشێکی

لەرادەبەدەری سەرمایەدارەکانی لێکەوتەوە. لاوازی کەسایەتی سیاسی خوودی سەرۆك کۆمارەکان بوو بەهۆی ئەوەی کە زۆربەیان ببنە گالتەچاری دەستی سیاسەتی حیزبەکان. لەشەش دەورەی سەرۆکایەتی کۆماریدا ١٨٧٦ـ١٨٩٦، حیزبی کۆماریخواز چوار سەرۆك کۆمار ڕەوانەی کۆشکی سپی بکات. حیزبی کۆماری خواز حیزبی سەرمایە و سەروەت بوو. سەرکەوتنی شەڕی ناوخۆ و پەرەسەندنی ئابووری ویلایەتە یەکگرتوەکانیش لەئەنجامی پشتگیری و پشتیوانی کۆماریخوازەکانەوە سەری هەلدا بوو. زۆربەی خاوەن کارگەو سەرمایەکان و چینی خۆشگوزەرانی کۆمەلگەش لەنێو ئەم حیزبەدا ئەندام بوون. سیاسەتی حیزبی کۆماریخواز بەشێوەیەك بوو کە هەموو ئەو شتانەی بازرگانەکان داویان دەکرد، وەك (باجی پشتیوانی)، یاسای ئاسانکاری بۆ بەرهەمهێنان، سیستەمی میللی بانکی، زەوی و زاری فراوان، قەرزی زۆروزەبەندە و سیستەمێکی تایبەتی بۆ لێبوردنی گشتی (معاف) لەسەر ئەو باجەی کە پێویست بوو بۆ خەزێنەی دەولەتی بیگێرێتەوە، بۆیانی دەستەبەر دەکرد. ڕەش پێستەکان و سەربازە کۆنەکانی سەردەمی شەڕیش کە ئازادی و سەرکەوتنی خۆیان لەچاوی کۆماریخوازەکاندا دەبینی، پەیوەندیان بەم کۆمەلەیەوە دەکرد. بەدەست هێنانی دەسەلاتی سیاسی هەولێکی لەباری بۆ کۆماریخوازەکان ڕەخساند، بۆ ئەوەی پارێزگاری لە دەسەلات و ئابووری خۆیان و ئەندامەکانیان بکەن. بۆ بەرەوپێش بردنی ئامانجە سیاسیەکانیان پابەندی هیچ بنەمایەك نەدەبوون، بەرژەوەندی کرداریان لەسەروی هەموو بەرژەوەندیەکانەوە دانا بوو. سیاسەت، هەم بوو بەهێمای بازرگانی کردن، هەم ئامرازێك بوو بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندیەکانی. ڕوون و ئاشکرایە کەهەر سیناتۆرێك تەنها نوێنەری ویلایەتەکەی خۆی نەبوو و بەلکو بە پێناسی دەسەلات و بەهای بازرگانیش دەژمێررا. بۆ نموونە بازرگانەکانی پەمووی ویلایەتەکانی باشوور لەلایەن شەش سیناتۆرەوە بەرێوە دەبرا، سیناتۆرەکانی دیکە پشتیوانیان لە بەرژەوەندی هێلە ئاسنینە سەرتا سەریەکانی یونیۆن پاسیفیك دەکرد، ژمارەیەکی دیکەش بەرژەوەندی کانەکانی پۆلا و ئاسن و چەند سیناتۆرێکی دیکەش پارێزگاریان لەبەرهەمهێنای نەوتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکرد. ئەنجامی ئەم بێ سەروبەری سەروەریە حیزبیە، بەوە شێوەیە بوو کە دەسەلاتی زەمینەی حیزب لەخەلکی سەندرایەوە و بۆ چەند سیاسەتمەداری حیزبی، نوێنەری کارگە گەورەکان و ڕێکخراوە حیزبیەکان گوازرایەوە. دام و دەزگا حیزبیەکان بەرادەیەك دەسەلاتیان بەسەر کاروبارەکاندا گرتبوو کە کاتێك دیموکراسی لەسەردەمی سەرۆك کۆماریەتی ((کلیولەند))دا دەرفەتی گرتنە دەستی دەسەلاتیان بۆ ڕەخسا، دەرکەوت کەلەنێوان ئەم دووحیزبەدا جیاوازیەکی ئەوتۆ نەبووە، چونکە دەسەلاتی بازرگانی بەسەر سیاسەتی گشتی ووڵاتدا یەکلایی بووبوویەوە.

بۆرێککەوتن لەدەست درێژی کۆمپانیا گەورەکان، چەند یاسایەکی نوێی چاکسازی لەکۆنگرێسدا دەنگیان لەسەر دراو لەوانەش یاسای بازرگانی نێوان ویلایەتەکان بوو. کۆمپانیاکانی هێڵەکانی ئاسن لەگەڵ ئەو هەموو تەنگ و چەڵەمەیەشدا خۆیان لەدانی باج دەدزیەوە و نرخی کرێی هاتووچۆیان بەدڵی خۆیان بەرز و نزم پێدەکرد. ئەم یاسایە سنووری چالاکی ئەو کۆمپانیانەی کەم کردەوە، دەبوو کرێی هاتووچۆ بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دیاری بکرێت و لەسەر کۆمپانیاکانی هێڵەکانی ئاسنیش پێویست بوو بەدارشتنی بەرنامەیەك، باج و دەفتەری حیسابەکانی خۆیان بەمەبەستی پێداچوونەوەیان بخرێنە بەر دەستی لێپرسراوانی دەوڵەت. بەڵام ئەم یاسایە زۆر روون نەبوو و بەراشکاوی نرخەکانی دیاری نەدەکرد. لەکۆتاییدا و بەهۆی یاسا پێشنیازکراوەکەی ((شرمان))ەوە کە بەیاسای ((دژە تراست)) بەناوبانگە، لەساڵی ۱۸۹۰ تەواوی کاروبارەکانی پەیوەندیدار بە ((تراست)) خرایە ژێر دەسەڵاتی کۆنگرێسەوە. تەڵەکەی بازی و کۆت و بەند و پیلانە بازرگانیەکان بەتەواوەتی قەدەغەکران. بەڵام ئەم یاسایانەش کارێکی ئەو تۆیان لە بارودۆخەکە نەکرد و کۆمپانیا گەورەکان لەسەر کارە نایاسایەکانیان هەر بەردەوام بوون.

لەراستیدا لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و هاتنە سەر کاری ((تیئۆدۆر رۆزۆڤلت))ەوە بوو، کە لەگەندەڵیەکانی دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی تارادەیەك کەم کرانەوە و پلە و پایە و پێگەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن زیادی کرد. هەر لەسەرەتای ئەم سەدەیەشەوە بوو کەپەیوەندی دەسەڵاتی لێپرسراویەتی سیاسی لەلایەکەوە و دەسەڵاتی سەرمایەدارەکان لەلایەکی ترەوە و گۆڕانێکی نوێی بەسەردا هات.

کۆمەڵگەی پیشەسازی ئەمریکا کە هاوکاری سەرمایەدارەکانی بەسەردا زاڵ بوو، لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا رووبەرووی کۆمەڵێك گیروگرفتی کۆمەڵایەتی بوویەوە [لەوانە]: کۆچکردن و گرفتەکانی شارنشینی، رەگەز پەرستی، ژیانی کرێکاران، ئاڵۆزی ژیانی چینی بەکاربەر و کێشەی جووتیارەکان. پێشکەوتنی پیشەسازی و بەرهەمی کارگەکان پێویستیەکی زۆری بەهێزی کارەکەر هەبوو. لەبەر ئەوە رێساکانی کۆچکردن چەند ئاسانکاریەکیان تێدا کرا و کاروانی کۆچبەرانی بەرەو ویلایەتەکان بەرێخست. ئەو کۆچکەرانەی کەپێش شەڕی ناوخۆ بەرەو ئەمریکا دەهاتن، زیاتر خەڵکی باکووری ئەوروپا بەتایبەت ئیرلەندە و ئەڵمانیا و ئەسکەندەنافیا بوون. زۆربەشیان خوێندەوار و تارادەیەکیش دەوڵەمەند بوون. بەڵام دوای کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆ و لەئەنجامی ئەو گۆڕانکاریە پیشەسازیانەی کەجیهانی پێدا تێپەری،ئاراستەی کۆچکردنەکان گۆڕاو کۆچبەرەکان زیاتر لەووڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵات و باشوورەوە بەتایبەت لەرووسیا، پۆڵەندا،

ناوچەکانی بالکان و ئیتالیاوە شۆڕ دەبوونەوە و ڕێژەیەکی زۆریشیان جووتیاری نەخوێندەوار و هەژار و یان سەربەئاینی کاتۆلیك و یەهوودی بوون و لەرووی فەرهەنگیشەوە لەگەڵ کۆچبەرەکانی پێشوودا جیاواز بوون. ئیشە سەخت و دژوارەکانی نێو کانەکان، پیشەسازی ئاسن و پۆڵا و دام و دەزگاکانی ڕستن و چنین هەمووی کەوتبوویە سەرشانی ئەم کۆچبەرانە. ئەمانەهیچ شارەزایی و پسپۆڕیەکی هونەریان نەبوو و، بۆ ئەو ئیشانەش تەرخان دەکران کە بە ((پیشە بیانیەکان)) بەناوبانگ بوون. لەناوچە هەژار نشین و قەرەباڵغەکانی شارەکاندا نیشتە جێ دەبوون و هیچ جۆرە خزمەت گوزاریەکی تەندروستی و خۆشگوزەرانیان لەبەر دەستدا نەبوو. مەرجەکانی کارکردن زۆر سەخت و دژوار بوون و کرێکارەکان زۆربەیان ڕووبەڕووی دەرکردن و لەدەستدانی کارەکەیان دەبوونەوە.

لەسێ ساڵی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم، ژمارەی کرێکاران سێ ئەوەندە زیادی کرد بەرێکەوتنی شەپۆلی ڕوو لەزیادی کۆچبەران، سەرچاوەیەکی لەرادەبەدەری هێزی کرێکارانی خستە بەر دەستی خاوەن کارگەکان و بەرەخسانی ئەم هەلومەرجە لەبارە چیدی بەپێویستیان نەدەزانی ئەوەندە گرنگی بەحاڵ و گوزەرانی کرێکاران بدەن. کەمی کرێی ڕۆژانە، ماوەی کاری دوور و درێژ، ئاڵۆزی پشێوی ژیان ، زەمانەت نەکردنی پیشە، مەرجە قورسەکانی کارکردن و تەوەقوعاتی بێ سنووری خاوەن کارگەکان، لەو گرفتە سەرەکیانە بوون کە لەسەردەمی گۆڕانی پیشەسازیدا ڕووبەڕووی کرێکارەکان دەبوونەوە، مەرجەکانی کارکردنی کرێکارانی کۆچبەر ڕەهەندێکی سەرمایە گوزاری بەخۆوە گرتبوو، هەر ئەم بارودۆخەش بوو کە کرێکارەکانی بەرەو ڕێکخراوەیی بوون هاندەدا.

یاخی بوونی کرێکارەکان زۆرجار توند و تیژی و پێکدادانی لێدەکەوتەوە، یەکرێزی و مانگرتنەکانیشیان بەرەبەری هێزی خاوەن کارگەکان بەربەرچ دەدرایەوە دواتر بەبەکارهێنانی هێزی سەربازی و پۆلیسی تایبەت، بەتەواوەتی سەرکوت دەکران. سێ قەیرانی ئابووری گەورەی یەك لە دوایەك ۱۸۷۳،۱۸۸٦،۱۸۹۳ ڕێژەی سەدی بێکاریان لە ئەمریکا گەیاندە ۱۲٪و ئەم مەسەلەیە چەندەها مانگرتنی خوێناوی بەدوای خۆیدا هێنا. فراوانی هێزی کار، ژمارەی ئەو کرێکارانەی لەکاتی مانگرتنەکاندا ئامادە دەبوون، سیاسەتی خاوەن کارگەکان لە دووبەرەکی نانەوەی نێوان کرێکارەکان و پشتیوانی یاسا و هێزی سەربازی لە بەرژەوەندی سەرمایەدارەکان، یەکرێزی نێوان کرێکارەکانی ئەستەم و مانگرتنەکانی پەرتەوازە دەکرد. ووتەکەی ((جی گۆڵد)) کەیەکێکە لەخاوەن کارگە گەورەکان، پێناسەی ڕەفتار و هەڵوێستی ئەو کەسانەیە: ((دەتوانم نیوی تاکەکانی چینی کرێکاران بۆ کوشتنی نیوەکەی تر دابەزرێنم)).

ڕووبەڕووی نێوان کرێکاران، پاش قەیرانی ١٨٧٣ لەشێوەی مانگرتنی فراوان و جۆراوجۆر لەنێو شارە پیشەسازیەکاندا دەرکەوتن. ژمارەیەك لەو کرێکارانە و نەوانەش کە مووچەی ڕۆژانەیان کەمبوو، زنجیرەیەك مانگرتنی بەربڵاویان لەشارە پیشەسازیەکاندا ئەنجام دا. لەساڵی ١٨٧٧ مانگرتنی کرێکاران، هێڵەکانی ئاسنی نێوان شارەکانی وەك شیکاگۆ، فیلادلفیا، پتیسبۆرگ، بافلو، تاسانفرانسیسکۆی ئیفلیج کرد. بۆ کپکردنەوەی ئەم شۆڕشانە، سەربازانی دەوڵەتی فیدراڵی و پۆلیسی ویلایەتەکان تەقەیان لەکرێکارەکان کرد و ژمارەیەکیان لێکوشتن. ترس و لەرزی کاربەدەستان لە بیرەوەریەکەی ((کۆمۆنەی پاریس))ی ساڵی ١٨٧١، ئاسمانی ئەمریکای داپۆشی. فەرمانی دادگاکان سەبارەت بەقەدەغەکردنی هەر جۆرە مانگرتنێك، بەدوادا چوون و سزای مانگرتووەکان، دەرکردنی بەکۆمەڵی کرێکاران و دروستکردنی گاردی میللی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی لەشارە پیشەسازیەکان لەو جۆرە ڕێوشوێنانەبوون کەبۆ سەرکوتکردنی مانگرتووەکان گیرانە بەر. لەو ڕۆژە بەدواوە کۆکردنەوەی دامەزراوە پیشەسازیەکان و لێکدانی کۆمپانیا بازرگانیەکان بۆ دروستکردنی مەرکەزیەت و قۆرخکردنی چالاکیە ئابووریەکان، بەخێرایی خرایە قۆناغی پراکتیك کردنەوە، یەکگرتنی خاوەن کارگەکانیش لەلایەکی ترەوە، سەرکەوتنی کرێکارەکانی ئەوەندەی تر ئاڵۆز دەکرد. لەساڵەکانی ١٨٨٠ دەمەقرەی کرێکارەکان زیادی کردوو و لەگەڵ قەیرانەکەی ١٨٨٦دا ئەم ڕەق و قینەیان گەیشتە بینەقاقە. لەم ساڵەدا زیاتر لەشەش سەد هەزار کرێکار لەسەر پیشەکەیان لابران. لەمانگی مارچ ١٨٨٦ خۆپیشاندانێك دژ بە توندوتیژیەکانی پۆلیس لە ((هی مارکت))ی شیکاگۆ ئەنجامدرا. پاش تەقینەوەی بۆمبێك کەهیچ کاتێك بەڕاستی هۆکاری ئەم تەقینەوەیە نەزانراوە، ژمارەیەکی زۆر لەکرێکارەکان دەستگیر کران و لەشوێنێکی ترسناك و ناخۆش دادگایی کران و ژمارەیەکیش لەسێ دارە دران. پاش ڕووداوەکەی ((هی مارکت)) شوێن و پلەوپایەی سەندیکای کرێکاران کەوتە مەترسییەوە و زۆرێك لەخاوەن کارگەکان لە دامەزراندنی (استخدام) کرێکارانی ئەندامی ئەم سەندیکایە خۆیان بەدوور گرت، ڕابەرانی گرووپە کرێکاریەکان بەکەسانێکی تێکدەر و ئاژاوەگێڕ ناو زەد کران. لەساڵەکانی ١٨٩٠ مانگرتنی کرێکاران بەتایبەت لەنێو کرێکارانی کانەکان، هێڵەکانی ئاسن، پیشەسازی پۆڵا پەرەی سەند. پیشەسازی، بوو بەمەیدانی سەرەکی موناقەشە و مانگرتنە یەك لە دوایەکەکان. مانگرتنی کرێکارانی بەرهەمهێنای پۆڵا بە ((هوم ستەد))ی پەنسلڤانیا لەساڵی ١٨٩٢ نموونەیەکە لەو جۆرە مانگرتنانە. نزم بوونی ئاستی کرێی ڕۆژانە و بارودۆخی ناڵەباری ژیان و شێوازی بۆندی، ژمارەیەك لەو کرێکارانەی کەزۆربەیان کۆچبەر بوون، ناچار بەناڕەزایی دەربڕین کرد و لەبەر ئەوەی داواکەیان پشت گوێ خر

یەکیەتیەکەیان بڕیاری مانگرتنی پەسەند کرد. خاوەن کارگەکان بەبەکارهێنای پۆلیسی تایبەتی ((پینکرتۆن)) و هێزی سەربازی ڕووبەڕوویان وەستایەوە و لەئەنجامی شەڕ پێکدادانی نێوانیاندا ژمارەیەك لەهەردوو لاکوژران. کارگەکە داخراو زیاتر لە سەدوو پەنجا کرێکار بە تۆمەتی پیلان دارشتن سزا دران. ئامانجی خاوەن کارگەکان دەرکردنی کرێکارانی شۆڕشگێڕ و دامەزراندنی کرێکاری نوێ بوو، ئەویش بەمەرجێك ئەندامی سەندیکاکان نەبن و سەر بۆ هەموو فەرمانەکان دانەوێنن. دەرەنجامی مانگرتنەکەی ((هوم ستەد)) کۆتایی هێنان بوو بەدامەزراوەی سەندیکاکان لە بواری پیشەسازیدا، بێ کاری و سزادانی ڕابەرانی مانگرتنەکان، سەرکەوتنی خاوەن کارگەکان. هەر لەم کاتەدا ((یوجین دبس)) یەکیەتی کرێکارانی هێڵەکانی ئاسنی ڕاگەیاند. چالاکیەکانی ((دبس)) بۆ ڕێکخستنی کرێکاران، ناوبراوی وەك یەکێك لە ڕابەرە ناودارەکانی ڕابەرانی سۆسیالیزمی ئەمریکا ناساند. کرێکارانی دروستکردنی ڤاگۆن لەدەورووبەری شیکاگۆ لەبەر گرانی کرێی خانوو و نرخی ئەو کاڵایانەی کە بەناچاری لەفرۆشگای کۆمپانیاکە دەیانکڕی نارەزایی خۆیان دەربڕی. لەساڵی ١٨٩٣ کەسەردەمی قەیرانێکی دیکەی ئەمریکا بوو ڕێژەی بێ کارەکان زیادی کرد و بەپێچەوانەوە کرێی ڕۆژانەی زۆربەی خاوەن پیشەکان کەم کرایەوە. کۆمپانیای ((پۆلمن)) بەبێ گوێگرتن لەداواکاری کرێکارەکان، دەستەی ڕێکخستنی گفتوگۆکانی [نوێنەری کرێکاران] لەسەر کار لابرد و، لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستەی کۆپانیاکەدا کرێکارەکان دەستیان بەمانگرتن کرد. ((دبس))و ئەندامانی یەکیەتی کرێکارانی هێڵی ئاسن هاتنە ڕیزی مانگرتوەکانەوە و بەم شێوەیە سنووری مانگرتنەکە فراوانتر بوو. ئەنجوومەنێك لەبیست و چوار خاوەن کارگە بەمەبەستی رووبەڕووبوونەوەی ئەو یەکیەتیە پێك هێنراو بۆ سەرکوتکردنی ((یاخی بووان)) پەنایان بۆ ((کلیولەند)) سەرۆك کۆماری ئەو کاتە برد و بەبەکارهێنانی هێزی سەربازی دەوڵەتی مانگرتنەکە تێك شکێنرا، زەرەو زیانێکی مادی و گیانی زۆری لێکەوتەوە. ((دبس)) و ژمارەیەك لەئەندامانی یەکیەتی کرێکارانی هێڵەکانی ئاسن بەتۆمەتی ((پیلان دارشتن)) دژ بەیاسای دژەتراست زیندانی کران. هۆکاری سەرەکی ئەم توندوتیژی و پێکدادانە خوێناویەی کرێکاران، بۆ شێوازی بیرکردنەوەی [تێ ڕوانینی] گشتی خاوەن کارگەکان دەگەڕێتەوە.بەدڵنیایشەوە لەقەڵەمڕەوی دەسەڵاتدارانی قۆرخکاری سەرمایەداریدا، مەحاڵێك بۆ ئاشتی و ڕێزگرتن لەبیروڕای کرێکاران نەمابوویەوە.

یەکیەتی کرێکارەکانی ئەمریکا زیاتر لایەنێکی محافزەکارانەیان پێوە دیار بوو، ڕژێمی سەرمایەداری و بەرهەمهێنانیان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی تاك پەسەند کرد. چالاکیەکانیان لەبواری زیادکردنی کرێی ڕۆژانە و مەرجەکانی کارکردن چڕ کردبوویەوە، ئەوانەشیان کە خاوەنی

نامانجێکی شۆڕشگێرانە بوون، سەرکەوتنێکی ئەو تۆیان بەدەست نەهێنا. ئەو دوو یەکێتیە کرێکاریە [سەرەکی]ی کەلەسەدەی نۆزدەیەمدا دامەزران: ((فدراسیۆنی کاری ئەمریکا)) و ((کرێکارە دلێرەکان)) بوون، بەڵام ئەوەی کە محافەزەکارتر بوو، هەروەها بیروبۆچونێکی دۆستانەی لەگەڵ خاوەن کارگەکاندا هەبوو، مایەوە و یەکیەتی ((کرێکارە دلێرەکان))کە رێوشوێنێکی سیاسی بۆخۆی گرتبووە بەر و جێی متمانەی خاوەن کارگەکان نەبوو، کشایە دواوە و توایەوە. یەکیەتی ((کرێکارە دلێرەکان)) لە١٨٦٩دا دامەزرا و لەساڵەکانی ١٧٠٠ ژمارەی ئەندامەکانی پتر لە حەوت سەد هەزار کەس دەبوون، رەش پێستەکان و ژنە کرێکارەکانیش دەیانتوانی ببنە ئەندام لەم یەکیەتیەدا. پاش رووداوەکەی ((هی مارکت))ی شاری شیکاگۆ کە ژمارەیەك لەئانار شیستەکانیش تیایدا بەشدار بوون، یەکیەتی ((کرێکارە دلێرەکان)) کە لێپرسراویەتی خۆپیشاندانەکەیان گرتبووە ئەستۆ، زیانێکی زۆریان لێکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەرابەرانی ئەو یەکیەتیە دادگایی و زیندانی کران و، سەد هەزار لەئەندامەکانی کەنارگیریان کرد و وردە وردە لەمەیدانی چالاکیە کرێکاریەکان پاشەکشێی کرد و کۆتایی بەتەمەنی هات. ((فدراسیۆنی کاری ئەمریکا))، لەلایەن رابەرێکی((بلیمەتەوە)) کە ((ساموێل کۆمپەر)) بوو، بەرێوە دەبرا. نامانجی ئەم دامەزراوە چاککردنی مەرجەکانی کارکردن و کرێی رۆژانە بوو ـلەرێگەی گفتوگۆکردنی دۆستانە لەگەڵ خاوەن کارگەکان ـ لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی ئایدۆلۆجیایەکی کرێکاری نەبوو، کرێکاری ژن، کۆچبەر یان رەش پێستی وەرنەدەگرت، بەئەندام بوونیش لەو یەکیەتیە تایبەت بوو بەکرێکارانی پسپۆر و شارەزا لە بواری پیشەسازیدا، دانی بەرژێمی سەرمایەداریدا دەنا کە بەرێگەیەکی ئاشتیانە گیروگرفتی کرێکارەکان چارەسەر بکات. ((فدراسیۆنی کاری ئەمریکا)) هێدی هێدی پەرەی سەند و دواتر وەك یەکێك لە سەرەکی ترین دامەزراوە کرێکاریەکانی سەدەی بیستەمی لێهات. ئەم دامەزراوانە هیچ جۆرە هەرەشەیەکیان لەسەر بوونی سەرمایەداری درووست نەدەکرد، لەپێناو بەرژەوەندی کرێکارە شارەزاکان ـ بەڵام نەك پێچەوانە لەگەڵ بۆچوونی کارگەکان ـ دامەزرا، دامەزراوەیەکی هاوشێوە کۆمپانیا گەورەکانی پێکەوە نا.

راپەرینی کرێکاری ئەمریکا نەخاوەنی ئایدۆلۆجیەکی دیاریکراو و نەرابەرایەتیەکی رووناکبیر بوو، ئامانجی سەرەکی ئەو لەپێناو پاراستنی بوونی خۆی لەنێو رژێمی سەرمایەداریدا کورت دەکرایەوە. لەلایەکەوە کرێکاری ئەمریکی هەوڵی دەدا بەوەرگرتنی شێوازی ژیانی ئەمریکایی، ببێتە ئەندام لەچینی مامناوەندی ئەم کۆمەڵگەیە، لەو لاشەوە خاوەن کارگە توانی بەدەستەبەرکردنی بارودۆخێکی ئاراددەیەك لەبار رەزامەندی ئەو بەدەست بهێنێت. بەرژەوەندی

تایبەتی لەسەرووی هەموو بەرژەوەندییەکانەوە دانراوە و هەر لەبەر ئەوەش بوو کەدام و دەزگا کرێکارییەکان لەپێناو یەکریزی چینایەتیدا کاریان نەدەکرد. زۆربەی کرێکارەکان بەبێ ئەوەی بچنە نێو هیچ دامەزراوەیەکەوە لەپیشەکەی خۆیاندا لەگەڵ خاوەن کارگەکان ڕێکدەکەوتن و لێك تێگەشتنێکی بەرامبەر کێ لەنێوانیاندا سەری هەڵدەدا.

تایبەتمەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگە لەجێگیر بوونی ئەم هەماهەنگییەدا کاریگەرییەکی زۆری هەبووە. دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەمای کار و چالاکی تایبەتی [تاکەکەسی]و کۆکردنەوەی سەرمایەی تاکەکەسی دانران. قانوونی ئەساسی ئەمریکا دانی بەسنووری خاوەندارییەتی تایبەتیدا ناو جەختیشی لەسەر [پەیڕەو کردنی] ئەم چەمکە لەبوونیادە سیاسییەکاندا کردەوە. دادگاکانیش پشتیوان و پارێزەری خاوەندارییەتی تایبەتی بوون، جگە لەوەش بەگەشەکردنی باوەڕ بەچانسی یەکسان و بەرامبەر بۆ پێشکەوتن، چەمکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان شوێنی چەمکی چینایەتی گرتەوە. لەکۆمەڵگایەکدا کە ڕێگای پێشکەوتن و بەرەو پێش چوونی واڵا کرابوو، ڕۆڵەکانیش پێکەوە بەسترانەوە، لە ئەنجامدا جەخت لەسەر هەماهەنگی ئێستا کرایەوە، نەك دوانییە دژییەکەکان و ناکۆکییەکان. هۆکارێکی دیکەش هاتنە ناوەوەی نەتەوە جۆراوجۆرەکان بوو کە دەبوونە ئاستەنگ لەبەردەم یەکریزی و تەبایی چینایەتیدا. کرێکارە کۆچبەرەکان لەزمانی یەکتر تێنەدەگەشتن و لەرووی فەرهەنگیشەوە جیاواز بوون و جیاوازی ڕەگەزیش، خۆی لەخۆیدا کێشە و گیروگرفتێکی زۆری بەدوادا دەهات. بەڵام یەکریزی و یەکگرتوویی کرێکاری ئەمریکی لەرووی پیشەییەوە بەرجەستە کرا. ڕابەرانێکی وەك ((کومپر))کە ناماغی دامەزراوە کرێکارییەکانیان لەسەر بنەمای گفتوگۆ لەگەڵ خاوەن کارگەدا بۆ زیادکردنی کرێ و چاککردنی مەرجەکان کارکردن دادەنا، توانیان بەردەوام بن و سەرکەوتنیش بەدەست بێنن. ئەم دامەزراوانە لەسەردەمی ((فرانکلین ڕۆزفلت))دا بەچوونە نێو ((یەکیەتی کرێکارانی پیشەسازی)) توانیان وەك فراوانترین یەکیەتی کرێکاری خۆیان بنوێنن و بەکۆکردنەوە دامەزراوە بچووکەکان لەژێر چەتری پشتیوانیدا، ببنە ڕێکخراوێکی سەرەکی لە ژیانی ئابووری و سیاسی ئەمریکادا. لاوازی ڕاپەرینی سۆسیالیزم و نەبوونی سەرهەڵدانی حیزبە کرێکارییەکان ـ بەبەراوورد لەگەڵ وڵاتە پیشەسازییەکانی دیکەی وەك ژاپۆن، ئنگلستان، ئەڵمانیا ، ئیتالیا ـ لەتایبەتمەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکایی ئەو سەردەمە بوو.

هاوکات لەگەڵ گەشەی خێرای پیشەسازی لەناوچەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتدا، لەویلایەتەکانی ڕۆژئاواشدا چەند گۆڕانکارییەك ئەنجام درا، کە ئەم گۆڕانکارییانە دواتر یارمەتی دەرێکی باش بوون بۆ

بەرەو پێش چوونی ئەو ناوچانە لەزۆربەی بوارەکاندا. گەشەسەندنی بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات و دروستکردنی لەوەڕگەی فراوان، پیشەی بەخێوکردنی ئاژەڵی لەوناوچانەدا پەرەپێدا. دۆزینەوەی زێڕ لە کالیفۆرنیا و ویلایەتەکانی رۆژئاوا، سەرنجی زۆرێك لەکۆچبەرانی دەرەوەی بۆناوچەکانی رۆژئاوا راکێشا و سیاسەتی دەوڵەتیش لەبەخشینی زەوی کشتووکاڵی و هاندانی کۆچکردن بەرەو رۆژئاوا یارمەتی دەرێکی باش بوو بۆ نیشتەجێکردنی خەلکی و ئاوەدانکردنەوەی ئەو ناوچانە. لەگەڵ پەرەسەندنی پیشەسازیدا، کۆمەڵێك کۆرانکاری لە بەکارهێنانی زەویە کشتووکاڵیەکاندا کرا. بەکارهێنانی ئامێری کشتووکاڵی، کووتی کیمیایی و هۆکارەکانی لەناوبردنی ئافاتی رووەك و چاککردنی تۆوی کشتووکاڵی، بەرهەمهێنانی دانەوێڵە، لۆکە و بەروبوومە پیشەسازیەکانی دیکەی چەند سەد ئەوەندە پەرە پێدا. پێش شەڕی ناوخۆ بازاڕی بەرهەمی کشتووکاڵی زۆرکەم بوو، بەڵام ئەو گۆڕانکاریەی کە لەڕووی ئامێرەکانی هاتووچۆوە. ئەنجام دران بازاڕەکانی ناوخۆی ئەمریکای بەناوچەکانی دیکەی جیهانەوە بەستەوە، جووتیارەکان دەسەڵات و کۆنترۆڵی خۆیان بەسەر بازاڕەکانی فرۆشتنندا لەدەستدا، نرخی بەروبوومی کشتووکاڵی لەسەر بنەمای داوخواستی بازاڕە جیهانیەکان دیاری دەکرا، زۆربوونی بەروبوومی کشتووکاڵی لە ئەورووپا، ئوسترالیا، یان ناوچەکانی دیکەی جیهان کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی لەسەر داکشانی نرخی بەروبوومەکانی ئەمریکا هەبوو. جگە لەوەش بەهۆی زۆربونی بەرهەمی کشتووکاڵیەوە نرخی بەروبوومی کشتووکاڵی ئەو وڵاتە داشکانێکی بێ وێنەی بەخۆوە بینی ـ بەبێ ئەوەی جووتیارەکان لەدیاریکردنی نرخەکاندا بەشداریان کردبێت. ئەو گۆڕانکاریانەی کەبەسەر لایەنی پیشەسازیدا هات کاری لەبیناى دارایی وڵاتیش کردبوو. جووتیاران و کۆلکە بازرگانەکان زیاتر لەهەموو گروپە کۆمەڵایەتیەکانی دیکە لەژێر پاڵە پەستۆی ئەم کاریگەریەدا بوون و شکانی نرخی بەروبوومی کشتووکاڵی، خراپی ئاووهەواو کەمی رێژەی بەرهەمهێنان، سەپاندنی کرێی گران و قورس لەلایەن کۆمپانیاکانی هێڵەکانی ئاسنەوە، هەموو ئەم هۆکارانە هەرەشەیەکی گەورەیان شکست بوونی ئەم گرووپە درووست کردبوو، کە زۆربەشیان زەویەکانیان لەگرەوی بانکەکاندا بوو. ڕاپەرینە پەراگەندەکان لەکۆبوونەوەی جووتیارانی ناڕازی، لەشێوەی سەندیکا جووتیاریەکانی وەك ((گرانجێرز)) و ئەندامانی گرووپی سیاسی ((گرین بك)) و یەکیەتی جووتیارانی سەندیکا کرێکاریەکانی ((پاپۆلیست))دا دەرکەوتن و هەوڵیاندا شێوەیەکی سیاسی بەناڕەزاییەکانیان ببەخشن. ئەوان لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٨٩٢دا توانیان ژمارەیەك نوێنەر و سیناتۆر ڕەوانەی کۆنگرێس بکەن و چەند حکومڕانێکی ویلایەتی بۆ خۆیان هەڵبژێرن.

بەسەر هەڵدانی قەیرانی دارایی لە ساڵی ١٨٩٣، شۆڕشی جووتیاران پانتاییەکی فراوانتری گرتەوە، بەیەکگرتنی گروپە یاخیبووەکان ڕاپەڕینێکی گەورەی جەماوەری سەری هەڵدا و دواتر بەدامەزراندنی حیزبێکی نوێی بەناوی ((پاپۆلیست)) کۆتایی پێهات، ئەم لەململانێ سیاسیەکاندا بۆ بەدەست هێنای دەسەڵاتی سیاسی مەسەلەیەکی نوێی وورووژاند کە ئەویش مەسەلەی یەکەی دراوی زیوو بوو. هەرچەندە مەسەلەی یەکەی دراوی زێڕ و زیوو بەبەردەوامی جێگای مشت و مڕی سیاسی نێوان گروپەکان بووە. لایەنگرانی سیستەمی دوویەکەی زێڕ و زیوو لایەنگرانی یەکەی زێڕ تاکۆتایی سەدەی نۆزدەیەکیش هەر لەسەر ئەم مەسەلەیە کێشەیان هەبوو. جووتیارەکان وایان دەزانی کە ڕەواجی دراوی زیو گیروگرفتە ئابووریەکانیان چارەسەر دەکات و نرخەکان بەرز دەکاتەوە و بەڕەواج پەیداکردنی دۆلاری زیویش نرخی پارە دەبوو ژێتەوە. نوێنەرانی ویلایەتەکانی ڕۆژئاوا. لایەنگرانی دراوی زیو لەکۆنگرەدا یاسایەکیان پەسەند کرد کە بەپێی ئەو یاسایە لەسەر دەوڵەت پێویست دەکرا، کە ڕێژەیەکی دیاریکراو زەوی بکڕێت و دووبارە دۆلاری زیو ڕەواج پەیدا بکاتەوە. بەڵام ئەم سیاسەتی دراوە کێشەی جووتیارەکانی چارەسەر نەکرد. چونکە ڕێگەی لەداکشانی نرخی بەرووبومی کشتوکاڵی گرت، نەداشکانی بەهای زیو. بەتایبەت کەبەدۆزینەوەی کانەکانی زیوی ئاریزۆنا، کلۆرادۆ و ڤنوانىا و خستنە بازاڕی، بەهای زیو کەمیکردو نرخەکان بەگشتی داشکان. دەوڵەت دەرکردنی دۆلاری زیوی ڕاوەستاند و، ترسی وەرشکست بونی جوتیاران بە ئاشکرا هەستی پێدەکرا، بەتایبەت کە بانکەکانی ویلایەتی ڕۆژئاوا یەکەمین دام و دەزگا بوون کە زیانی ماددیان لێکەوت.

لەکاتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٨٩٦، بەپێکهێنانی هاوپەیمانیەك لەنێوان حیزبی دیموکرات لەگەڵ ((پاپۆلیست))دا توانیان وەك هێزێکی گەورە خۆیان بناسێنن. ((ویلیام جنینگز برایان)) کەووتارێژێکی زۆر بلیمەت بوو هەروەها لەنێوان گرپە جوتیاری و کرێکاریەکاندا زۆر خۆشەویست بوو، لەلایەن حیزبی دیموکراتەوە بۆ کاندیدی سەرۆك کۆماری پێشنیاز کرا، لەبەرامبەردا حیزبی کۆماریخواز ((مەك کنیلی)) وەك کاندیدی هەڵبژاردنەکانی خۆی دیاری کرد. سەرمایەدارە گەورەکان و بانکداران و کەسایەتیە دەسەڵاتدارە حیزبیەکان لەپێناو هەڵبژاردنی ((مەك کنیلی))و پوچەڵکردنەوەی هەڕەشەی ڕکە بەرەکانی، هەموو جۆرە سەرچاوە و هۆکارێکیان بەکارهێنا. لەزۆربەی شوێنەکاندا کارگەکان ڕووبەڕووی هەڕەشەی داخستن و بێ کاری دەبوونەوە، ئەگەر ((مەك کنیلی)) کاندیدی حیزبی کۆماریخوازی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنابایە. کۆمپانیاکانی بیمە بەڵێنیان بەجووتیارەکاندا کەئەگەر حیزبی کۆماریخوازەکان سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، بیمەی زەویەکانیان و بەڵگەنامەکانیشیان بۆ ماوەی پێنج ساڵی دیکە تازە دەکەنەوە. ((برایان)) پشتی بەبەدەستهێنانی دەنگی لایەنگرانی

چاکسازی ، جووتیاران، کرێکاران و چینی مامناوەندی کەم دەرامەت بەستبوو، بەڵام هێز و سەرمایە و دەسەڵات، بۆ پشتیوانی کردنی ((کنیلی)) خرابوونە گەڕ، لەئەنجامدا حیزبی دیوکرات بەجیاوازیەکی کەم لەدەنگدانێکی ڕاستەوخۆ شکستی خوارد و دۆڕاندنیان کۆتایی هێنان بوو بە دەسەڵات و چالاکی ڕاستەوخۆی جووتیاران لەکاروباری سیاسی وولاتدا.

لەم قۆناغەی ئەمریکادا کەقۆناغی گواستنەوەی (انتقالی) کۆمەڵگەی ئەمریکایە، هاوڕێزی و یەکگرتوویە نێوان گروپە کرێکاری و جووتیاریەکان سەرنج ڕاکێش بوو ـ هەردوولا هۆکاری سەرەکی بەرهەمهێنان بوون و لەسەرهەڵدانی گۆڕانکاریە پیشەسازیەکاندا ـ گیروگرفتی هاوبەشیان هەبوو. ئەو بیرۆکانەی کە خستیانە ڕوو، هۆکارێکی سەرەکی بۆ چاکسازیەکانی داهاتوو بوون. چاککردنی مەرجەکانی کارکردن، دیاریکردنی هەشت سەعات کاری ڕۆژانە، دەستێوەردانی دەوڵەت لە ڕێکخستنی کاروباری گواستنەوە و هاتووچۆ، دیاریکردنی نرخی هێڵەکانی ئاسن، تەلەگراف و تەلەفۆن، هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆی سناتۆرەکان و دانانی باجی بەردەوام لەو جۆرە پێشنیازانە بوون کە لەسەدەی بیستەمدا گرنگیان پێدرا و بەکردەیی پراکتیك کران.

ئەوەی لەداواکاری و خواستەکانی ئەم گروپەدا گرنگ و پڕ بایەخ بوو، زەروریەتی دەستێوەردانی دەوڵەت و لێپرسراویەتی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بوو لەڕێکخستنی کاروباری ئابوریدا، کە دەوڵەت نەتەنها لێپرسراوە لەبەرامبەر بەرژەوەندی سەرمایەدارەکاندا بەڵکو لێپرسراویشە لەبەرامبەر پاراستنی بەرژەوەندیەکانی تێکڕای خەڵکیدا. لەسەرەتای دامەزراندنی کۆماری ئەمریکاوە درووشمی، ((حکومەتێك چاکترە کە کەمتر حکومەت بکات)) کاریگەریەکی ڕاستەوخۆ لەسەر سیاسەت و کاروباری ئابووریدا درووست کرد. گۆڕانکاریە پیشەسازیەکانی پاش شەڕی ناوخۆ، سیاسەتی دەست تێوەرنەدانی دەوڵەت لەکاروباری ئابووری و هاندان و پشتگیری سەرمایە گوزاری تایبەتی لەگەڵ خۆی هێنا. ڕاپەڕینی ((پاپۆلیست)) یان لایەنگرانی حیزبی گشتی، ئەو گروپانەی لەدەوری خۆی کۆکردەوە، کەمزیاتر لەخەڵکانی دیکە لەلایەن ئەم سیاسەتەوە زیانیان بەرکەوتبوو. پێشنیازە چاکسازیەکانیان، سەرنجی دەوڵەتیان بۆ ئەرکە فراوانەکەی خۆی ڕاکێشا و بوون بەهۆکارێکی سەرەکی لە جێبەجێکردنی یاسا و چاکسازیەکانی سەردەمی ڕووداوە پێشکەوتن خوازیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا. گۆڕانی شێوازی ژیانی جووتیاری ئەمریکایی، دەرئەنجامی کاریگەری ڕاستوخۆی بە پیشەسازی بوونی کۆمەڵگە و کاریگەریەکانی شێوازی ژیانی شارنشینی بوو بۆسەر هەموو لایەنەکانی دیکە. بنەما کلتوریەکانی کۆمەڵگە وەك کلێسە و خێزانیش لەژێر کاریگەری ئەم ڕووداوە ئابووری و گۆڕانکاریە پیشەسازیانە. گۆڕانێکی بنەڕەتیان بەسەردا هات.

لویس و کلازك

کۆچی کۆچبەران لە ساڵەکانی ١٨٠٠

گواستنەوەی کۆچبەران بەکەشتی لە ساڵی ١٨٠٨

گرووپێك لە کرێکارانی پیشەسازی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم

ژنان لە کاری بەرهەمهێنانی پیشەسازی

منداڵان و ماوەی درووودرێژی ئیشکردن

## بەشی حەوتەم:

# سەردەمی ڕووداوە پێشکەوتن خوازیەکان
# کۆتایی هاتنی کۆشەگیریی سیاسی

ساڵەکانی نێوان ١٩٠٠-١٩١٧ بەسەردەمی ڕووداوە پێشکەوتن خوازیەکان بەناو بانگە. لەم سەردەمەدا چەند ڕاپەڕینێکی چاکسازیخوازانە بۆ ڕێگەکرتن لەکارە دزێوەکانی سەرمایەدارەکا سەریان هەڵدا. کۆمەڵە یاسایەکیش بۆ ڕێکخستنی کاروباری بازرگانی،لەکۆنگرەدا بڕیاریان لەسەر درا. بەگرنگیدان بەو گیروگرفتانەی کە ڕووبەڕووی شارەکان دەبوویەوە، چاککردنی لایەنی بەڕێوەبردنی شارە گەورەکان ، دانانی باج لەسەر دەرامەت، پشتیوانی کردن لەبەکاربەر، هەڵبژاردنی سیناتۆرەکان لەڕێگەی دەنگدانی ڕاستەوخۆوە، باشتر کردنی مەرجەکانی کارکردن، وردە وردە نارەزاییەکان کەم بوونەوە و هەوڵێکی زۆریش لەپێناو ڕاستکردنەوەی نایەکسانیەکان درا. ئەم چاکسازیانە پەرچە کردارێك بوون لەبەرامبەر گۆڕانکاریە خێراکانی پیشەسازی ونەو گرفتە کۆمەڵایەتیانەی کەلێی کەوتبوویەوە.یاسای ((دژە تراست))ی شرمان کەلە ساڵی ١٨٩٠ پەسەند کرابوو، بەزیادکردنی چەند یاسایەکی چاکسازی نوێ پشتیوانی کرا. بەڕێوەبەرایەتیەك بۆ چاودێریکردنی کاروباری بازرگانی لەسەرتا سەری دەوڵەتی فیدرڵیدا دامەزرا. دانانی باج لەسەر دەرامەتی کۆمپانیاکان بۆ یەکەمین جار بایەخی پێدرا. بەجێبەجێکردنی یاسا چاکسازیەکان، بنەماکانی لیبراڵیزم کە کۆمەڵگەی ئەمریکایی لەسەر بووبنیاد نرابوو زیاتر بەهێز بوون. لەگەڵ هاتنە سەرکاری ((ڤدرۆ ویلسۆن)) لەساڵی ١٩١٢، ئەم چاکسازیانە ناراستەیەکی دیاریکراویان وەرگرت، بیرۆکە چاکسازی خوازەکانی ئەم سەردەمە و بایەخدان بەگرفتەکانی ژیانی شارنشینی و کرێکاری، بوونە هۆی کەم بوونەوەی دەنگی نارەزایی خەڵك و کۆسپێکیش لەبەردەم پەرەسەندنی سۆسیالیزمدا.

((ئەمریکا لەلادێدا لەدایك بوو، لەشاردا گەشەی کرد)) ئەم ڕستەیەی مێژوونوسی ئەمریکی ((هافستارد)) بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەم گۆڕانکاریانەی کەشۆڕشی پیشەسازی لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا لەو وڵاتە هێنایە ئاراوە. لەسەرەتای پێکهێنانی حکومەتی کۆماریدا شارە گەورەکانی ئەمریکا بەپەنجەی دەست دەژمێرران. فیلادلفیا لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا بیست و پێنج هەزار دانیشتوانی هەبوو و بەیەکێك لەگەورەترین شارەکانی ئیمپراتۆری ئینگلیز دەژمێررا، بەڵام ژمارەی شارەکانی هاوشێوەی فیلادلفیا زۆر کەم بوون و تێکڕای شارنشینەکان، ڕێژەیان ١٠٪ تێپەڕیان نەدەکرد. لەسەدەی نۆزدەیەمدا ژمارەی شارنشینەکان زیادیکردوو تاسەردەمی شەڕی ناوخۆ نزیکەی ٢٠٪ی دانیشتوان لەشارەکاندا نیشتەجێ بووبوون. گۆڕانکاریە پیشەسازیەکان و پەرەسەندنی کارگەکان و دامەزراوە سەرەکیە بازرگانیەکان، هۆکاری سەرەکی زیادبوونی دانیشتوانی شارەکان بوون ـ بەڕادەیەك کەلەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا لەنێو دە هاوڵاتی ئەمریکیدا چوار کەسیان شارنشینی بوون. سەرژمێریەکی ساڵی ١٩٢٠ لەئەمریکا ، ڕێژەی دانیشتوانی شارەکان بە زیاتر لە ٥٠٪ی تێکڕای دانیشتوان دەخەمڵێنێت.

شارەکان زۆرجار قەرەباڵغ، پیس و پۆخڵ و لەڕووی بەڕێوەبردنیشەوە گەندەڵ بوون، کۆچبەرەتازە هاتووەکانیش، کە لەلادێکانی ئەورووپاوە و لەپێناو ژیانێکی چاکتردا ڕوویان لەئەمریکا کردبوو، زۆرینەی دانیشتوانیان پێك دەهێنا. بەدرێژایی ساڵەکانی سەدەی نۆزدەیەم زیاتر لەسی و هەشت ملیۆن کۆچبەر هاتبوونە نێو ئەمریکا و لەنێوان ساڵەکان ١٩٠٢ ـ ١٩١٢ ساڵانە زیاتر لەنیو ملیۆن کۆچبەر پەنایان بۆ کەنارەکانی ئەو وڵاتە دەهێنا. ئەم کۆچبەرانە زیاتر لەووڵاتە هەژارەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی ئەورپاوە دەهاتن و لەڕووی فێرکردنیشەوە لەکۆچبەرەکانی پێشوو لاواز تربوون. زۆر جاریش لەماڵێکی دیاریکراوی شارەکاندا لەدەوری یەکتر کۆدەبوونەوە و بەپێی کلتور و داب و نەریتی و نەریتی خۆیان بنچینەی ژیانێکی دیکەیان دادەمەزراند. ئەگەر گیروگرفتێکیشیان ڕووبەڕوو دەبوویەوە، لەبەر نەتوانایی خۆیان بوو لەخۆ گونجاندنیان لەگەڵ ئەم ژینگە نوێیەدا. زۆربوونی دانیشتوان، نەبوونی خزمەتگوزاری تەندروستی، کێماسی لەدابەشکردنی سەروەت و سیاسەتمەداران و لێپرسراوانی گەندەڵی، لەکۆتایەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا کێشە و تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆریان ڕووبەڕووی شارنشینەکان کردەوە. بۆنموونە شارێکی وەك شیکاگۆ لەساڵی ١٨٩٠دا نزیکەی ٨٠٪ی تێکڕای کۆچبەرەکان یان نەوەی یەکەمی کۆچبەرەکانی لەخۆ گرتبوو. کۆچبەری

ئەڵمانی، ئایرلەندی و ئەسکەندەنافیایی ئەوەی کۆچبەرەکانی پێشووتریان پێك دەهێناو ژمارەیەکی زۆری کۆچبەرانی پۆڵەندی و چیکی و لیتوانیایی و ئیتاڵی و جوولەکەکانی ئەورووپای رۆژهەڵاتیش، دانیشتووی تازە هاتووی ئەو شارە بوون و، هەریەکە و بەپێی هاوشێوەیی رەگەزیان لەچەند گەرەکێکی جوودا و جیاوازدا کۆدەبوونەوە. ئەم ((گەڕەکانە)) لەبەر ئەوەی دانیشتوانەکەی، خەڵکی کۆچبەر و هەژار بوون، بەو خانوو و باڵەخانە رزیوانەی کە تیایدا دەژیان و، ئەو کۆڵانە پیس و پۆخڵ و ناوەرۆ بۆگەنانە و ئەو ژینگە پڕ لەهەژاری و نەخۆشیەی کە بەنیاز بوون تیایدا بحەسێنەوە، لەگەڵ قەرەباڵغی لەرادەبەدەری دانیشتوانەکەی، لەبارترین زەمینەیان بۆ نەش و نما کردنی فەساد رەخساند بوو. بەد رەوشتی، گرفتی ژنانی کۆچبەر، بەکارهێنانی منداڵان لەکارگەکانی بەرهەم هێنان، نیگەرانی و پەرێشانی ئەو کرێکارانەی کەڕووبەڕووی گرفتی کرێی کەم و ماوەی دوور و درێژی کارکردن دەبوونەوە، بارودۆخێکی پڕ لەمەترسی و کارەسات بەسەر شارەکاندا سەپاند. هیچ کام لەم شارە سەرەکیانە خاوەنی سیستەمێکی رێك و پێکی سەربازی نەبوون و لێپرسراو و بەرێوەبەرەکانیان کەتەنها لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان پشتیوانیان لەگروپێکی دیاریکراو دەکرد، گیروگرفتە کۆمەڵایەتیەکانیان زیاتر دەکرد. پۆلیس بەهۆی ئەو ئەڵقەیەی کە لەگەڵ گروپێکدا گرێی دەدا، دژ بەگروپێکی ترڕەفتاری دەکرد. کۆچبەرەکان بەهۆی داب و نەریت و رێو رەسمی تایبەتیانەوە، هەڵسوکەوتی ((غەیرە ئەمریکیان)) دەنواند و بەدیدێکی کوماناویەوە سەیری ئەمریکایەکانیان دەکرد.

کۆچبەرە تازەهاتووەکان بەناسنی لەلایەن کۆمەڵگەی ئەمریکیەوە وەرنەدەگیران. ئەو زمانەی کەئاخاوتنیان پێدەکرد، پۆشاك، خۆراك و شێوازی ژیانیان سەرسوڕهێنەر و نامۆ بوو. زۆرجار ئەوەی یەکەمی کۆچبەرەکان بوون کەهەموو گرفتانەیان رووبەڕوو دەبوویەوە و، منداڵەکانیان تارادەیەك ناسانتر دەیانتوانی ببنە ئەندام لەکۆمەڵگەدا. بەفێربوونی زمانی ئینگلیزی و شێوەزارەکانی ئەمریکا، بەئاسانی لەگەڵ ژینگەی نوێدا ئاوێتە دەبوون. بۆچینی لاوان، دابڕان لەداب و نەریتی کۆن و بەسترانەوە بەژینگەی نوێ، هەلێکی لەبار بوو بۆ هەنگاونان بەرەو پێشکوتن و سود وەرگرتن لەدەرفەتە یەکسانەکان . ئەڵمانی و ئێرلەندی، جوولەکە، ئیتالیایی، پۆڵەندی و ئەوانی دیکەش کە لە ((ئیشتیمانە کۆنەکەیان)) دابڕابوون، بەهەوڵ و تێکۆشانی خۆیان، توانیان رێگایەك بۆ چوونە ناو کۆمەڵگەی ئەمریکی بدۆزنەوە. بەڵام ئەو کۆمەڵگەیەی کە کۆچبەرە بیانیەکانی کەم تا زۆر لەنێو خۆیدا جێدەکردەوە، هەمیشە دەرگاکانی بەرەو رووی رەشەکاندا داخرابوون .

دەمارگیریە نەژادیەکان و بوارێکی گەورەی لەنێو ڕەشپێستەکان و گروپە کۆمەڵایەتیەکانی دیکەدا درووستکرد. ڕەنگی پێست ئەم گروپەی لە کەمایەتیەکانی دیکە جیادەکردەوە. ڕەش بۆهەرشوێنێك بچووبایە ڕووبەڕووی دەمارگیری دەبوویەوە. ئەو یەکەمین کەسەبوو کەلەبارودۆخە ناهەموارە ئابووریەکاندا لەسەر کار لادەبراو کۆتا کەسیش بوو کەلەسەر پیشەیەك دانەمەزرا. لەو کاتانەی کە گیروگرفتی کرێکارەکان دەگەشتە لوتکە، ڕەشەکان بۆ شکاندنی مانگرتنەکان بانگهێشت دەکران. ئۆبالی هەموو توندوتیژیەکانی کۆچبەر و سپی پێستە هەژارەکانیش لەئەستۆی ئەم ڕەشانەدا بوو. هەر ئەندازە کەرێژەی ڕەشەکان لەنێو شارەکاندا زیادی دەکرد، بەهەمان ئەندازەش توند و تیژی سپی پێستەکان دژ بەو نەژادە چڕتر دەبوویەوە. پیشە و ئیش و کاری کەم دەرامەتی وەك پاك و خاوێنی شارەکان، پاسەوانی کۆشکەکان یان کارەکەری نێو ماڵەکان هەر لەئەستۆی ڕەشەکاندابوو. قوتابخانەکان، کڵێسە و شوێنی ژیانیان لەوانی تر جیادەکرایەوە. گەڕەکەکانیشیان هیچ جۆرە مەرجێکی ژیانی تێدا بەدی نەدەکرا. شووقەکانیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کاولتر و کۆنتر دەبوون و خاوەن سەرمایەکانیش بەهیچ شێوەیەك ئامادەی بەکرێدانی خانوو بە ڕەش پێست نەدەبوون و هەژاری و پەرێشانی دانیشتوانی ئەو گەڕەکانە تادەهات زیاتر دەبوو. قەیرانی گەڕەکە ڕەش نشینەکان کەبە ((گتو)) ناوبانگیان دەرکرد، ئەنجامی ڕوون و ئاشکرای ئەو هەموو توندوتیژیانەی سپی پێستەکان و پشت گوێخستنی شێوازی ژیانی ئەو نەژادەی مرۆڤەکان بوو. پەرەسەندنی ((گتو)) لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا چەندەها گیروگرفتی کۆمەڵایەتی بەدوای خۆیدا هێنا. توندوتیژی، فەساد و تاوان وەك دیاردەیەکی ئاسایی و باوی لێهات و هەژاری و داماوی باڵی بەسەر ئەم ناوچانەدا کێشا ـ هەژاریە کەتەنها دانیشتوانی ((گتو)) تێیدا دەبوونە قوربانی.

لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، لایەنی فێرکردن بەتەنها هۆکار و چارەسەرێك بۆ وەرگرتنی ڕەشەکان لەکۆمەڵگەی ئەمریکیدا دەژمێررا. ((بوکرتی واشنگتۆن)) کە یەکێك بوو لەڕابەرانی ڕەش پێستەکان، چالاکیەکانی خۆی بەدرووستکردنی قوتابخانەی پیشەیی و هونەری تایبەت بەڕەشەکان دەست پێکرد و باوەڕیشی وابوو کەپەرەپێدانی بواری فێرکردن ئەنجامێکی پۆزەتیڤی لەڕووی خۆشگوزەرانی و مادیەوە لێدەکەوێتەوە. یەکێك لەڕابەرە بەناوبانگەکانی سەدەی نۆزدەیەم ((دی بویز)) بوو. ناوبراو دەرچووی زانکۆی هاروارد و مامۆستای کۆمەڵناسی بوو لە ئاتلانتا. کتێبێکی بەناوبانگی دەربارەی نیشانەکانی نەژادی ڕەش بڵاوکردەوە و لەساڵی ١٩٠٣ توانی وەك کەسایەتیەکی ناودار و ڕووناك بیری ڕەش پێست خۆی بناسێنێت. هاوڕێزی

ڕەش پێستەکانی لەپێناو ململانێ و ڕووبەڕوو بوونەوەی دیاردە ڕەگەز پەرستیەکان، لەجیاتی دانوسان و ڕێگای ئاشتیانە پێشنیار دەکرد. پێی وابوو کەرەشەکان پێویستە گرنگی بەرەگ و ریشەی فەرهەنگی و نەژادی خۆیان لەگەڵ ئەفریقادا بدەن، چاوەڕێی پشتیوانیکردنی سپی پێستەکان نەبن و وەك گروپی جۆراوجۆر لەکۆمەڵگەدا کاربکەن.

((ئەنجوومەنی میللی پێشکەوتنی ڕەشەکان)) بەیارمەتی ((دی بویز)) لەساڵی ١٩٠٩ دامەزرا. ئەو ئەنجوومەنە لەپێناو ڕلایفۆرمی کۆمەلآیەتی، ئاگادار کردنەوەی ڕەشەکان لەو بارودۆخەی کەتیایدا دەژیان و هوشیار کردنەوەیان لەڕووی سیاسیەوە هەوڵی دەدا.

گیروگرفتەکانی شارنشینی کرێکاری لەدەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، کاریگەریەکی زۆریان لەسەر پەرەسەندنی ڕاپەڕینی سۆسیالیزمی هەبوو. بۆچونەکانی ((مارکس)) دوای ساڵەکانی ١٨٥٠، لەلایەن گروپێك لەکۆچبەرانی ئەڵمانیەوە لەئەمریکا بلاوکرانەوە. ئەم کۆچبەرانە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ ((مارکس)) و بەتایبەت ((ئینگلز))دا هەبوو. ((مارکس)) بۆماوەیەکی زۆر ووتاری بۆ ڕۆژنامەی ((نیۆیۆرك تریبۆن)) دەنوسی. بەلآم بازنەی چالاکی سۆسیالیستەکانی ئەمریکا لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا سنووردار بوو و، ئەم بۆچوونانە زیاتر لەناو کۆچبەرە ئەڵمانیەکاندا دەنگیان دەدایەوە و، ئەوانی دیکە وەك دیاردەیەکی بیانی و غەیرە ئەمریکی سەیریان دەکرد. ((فلۆرانس کلی)) یەکێك بوو لەو ژنە خوێندەوارانەی کە پەیوەندی کرد بەم گروپەوە. ناوبراو پاش ئەوەی لەبەر نافرەت بوونی لەبەشی یاسای زانکۆی پەنسلڤانیا، وەرنەگیرا، ڕووی لە زووریخ کرد و لەوێ خوێندنی یاسایی تەواو کرد، دواتر لەگەڵ کۆچبەرێکی خەڵکی ئەمریکای ڕۆژهەلآت خێزانی پێك هێناو لەگەڕانەوەیدا بۆ ئەمریکا نوسراوەکەی ((ئینگلز))ی دەربارە ژیانی چینی کرێکارانی وولآتی بەریتانیا بۆسەر زمانی ئینگلیزی وەرگێڕاو بلآوی کردەوە. ئەو ئەندامی حیزبی سۆسیالیستی کرێکارانی ئەمریکا و بەیەکێك لەئەندامە چالاکەکانیش دەژمێراو، لەبواری ریفۆرمی کۆمەلآیەتی و پشتیوانی کردنی چینی بەکاربەر و ژنان و مندالآندا چالاکی هەبوو. ((دانیەل دلئۆن)) یەکێکی دیکە بوو لەو ئەمریکاییانەی کەپەیوەندی کردبوو بەم گروپەوە. ئەو سەرنوسەری ڕۆژنامەیەکی وابەستە بەحیزبی سۆسیالیست بوو، کە چالاکیەکانی خۆی لەبواری گشتاندنی بیروڕاکانی سۆسیالیزم لەنێو چینی کرێکاراندا چڕ کردبوویەوە و لەساڵی ١٩٠٥ لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوبیرەکانی خۆی کۆمەڵی ((کرێکارانی پیشەسازی جیهان))ی دامەزراند. ((یوجین دبس)) کەلەساڵەکانی ١٨٩٠ سەندیکای کرێکارانی هێڵەکانی ئاسنی دامەزراند و لەکاتی مانگرتنی

کرێکارانی ((پوڵمن))دا پشتگیریەکی تەواوی لەم هەنگاوەیان کرد، لەسەرەتاکانی سەدی بیستەمدا توانی جەماوەرێکی زۆر لەدەوری حیزبی سۆسیالیسی ئەمریکادا کۆبکاتەوە و لەساڵی ١٩١٢ خۆی بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری کاندید کرد و نزیکەی ٦٪ی تێکڕای دەنگەکانی بەدەست هێنا. ئەم سەردەمە شاهیدی چالاکی بەربلاوی سۆسیالیستەکانە لەئەمریکادا. ژمارەیەك لەئەندامانی حیزب لەهەڵبژاردنە مەحەلیەکانی شارەکاندا سەرکەوتنیان بەدەست هێناو توانیان دوو نوێنەری خۆیان ڕەوانەی کۆنگرێسی ئەمریکا کرد. پاش هەڵبژاردنی ((ویلسۆن)) بۆ سەرۆك کۆماری، گرفتە کۆمەڵایەتیەکان گرنگیەکی زیاتریان پێدرا. یاسا چاکسازیەکان لەبواری چاککردنی بارودۆخی کارکردن و ڕێگەگرتن لەکارە دزێوەکانی سەرمایەدراەکان، خزانە کار و بەم شێوەیە نفوز و دەسەڵاتی سۆسیالیستەکان هێدی هێدی کەم بوویەوە. لایەنگیری و پشتیوانیکردنی گروپی توندڕەوی ((کرێکارانی پیشەسازی جیهان)) هۆکارێکی دیکەی لاوازبوونی دەسەڵاتی حیزبی سۆسیالیست بوو. سەرکردایەتی کۆمەڵەی ((کرێکارانی پیشەسازی جیهان)) لەئەستۆی ((ئما گۆڵدمن)) ـ وەك ژنێکی خوێندەواری کۆچبەر ـ و ((ئەلکساندەر برکەمن))دا بوو. کرێکاران و چینی خوێندەوار و کۆچبەر، زۆرینەی ئەندامانی ئەم حیزبەیان پێك دەهێناو بەشێوەیەکی گشتی، دژی سیستەمی سەرمایەداری، دامەزراندنی یەکیەتی کرێکاران و بەشداریکردن لەچالاکیەکانی هەڵبژاردن بوون. هوشیاری سیاسی، یەکڕیزی چینایەتی و ڕووبەڕووبوونەوەی کرێکاران لەپێناو تەقاندنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت، زیاتر لەهەموو شتێك سەرنجی ئەم گروپەی ڕادەکێشا. چالاکیەکانی ((کرێکارانی پیشەسازی جیهان)) بەڕێگای ئانارشیستیانە، جێگای ڕەزامەندی دەستەی گشتی کۆمەڵەکە نەبوو و ڕوبەڕووی وەستانەوە. ((ئما گۆڵدمن)) و ((ئەلکساندەر برکەمن)) بەبیانووی نارەزایی دەربرین لەبەرامبەر بەشداریکردن لەجەنگی جیهانی یەکەم لەووڵات دوور خرانەوە. لەساڵەکانی ١٩٢٠، دوو ئانارشیستی کۆچبەری ئیتالی کەناویان ((ساکو)) و ((ڤانزتی)) بوو، بەتۆمەتی ئەنجامدەرانی تاوان دەستگیر کران و لەبارودۆخێکی پڕ لەدەمار گیریدا حکوم و لەسێدارە دران. زۆربەی ئەندامەکانی ((کرێکارانی پیشەسازی جیهان)) گیران و دواتر دوور خرانەوە و ڕاپەڕینەکەیان بەتەواوەتی کپ کرایەوە. ئەم گروپە وەك گروپە توندڕەوەکانی دیکە، لەکۆمەڵگەیەکی محافەزەکار لەگەڵ کرێکارانێکی فرە ڕەگەز و جیاواز، بەپێی هیچ جۆرە هوشیاریەکی چینایەتی بەبلاوکەردوەی بیروبۆچوونی کۆچبەران ـ بەتایبەت ئەڵمانیەکان ـ و پێناسەی ئایدیۆلۆجیەکانی دەرەوە دەژمێران و، هەمیشە کار و

چالاکیەکانیان بەچاوی شك و گومان سەیر دەکرا و، هەموو ئەم هۆکارانە دژ بەم گروپە بەکارهێنراو پلەو پایە و ئیعتیباری ئەوانی لەکۆمەڵگەدا لاوازتر کرد.

گۆڕانکاریە پیشەسازی و شار نشینیەکان کاریگەریان لەسیاسەتی بەڕێوەبردنی کڵێسەکان و ژیانی خێزانەکانیشدا دروستکرد. کڵێسە جۆراوجۆرەکانی پرۆتستانت کەناکۆکیەکانی سەدەی نۆزدەیەمیش لەخزمەتی چینی خۆشگوزەراندا بوون، لەگەڵ گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکانی سەردەمدا، سیاسەتێکی پشتیوانی نوێی بۆ ڕاکێشانی کۆچبەرە تازە هاتووەکان و شارنشینە هەژارەکان گرتە بەر. باوەڕ بەوەی کەلەسەر کڵێسە پێویستە، پشتیوانی هەژاران بێت و چالاکیەکانی خۆی بۆ چاکسازیکردن لە بواری کۆمەڵایەتیدا تەرخان بکات، گرنگیەکی زیاتری پێدرا. بنکەکانی خەمیرکردن لەنێو گەڕەکە هەژارنشینەکاندا جێگیر کران، کۆڕوکۆبونەوەی مەزهەبی جۆراوجۆر بۆ ڕاکێشانی کرێکاران بەرەو کڵێسە ساز کران. بۆچوونی ریفۆرمخوازانە لەسەر ئەو بنەمایەی کە مەسیح پشتیوانی هەژارانە و ئەرکی سەرشانی مەسیحیەتە کە لەپێناو ڕەواندنەوەی گرفتە کۆمەڵایەتی و مەزهەبیەکان هەوڵ بدات، گۆڕانکاریەکی گەورەی لە سیاسەتی بەڕێوەبردنی کڵێسەکاندا ئەنجام دا.

گۆڕانکاریەکی دیکە لەڕووی ژیانی خێزانیەوە بوو. پەرەسەندنی کارگە پیشەسازیەکان ژمارەی کرێکارانی ژن بەخێرایی زیادی کرد. هەرچەندە پێش شەڕی ناوخۆ بەهەزارەها ئافرەت لەنێو کارگەکانی ڕستن و چنین و دام و دەزگا پیشەسازیەکانی دیکەدا ئیشیان دەکرد، بەڵام گۆڕانکاریە ئابووریەکانی پاش شەڕی ناوخۆ ڕێژەی کرێکارانی ئافرەتی بەشێوەیەکی بەرچاو بەرز کردەوە و هۆکارێکیش بوو بۆ دیاریکردنی ڕۆڵی ئافرەت لەکۆمەڵگەدا .

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا زیاتر لە ٢٤٪ی هێزی کرێکاری ئەمریکا، ئافرەتان پێکیان دەهێنا. لەساڵەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا، ڕێژەی ئافرەتانی دانیشتووی ئەمریکا گەیشتە لە ٢٨٪ی تێکڕای دانیشتوان، بەڵام ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی کەکاریان دەکرد بۆ ٥٠٪ بەرز بووەوە. داهێنانەکانی وەك تەلەگراف، تەلەفون، ئامێری نوسین هەلێکی لەباری کارکردنیان بۆ ژمارەیەکی زۆری ئافرەتانی ئەو وولاتە ڕەخساند. خزمەتگوزاری پیشەیی نوێ لەنێو بەڕێوەبەرایەتیەکان، چاپەمەنیەکان، نەخۆشخانە و قوتابخانەکان خرایە بەردەستی ئافرەتان. لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، ژنان مافی ناو نوسینیان لەزانکۆ پێدرا. چەند کۆلێژێکی نمونەیی کچانە، وەك کۆلێژی ڤاسار ١٨٦١ ، ئسمیت ١٨٧٠ ، برین مار ١٨٨٥ لەشارەکاندا دروستکران. بەرەخسانی دەرفەتی کارکردن لەدەرەوەی ماڵەکان ـ کەلەئەنجامی گۆڕانکاری

پیشەسازیەوە بوو ـ پشت بەستنی ئافرەت بەپیاوەکەی و مانەوە لکەمتر بوویەوە و توانی سەربەخۆیەکی مادی بۆخۆی دەستەبەر بکات، دەسەڵاتی باوکیش بەسەر منداڵەکانیەوە تارادەمیەك کەم بوویەوە. قەرەباڵغی دانیشتوانی شارەکان، گۆڕانێکی گەورەی بەسەر شارنشینیدا هێنا، ئاپارتمان نشینی شوێنی کۆشك و تەلاری گەورە و فراوانی گرتەوە، خێزانەکان بەژیانێکی سنووردارتر لەجاران ناچار کران و ژمارەی منداڵەکانیش ڕووی لەکەمی کرد .

گۆڕانکاری پیشەسازی دیسان هۆکارێکی سەرەکی بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئازادی ئافرەتان بوو. لەم قۆناغەدا ئافرەتان زیاتر کاریان لەسەر چاکسازی کۆمەڵایەتی، بەدەست هێنانی مافی دەنگدان و بەشداریکردن لەکاروباری سیاسیدا دەکرد. ئەم چالاکیانە لەساڵی ١٩٢٠ و بەپێی بڕگەیەکی قانوونی ئەساسی بەفراوانبوونی مافی دەنگدان کۆتایی پێهاتوو ژنانی ئەمریکا بەمافە سیاسیەکانی خۆیان شاد بوون. لەبواری چاکسازی کۆمەڵایەتیشدا ئەوەی جێگای سەرنج و بایەخدانی ئافرەتان بوو، مەسەلەی بەدادا چوونی دیاردەی بەدڕەوشتی، قەدەغەکردنی مادە بێهۆشکەرەکان، گرنگیدان بەژیانی هەژاران و ڕێگەکرتن لەزوڵم و زۆری کارمەندە ئیداریەکان بوو. ((جین ئادامز)) بەدامەزراندنی پێگەیەك بەناوی ((هال هاوس)) لەشیکاگۆ، چالاکیەکی بێ سنووری بۆ بەدواداچوونی ژیانی هەژاران و سکاڵایان لەو هەموو زوڵم و ستەمەی کەلەلایەن لێپرسراوانی شار و پۆلیس و دام و دەزگا سەربازیەکانەوە لێیان دەکرا، دەست پێکرد. ((شارلوت پەرکنیز گیلمەن)) کتێبێکی دەربارەی ژنان و ئابووری لەساڵی ١٨٩٩ بڵاوکردەوە، کەتیایدا جەختی لەسەر پێویست بوونی سەربەخۆیی مادی ژن بۆ بەدەست هێنانی مافی یەکسان و ئازادی مرۆیی دەکردەوە. ئامانجی ئەم چالاکیانە، تەنها و تەنها بریتی نەبوو لەبەدەست هێنانی مافی دەنگدان و بەشداریکردن لەکاروباری سیاسی و ئازادی و ڕزگاربوونی ژن لەهەموو ئەو کۆت و بەندە کۆمەڵایەتیانەی کەبەسەریدا سەپێنرابوو، بەڵکو ئەم کار و چالاکیانە بەیارمەتی کۆڕانکاریە پیشەسازیەکان و پەرەسەندنی ژیانی شار نشینی، هەلومەرجێکی لەباری فەراهەم کرد، کەتیایدا ژنانی ئەمریکا توانیان لێهاتویی و ئیرادەی خۆیان لەئەرکە کۆمەڵایەتیەکاندا بسەلمێنن و یارمەتی دەرێکی باشبن بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەیەك بەرەخساندنی چانسی یەکسانی زیاتر و لەژینگەیەکی مرۆڤانە تردا .

ئەو کێشە و گیروگرفتانەی کەئەمریکای سەردەمی کۆڕانکاری پیشەسازی ڕووبەڕووی بویەوە، لەبەرهەمی نوسەرانی ئەم سەردەمەدا بەباشی ڕەنگی داوەتەوە. ئاوازی ڕەخنەگرانە و ڕاشکاوانەی نوسەران لەکێشانی وێنەی ڕاستەقینەی بارودۆخ و ژیانی ئەو سەردەمە، سەرنجی

کاربەدەستەکانی بۆلای ئەرك و بەڵێنەکانیان زیاتر ڕاکێشا. ((ئاپتۆن سینکلەر)) بەبڵاوکردنەوەی کتێبەکەی بەناوی ((دارستان))، ڕاستی شێوازی ژیانی کرێکاران، نەبوونی مەرجی تەندرووستی کارگەکانی لەقوتونانی گۆشت و کارگەکانی کەوڵ کردنی شیکاگۆی ئاشکرا کرد و سەرنجی تێکڕای خەڵکی بۆ ئەم مەسەلەیە ڕاکێشا. دەوڵەت بۆ ڕێکخستنی کاروباری تەندروستی دەست پێشخەری کرد و بۆئەم مەبەستەش بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، خزمەتگوزاری پێویستی پێشکەش بە خاوەن سەرمایەکان و چینی بەکاربەر کرد. داستانەکانی ((جەك لەندەن)) و ((تیۆدۆر درایزر)) لەو جۆرە بەرهەمانە بوون کە تیایاندا بەزمانێکی سادە و ڕاشکاوانە هەموو گەندەڵیەکانی دام و دەزگا گەورە پیشەسازیەکان و ئەو کارەساتەی کەبەسەر کرێکاندا دێت شی دەگرتەوە. ((لینکلن ئستێفان)) بەبڵاوکردنەوەی کتێبی ((ڕوسیاهی شارەکان))، فەسادی کۆمەڵایەتی و سیاسی کارمەند و کاربەدەستانی شارەکانی ئاشکرا کرد. چاکسازیە پێشکەوتخوازیەکانی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، لەسەردەمی سەرۆك کۆماریەتی ((تئۆرد ڕۆزفلت)) و ((ڤدرۆ ویلسۆن))دا، بەکاردانەوەیەك لەبەرامبەر ڕەخنە کۆمەڵایەتیەکان، هەڕەشەی کرێکاران و گیروگرفتی نێو شارەکان دەژمێررێت. ئەم چاکسازیانە کاری لەهەموو لایەنەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەمریکا کرد. بەگەشەسەندنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی، ڕێکخستنی کاروباری کۆمەڵایەتی، هەڵبژاردنی کەسی شیاو بۆ پۆستە ئیداریە مەحەلیەکان و گرنگی دان بە گیروگرفتی کرێکاران، قەیرانەکۆمەڵایەتیەکان چارەسەر کران و بنەماکانی لیبرالیزمی ئەمریکاش خۆیان لەو وڵاتەدا زیاتر بەهێز کرد.

سەرەتای سەدەی بیستەم کۆتای هاتنی گۆشەگیری (جودا خوازی) سیاسی ئەمریکایە. ویلایەتە ئەمریکیەکان پاش بەرپاکردنی شەڕێك لەساڵی ١٨٩٨ لەگەڵ هێزەکانی ئیسپانیا، خۆویستانە یان خۆنەویستانە، سیاسەتی دەست تێوەرنەدان و بێلایەن لەکاروباری وڵاتانی دیکەی واز لێهێنا. بەهەڵکەندنی کانالی پەناما، خۆی وەك پارێزگاری وڵاتانی ئەمریکای لاتینی ناساند و بەدەست تێوەردانی لەنێو کاروباری ڕۆژئاوای دوور و بەشداری کردنی لەجەنگی جیهانی یەکەم، وەك هێزێکی گەورە لەسیاسەتی جیهانیدا سەری هەڵدا.

حەزکردن بەدەست بەسەراگرتنی زەویەنوێکان و بەردەوامبوونی سیاسەتی فراوانخوازی و بیرۆکەی ((چارەنوسی یەکلاکەرەوە)) بەشێك لەتایبەتمەندیەکانی دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەردەمی سەرۆك کۆمارێتی ((مەك کنیلی)) دەژمێررێت. هەرچەندە سیاسەتی فراوانخوازی مەسەلەیەکی نوێ نەبوو ـ هەر لەسەرەتای دامەزراندنی کۆماریەوە سیاسەتی

فراوانکردنی سنوورەکان و داگیرکردنی زەویە پان و بەرینەکانی کیشوەری ئەمریکای باکوور، بەشێکی سەرەکی مێژووی سیاسی ئەمریکای پێك دەهێنا. ڕۆشتن بەرەو ڕۆژئاواو دەست بەسەرادا گرتنی زەویە نوێیەکان هەمیشە شەڕو پێکدادانی نێوان هێزەکان و ئەیتقەکانی لیٚ دەکەوتەوە. شەڕە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ ئەیتقەکان و هۆزە سوور پێستەکان و پاشەکشێ پێکردنیان لەسەر زەویە بەپیتەکان، جەنگ لەگەڵ مەکسیك و لکاندنی تەکزاس و کالیفۆرنیا و فراوانکردنی سنوورەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان تاکەنارەکانی ئۆقیانوسی ئارام، لەسەدەی نۆزدەیەمدا نیشانەیەکی ئشکرای سیاسەتی فراوانخوازیە. ئەم سیاسەتە باوەڕ بە ((چارەنوسی یەکلاکەرەوەی)) لەگەڵ خۆیدا هێنا، کەجەختی لەسەر ویستی پەروەردگار بۆ پەرەسەندنی شارستانیەتی ئەمریکایی لەو زەویانە و ئاوەدانکردنەوەی ئەو ناوچانە دەکردەوە، بەڵام ئەم بزاوتە فراوانخوازیە بەرەو زەویەکانی ڕۆژئاوا سنووری سرووشتی زەویەکانی نەدەبەزاند و لایەنی سیاسەتی ئیستیعمارگەرانەی پێوە دیار نەبوو .

یەکەمین کاریگەری فراوانخوازی لەدەرەوەی سنوورە سرووشتیەکان، لەسیاسەتی ((ویلیام سی دارد)) وەزیری دەرەوەی دەوڵەتی کۆماریخوازدا ڕەنگی دایەوە، لەساڵی ١٨٦٧ توانی ئالاسکا بەبڕی حەوت ملیۆن دۆلار لەدەوڵەتی تزاری ڕووسیا بکڕێت و دوورگەکانی میدوی لەئۆقیانوسی ئارامدا بکاتە پاشکۆی (چمیمە) ئەمریکا. لەگەڵ ئەوەشدا کۆنترۆلکردنی کەنارەکانی ئۆقیانوسی ئارام و لکاندنی ئالاسکا لەساڵەکانی پاش شەڕی ناوخۆ، بوو بەهۆی ئەوەی کەسیاسەتی فراوانخوازی لەدەرەوەی سنوورەکانی ئەمریکادا سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت. کڕینی ئالاسکا ڕووبەڕووی گاڵتە جاڕیەکی زۆر بوویەوە و خەرجکردنی ئەو هەموو پارەیە وەك کڕینی یەك پارچە سەهۆڵ لێك دەدرایەوە. پرۆژەکەی ((گرانت)) سەرۆك کۆماری ئەمریکا بۆ لکاندنی سانتۆدۆمینکۆ لەساڵی ١٨٧٠ لەلایەن ((سنا))وە ڕەتکرایەوە، بیروڕای گشتی و سیاسەتی کوللی بەرەو ئاراستەی پێچەوانەی فراوانخوازی دەردکی دەڕۆشت. بەڵام گۆڕانکاری پیشەسازی ئەمریکا باروودۆخەکەی گۆڕی. لەساڵەکانی ١٨٨٠ بیری دەست بەسەردا گرتنی کوبا و فراوانکردنی پانتایی سنووری دەسەڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەدەریای کاریبی و مەکسیك دا، لەلایەن گروپە جۆراوجۆرەکانەوە، لەبازرکان و سەرمایەدار و بگرە تاڕۆژنامەنوس و مافپەروەران جەختی لەسەر دەکرایەوە و هانیش دەدرا. بەگەشەسەندنی ئابووری ئەمریکا پێویستی بەدەستهێنانی بازارە نوێیەکانی جیهان زیاتر هەستی پێدەکرا، لەڕاستیشدا هۆکاری سەرەکی گۆڕانی سیاسەتی گۆشەگیری، گۆڕانکاریەکانی ناوخۆی وڵات بوو. پەرەسەندنی

ئابووری پیشەسازی لەگەڵ جێگیر بوونی سەر زەمینێکی پان و بەرین لەئۆقیانوسی ئەتڵەسیەوە تا ئارام، کۆتایی هاتنی سەردەمی فراوانکردنی سنوورەکانی ناوخۆ بوو. گۆڕانکاریە پیشەسازیەکان کۆمەڵێك گرفتی وەك پەرەسەندنی شارنشینی و نایەکسانی دابەشکردنی سەروەت و سامانی لێکەوتەوە و لەهەمان کاتیشدا ئەمریکای وەك یەکێك لەگرنگترین بەرهەمهێنەرەکانی بەرووبوومی پیشەسازی بەجیهان ناساند. پشت بەستنی لەڕادەد بەدەر بەبازرگانی دەرەوە و ناردەنی لەگەڵ هەموو ئەو گیروگرفتانەی کەلەئەنجامی گۆڕانکاری پیشەسازیدا سەریان هەڵدا، پەنابردنە بەر سیاسەتی فراوانخوازی و کۆتایی هاتنی سیاسەتی گۆشەگیری ئەمریکای حەتمی کرد.

بیروڕای گشتی دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدیەمیش پشتگیری و هانی ئەم سیاسەتەی دەدا. سناتۆر ((هێنری کابوت لاج)) چەمکی فراوانخوازی سەردەمی خۆی بەم شێوە پێناسە کرد: ((حەق وایە کە لە ریوگراندەوە تا ئۆقیانوسی بەستەڵەکی باکوور تەنها یەك ئاڵا بشەکێتەوە. کاناڵێك لەنێوان هەردوو ئۆقیانوسی ئەتڵەسی و ئارامدا دروست بکرێت. بۆ پاراستنی ئەم کەناڵە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئامادەی لەئەستۆ گرتنی ئەو ئەرکەبێت و بوونی خۆی لەئۆقیانوسی ئارام و دەسەڵاتی بەسەر دوورگەکانی هاواییدا بسەلمێنێت.)) یەکێکی تر لەسیاسەتمەدارانی کۆماریخواز بەناوی ((چانسی دیپۆ)) بۆچوونەکەی بەم شێوەیە ڕاڤە کرد : ((ئەمریکا زیاتر لەدوو بلیۆن دۆلار بەرووبوومی بەرهەمهێنراو زۆرتر لەداوخواست و بەکاربەر دابین دەکات. بەپشتیوانی خوا و ڕابەرایەتی مەك کنیلی و هاوکارە کۆماریخوازەکانی، بازاڕە سەرەکیەکان لەکوبا، پۆرتۆ ریکۆ، هاوایی و فیلیپین بەدەست دەهێنن ـ بەرهەمی زیاتر بەواتای مەسروفی باشتر، دامەزراندنی کرێکار و دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی مادی لەژێر سایەی پەرەسەندنی بازرگانی دەرەکیدا ـ سیاسەتی سەرەکی حیزبی کۆماریخواز بووە.)) ئەم بیرکردنەوانە لەسەردەمی ((مەك کنیلی)) لەڕێگەی ڕۆژنامەکانی لایەنگیری ناسیۆنالیزمی ئەمریکیەوە بلاودەکرانەوە وخوێنەرێکی بەرچاویان هەبوو. کۆمەڵێك پشتیوانی بیرۆکەی ((چارەنوسی یەکلاکەرەوە)) بوون و باسی فراوانکردنی سنورەکانی ویلایەتە یەگرتوەکانیان دەکرد. ژمارەیەکی تر دەربارەی ستەمکاریەکانی ئیسپانیەکان لەکوبا و ئەرکی ئەمریکیەکان لەپەرەپێدانی دیموکراسی و ئازادی گفتوگۆیان دەکرد. ئەو بیروباوەڕە ئیستیعمار خوازانەی کە لەلایەن ((رویارد کپلینگ)) شاعیری ئیستیعمارگەری ئینگلیزەوە سەبارەت بەو ئەرکە قورسەی سپی پێستەکان لەبەشارستانی کردنی نەتیڤەکاندا بلاوکرابوویەوە ـ هزری سیاسەتی

فراوانخوازی ئەمریکای بەهێزتر کرد. هەرلەم سەردەمەدا کتێبێکی بەناوبانگی ((ئالفرێد ماهان)) دەربارەی کاریگەری دەسەڵاتی دەریایی لەمێژوودا، لەچاپ درا، کەباسی لەئەرکی هێزێکی دەریایی بەهێز و ئامادە و کاریگەرییەکەی لەسەر دیاریکردنی چارەنوسی میللەتاندا دەکرد. ئەو باوەڕی وابوو، کەئەگەر بمانەوێ ببینە خاوەنی دەسەڵاتێکی ئابووری بەهێز، ئەوا بوونی هێزێکی دەریایی ئامادە زۆر پێویستە و تەنها وولاتێك دەتوانێت پارێزگاری کاروباری بازرگانی خۆی بکات، کەهێزێکی دەریایی ئامادەباشی هەبێت. ((ماهان)) دەسەڵاتی ئابووری و سیاسی ئایندەی هەر وولاتێکی لەبوونی هێزی دەریایدا دەبینی و پەرەسەندنی بازاڕە ئابوورییەکانی دەرەوەشی هەر بۆ ئەم مەرجە گەڕاندەوە. دەست بەسەرداگرتنی دوورگەکانی هاوایی بۆ پاراستنی دەریای ئۆقیانوسی ئارام بەپێویستیە زەرووریەکان دەژمێررا. زەمینەی لکاندنی هاوایی بە ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە هەر لەم سەردەمەدا ئامادە کرا و لەساڵی ١٨٩٨، لەسەردەمی سەرۆك کۆماری مەك کنیلی دا بەفەرمی لەلایەن کۆنگرەوە بڕیاری لەسەر درا و لە ١٩٥٩وەك پەنجایەمین ویلایەتی بە ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە لکێنرا.

شەڕی ئەمریکا و ئیسپانیا لەسەر مەسەلەی کووبا بوو. ئەم دوورگەیە لەژێر دەسەڵاتی ئیسپانیادا بوو، پاش ئەوەی سەرمایە گوزاری ئەمریکا لەناوچەکانی بەرهەمهێنانی شەکری کوبا پەرەی سەند، قەیرانی ئابووری ئەمریکا لەساڵی ١٨٩٣ و دانانی باجی گومرگی قورس و گران، وەرشکست بوونی ژمارەیەك سورمایەداری کوبایی لێکەوتەوە و دواتر بووبە هۆی دابەزینی کرێی ڕۆژانەی کرێکارانی ئەو دوورگەیە. لەساڵی ١٨٩٥ شۆڕشێك لەو دورگەیە سەری هەڵداو دەوڵەتی ئیسپانیا بەناردنی هێزێك بەفەرماندەیی جەنەراڵ ((ویلەر)) ڕاستەوخۆ شۆڕشەکەی کپ کردەوە و بەدروستکردنی چەند ئۆردوگایەکی زۆرەملێ کارکردن زیاتر لە دووسەد هەزار کەس لەدانیشتوانی ئەو دوورگەیە زیندانی کرد . هەواڵی ڕەفتاری توندو تیژی ئیسپانیەکان لە ڕۆژنامەکانی ئەمریکادا بڵاوبوویەوە و لەبەرامبەریشدا ئەمریکا داوای سەربەخۆیی کوبایی کرد. دەوڵەتی ئیسپانیا بەبانگهێشت کردنەوەی جەنەراڵ ((ویلەر)) و پێچانەوەی ئۆردووگاکانی تاڕاددەیەك ڕەزامەندی لەسەر داواکەی ئەمریکا دەربڕی. بەڵام ڕۆژنامەکان و دام و دەزگاکانی پڕوپاگەندە کردن داوای ڕاگەیاندنی شەڕیان دەکرد. بەرێکەوت نامەیەك لەسەفیری ئیسپانیاوە لەواشنگتۆن کەوتە دەستی یەکێك لەڕۆژنامەکانی نیۆیۆرك، لەنامەکە ((مەك کنیلی)) بەسیاسەتمەدارێکی بێ نرخ و لاواز پێناسەکرابوو. بڵاوبوونەوەی ئەم نامەیە مقۆمقۆیەکی زۆری نایەوە و سەفیری ئیسپانیایان ناچار بەدەست لەکار کێشانەوە کرد.

تەقینەوەی کەشتیەکی جەنگی ئەمریکا بەناوی ((مین)) لەکەنارەکانی کوبا ڕووداوێکی دیکە بوو کە ئاگری شەڕی نێوانیانی زیاتر خۆش کرد. بیروباوەڕی گشتی، تاوانی ئەو کردەوەیەی دەخستە پاڵی هێزەکانی ئیسپانیا. لەکۆتاییدا فشاری بیروڕای گشتی، نوسینی نێو ڕۆژنامەکان و ووتاری سیناتۆرەکانی لایەنگری شەڕ، ((مەك کنیلی)) یان ناچار کرد کە لەڕۆژی نۆزدەی ئاپریلی ساڵی ١٨٩٨ لەکۆنگرەدا حاڵەتی شەڕ لەنێوان ویلایەتە یەگگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسپانیادا ڕاگەیاند. هێزە دەریایەکانی ئەمریکا زەرەروزیانێکی گەورەیان بەهێزەکانی ئیسپانیا گەیاند. بەشێك لەهێزە دەریایەکانی ئەمریکا بەڕابەرایەتی ((تێئۆدۆر ڕۆزفلت)) هێرشیان کردە سەر دوورگەکانی فیلیپین و کەشتیە جەنگیەکانی ئیسپانیایان تێك شکاند. بەشێکی دیکەشیان هەڵیان کوتایە سەر دوورگەی پۆرتۆریکۆ و، زۆر بەئاسانی دەستیان بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرت. ئەم ڕووداوانەش وای کرد کە دەوڵەتی ئیسپانیا لەڕۆژی یەکی ئاگۆستی هەمان ساڵدا پەنا بباتە بەر گفتوگۆکردنی ئاشتیانە. لەدوای ڕێککەوتنێك دەست لەهەردوو دوورگەی کوبا و پۆرتۆریکۆ هەڵبگرێت و وازیان لێبهێنێت. لەئەمریکاش بیری دەست بەسەردا گرتنی فیلیپین بەپشت بەستن بەبیروڕاکانی ((ڕوبارد کپلینگ)) دەربارەی ئەرکی سپی پێستەکان لەبە شارستانی کردنی نەیتەکاندا کەشەی کرد.

((مەك کنیلی)) لەکاتی گفتوگرکردنی لەگەڵ ژمارەیەك قەشەی پرۆستانتدا دەربارەی دەست بەسەردا گرتنی فیلیپین بانگەشەی ئەوەی کرد، کە ئیدایەکی غەیبی لەخەودا پەیامێکی بۆ هێناوە، کە ئەرکی سەرشانی ئەمریکایە بەپەرەپێدانی دیموکراسی و ئازادی، ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری فیلیپین بگرێتە دەست و هەموو ئەو خەڵکانەی بۆ مسیحی و مرۆڤێکی شارستانی بگۆڕێت. وەك بڵێی ئاوبراو ڕابەرێك بوو کەبەهاتنی ئیدایەکی غەیبی یان بەهۆی خەونێکەوە خۆی کردوەتە لێپرسراو ڕزگارکەری میللەتێك و ئەو پەیامە غەیبیانەی کردۆتە وەسیلە و بەهانەیەك بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتە تایبەتیەکانی. لەکاتی گفتوگۆکانی ئاشتی دیسەمبەری ١٨٩٨، پێشنیازی کڕینی دوورگەکانی فیلیپین بەبڕی بیست ملیۆن دۆلار خرایە بەردەم دەوڵەتی ئیسپانیا. بەڵام دواتر بەپێی ڕێککەوتنی پاریس، ئەم دوورگانە خرانە ژێر ڕۆکێفی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە. دوورگەکانی کووام و پۆرتۆریکۆش درانە دەست ئەمریکا و خۆ بەڕێوەبەردنی کوباش بەرەسمی دانی پێدا نرا. دەوڵەتی کوبا بەڵێنیدا دووبنکەی دەریایی خۆی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی ئەمریکا و لەکاتی ڕوودانی هەرجۆرە پەلامارێکی دەرەکی بتوانێت پشت بە یارمەتی سەربازی ئەمریکا ببەستێت. لەساڵی ١٩١٦ دانیشتوانی پۆرتۆریکۆ، خۆیان

وەك هاوڵاتیەكی ئەمریكی لەقەڵەم داو حكومڕانی ئەو دوورگەیە لەلایەن ئەمریكاوە بۆ بەڕێوە بردنی كاروبارەكانی دەستنیشانكرا.

ئامانجی فراوانخوازی و گەڕان بەدوای بازاڕی ئابووری تازە، دیسان ئەمریكای بۆ دەستتێوەردان لەكاروباری وڵاتێكی دیكە هاندا، كەئەویش ((چین)) بوو. لاوازی ئیمپراتۆریەتی چین لەكۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەیەم، ئەو وڵاتەی وەك بازاڕێكی پێشبڕكێی ئابووری وڵاتانی ئەورووپی لێكردبوو. دەوڵەتە ئەورووپیەكان ئەو وڵاتەیان وەك ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان دابەشكردبوو. جگە لەوەش حكومەتی بەریتانیا لەپێدانی هەرجۆرە باجێكی گومرگی لەساڵی ۱۸۹۹ خۆی دەدزیەوە، لەبەرامبەردا ویلایەتە یەكگرتووەكان ڕێگەیەكی نوێی بۆ ڕێگەگرتن لەفراوانبوونی دەسەڵاتی ئینگلیز لەناوچەكەدا دۆزیەوە و پێشنیازێكی پێشكەش بە گەورە زلهێزەكانی جیهان كرد، كە بەرەسمی دان بەمافەكانی وڵاتانی بەرژەوەندی هاوبەش لەناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان لەچین دابنێن و باجی تایبەتی بۆ دەوڵەتی چین بگێڕنەوە. هیچ وڵاتێك یاسایەكی تایبەت دانەنێت كەلەگەڵ بەرژەوەندی وڵاتانی بەرژەوەندی هاوبەشدا نەگونجێت. ئەم سیاسەتە بەناوی ((سیاسەتی كراوە)) ناوبانگی دەركرد، كەداوای مافی یەكسانی دەكرد بۆ هەموو میللەتانی خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش لەخاكی چین دا. بۆ پاراستنی بازرگانی لەگەڵ چین و ڕێگەگرتن لەكێبڕكێی ئیستیعماری - بەتایبەت پاش جەنگی ژاپۆن و چین لەساڵی ۱۸۹۸ و سەركەوتنی ژاپۆن - ئەمریكا پێشنیازێكی دیكەی بۆ پارێزگاریكردن و لەبەر چاوگرتنی حوكمڕانی دەوڵەتی چین و یەكسانی مافەكانی وڵاتانی بەرژەوەندی هاوبەش، خستە ڕوو. ئامانجی سیاسەتی ئەمریكا لەڕۆژئاوای دوور پشتیوانیكردنی سیاسەتی كراوە بوو. ((تیۆدۆر ڕۆزفڵت)) و سەرۆك كۆمارەكانی دوای ئەویش ((تافت و ویلسۆن)) هەمان سیاسەتیان پەیڕەو دەكرد. لەڕاستیدا گەڕان بەدوای بازاڕی ئابووری نوێ و بەرقەراركردنی بازرگانی لەگەڵ چین، هۆكاری سەرەكی دەستتێوەردانی ئەمریكا بوو لەنێو كاروباری ناوخۆی ڕۆژئاوای دووردا.

مێژوونوسە هاوچەرخەكانی ئەمریكا شێوەی سیاسەتی فراوانخوازی و هەڵگیرسانی شەڕی ئیسپانیان - كە كۆتایی هاتنی گۆشەگیری سیاسی ئەمریكای بەدوادا هات - بۆ هۆكارە ئابووریەكانی و كاریگەری ڕاستەوخۆی مەسەلەكانی ناوخۆی ئەمریكا، لەدەیەی كۆتایی سەدەی نۆزدەیەمادا، دەگێڕنەوە.

((ویلیام ئیلمەن ویلیامز)) لەكتێبی ((تراژیدیای دیبلۆماسی ئەمریكا)) و ((ڤالتیر لافیبر)) لەكتێبی ((ئیمپراتۆریەتی نوێ: لێكدانەوەیەك لەفراوانخوازی ئەمریكا)) گیروگرفتەكانی

ناوخۆی ئەمریکا (گرفتەکانی گۆڕانکاری پیشەسازی) بەهۆکاری سەرەکی سیاسەتی دەستێوەردان لەکاروباری وولاتانی دیکە دەزانن. لێکدانەوەی مێژوونوسە هاوچەرخەکان زیاتر جەخت لەسەر هۆکاری ئابووری دەکاتەوە. بەپێی ئەم بۆچوونانە پەیڕەوکردنی سیاسەتی فراوانخوازی بۆ سێ هۆکار دەگەڕێتەوە.

١ـ قەیرانی ئابووری ١٨٩٣ کە بووە هۆی زیادبوونی بێکاری، کەم بوونەوەی کرێی کرێکاران، لاوازی برەوی بازاڕ، چەندەها گیروگرفتی کۆمەڵایەتی تر.

٢ـ ئەو دەرفەتە نوێیانەی کە بەهۆی پەرەسەندنی بازرگانی لەگەڵ کیشوەری ئاسیادا فەراهەم کران، بەڕێگا چارەیەکی گونجاو بۆ هەموو گیروگرفتەکانی ناوخۆ لێك درانەوە.

٣ـ نزیك بوونەوەی بەرژەوەندی سەرمایەدارەکان لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتدا و پەرەسەندنی هاوکاری نێوان دەوڵەتی کۆماریخوازی ((مەك کنیلی)) و سەرمایەدارەکان کاریگەریەکی زۆریان لەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا دروست کرد. لەمانگی نیسانی ١٨٩٨ ئەم سێ هۆکارە پێکەوە هەڵگیرسانی شەڕیان لێکەوتەوە و بەرنامەی کۆتایی هاتنی سیاسەتی گۆشەگیری دەرەوەیان ڕەنگ ڕێژی کرد.

وەك ئاماژەمان پێکرد، قەیرانی ئابووری ساڵی ١٨٩٣ بۆ گۆڕانکاری خێرای پیشەسازی ئەو وولاتە دەگەڕێتەوە. گرنگترین ماوەی گۆڕانکاری خێرای پیشەسازی ئەمریکا دەکەوێتە نێوان ساڵەکانی ١٨٧٣ ـ ١٨٩٨ەوە ، ئەم ماوەیە هەرچەندە بووژانەوەی ئابووری سەرجەم بازاڕەکانی ئەمریکای لەگەڵ خۆی هێنا، بەڵام کزی بازاڕی کارو قەیرانێکی مادی سەرسوڕهێنەریشی لێکەوتەوە. لەقەیرانەکەی ساڵی ١٨٩٣دا زیاتر لەیەك لەسەر شەشی هێزی کاری وولات لەسەر کارەکەیان دەرکران، کرێی ڕۆژانەی کرێکاران دابەزی، زۆربەی کارگەکان چالاکیەکانیان ڕاوەستاند، بێکارەکان بەبێ بژێوی و شوێنێك بۆ حەوانەوە لەشارەکاندا پەرتەوازە بوون، مانگرتنە جۆراوجۆرەکانی کرێکاران، وەك ((هۆم ستەد)) و ((پولمن)) بەهێزی چەك کپ کرانەوە. جووتیارەکانیش لەبارودۆخێکی زۆر دژواردا دەژیان و لێشاوی بێکارەکانی پێبەتی بەرەو واشنگتۆن کەوتە ڕێ و چەند خۆپیشاندانێکی جۆراوجۆریش بەرپا کران. سەرهەڵدانی گرفتە کۆمەڵایەتیەکان ئەگەری شۆڕش و ڕاپەڕینێکی گەورەی ناوخۆیی هێنایە ئاراوە. لەبەرامبەر ئەم گیروگرفتانەشدا تەنها دوو ڕێگا چارە لەبەردەستدا بوو : یان دەوڵەت و سەرمایەدارەکان بەیارمەتی و هاوکاری یەکتر هەوڵی دابەشکردنی دادپەروەرانەی سەروەت و سامانیان دەدا و بەکەمکردنەوەی جیاوازی چینایەتی و گرنگی دان بەیەکسانی ئابووری هەوڵی

بنەبڕکردنی گرفتەکانیان دەدا، یان بەدۆزینەوەی بازارە جیهانیەکان بۆ فرۆشتنی بەرووبوومی زیادە بەرهەم و پەرەپێدانی دەسەڵاتی ئابووری ئەمریکای لاو لەجیهاندا، بەرەو چارەسەرکردنی گرفتە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی ناوخۆ هەنگاویا دەنا. بیرۆکەی یەکەم، چ لەڕووی مێژوویی و چ لەڕووی نەریتنی کۆمەڵگەی ئەمریکیەوە مقبول نەبوو. جەختکردنەوە لەسەر خاوەنداریەتی تایبەتی، لێهاتوویی تاکەکەس، ڕەخساندنی دەرفەتی یەکسان بۆ پێشکەوتن بەپێچەوانەی ئەو جۆرە بیرۆکانە دەژمێررا. وەزیری خەزێنەداری ئەو کاتە لەساڵی ۱۸۹٤، ڕێگا چارەیەکی گونجاوی لەڕاپۆرتی ساڵانەیدا خستە ڕوو: ((خۆشگوزەرانی میللی بەئەندازەیەکی زۆر بەفرۆشتنی بەرووبوومی زیادبەرهەم لەبازارەکانی دەرەوەدا بەستراوەتەوە.)) بازرگانی لەگەڵ ئاسیا و بەتایبەت لەگەڵ چین تارادەیەك کاریگەری لەسەر ڕەواندنەوەی ئەم گرفتە هەبوو. ((سیاسەتی کراوە)) بۆپاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا و وولاتانی دیکەی خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش لەڕۆژئاوای دوور و بەتایبەت چین کاریگەریەکی زۆری هەبوو. کۆمپانیا بازرگانیەکانی وولاتانی خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش لەبازرگانی چین دا، پێویستیەکی زۆریان بەپشتیوانی دەوڵەت لەبازارەکانی کێبڕکێی دەوڵەتە کۆلۆنیالیزم ئەورووپا لەئاسیادا هەبوو و ئەم کارەش خۆی لەخۆیدا نزیك بوونەوە و هاوکاری نێوان دەوڵەت و سەرمایەدارەکانی لێکەوتەوە. ووتەی یەکێك لەسەرمایەدارە کۆماریخوازە دەسەڵاتدارەکانی ئەم سەردەمە بەڵگەیە لەسەر بوونی هاوکاری دولایەنەی پێوانەییانە : ((دیبلۆماسی ، واتای ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی بازرگانی نێو دەوڵەتی دەگەیەنێت.))

ئەو گێروگرفتانەی کەلەم سەردەمەدا لەکوبا سەریان هەڵدا و گرتنەبەری شێوازی توندوتیژی حکومەتی ئیسپانیا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکان، هاوکاری دەوڵەت و کەرتی تایبەتی زیاتر کرد. لە ۱۸۹٥ شۆڕشی ناوخۆی کوبا لەدژی حکومەتی ئیسپانیا، سەرمایە گوزاری ئەمریکیەکانی ـ کەمزیاتر لەپەنجا ملیۆن دۆلاربوو ـ ڕووبەڕووی مەترسی دەکردەوە. ئەزموونی شەڕ لەگەڵ ئیسپانیا و سەرکەوتنی ئەمریکا لەدەست بەسەردا گرتنی دوورگەکانی دەریای کاریبی، فراوانبوونی دەسەڵاتی سیاسی لە فیلیپین، بەردەوامبوونی هاوکاری نێوان دەوڵەت و بازرگانەکان و خاوەن پیشەسازیەکانی واجب کرد. پەرەسەندن و خۆشگوزەرانی ئابووری پەیوەندی بەپەرەسەندنی بازارەکانی دەرەوە هەبوو، پاراستنی بازارەکانی دەرەوەش پێویستی بەسیاسەتێکی چالاکانەی دەوڵەتی فیدراڵ هەبوو. لەڕوانگەی سەردەمی ئێستاو لێکدانەوەی مێژوونوسە هاوچەرخەکانی ئەمریکاوە، جەنگی ئەمریکا و ئیسپانیا ڕووبەڕووبونەوەیەکی

کورت و بێ پایانی نەبوو، بەڵکو جەنگێك بوو کەلەپێناو پاراستنی سیستەمی ئابووری و سیاسی ئەمریکادا بەپێویست و زەرور دادەنرا.

لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹۰۰ ((مەك کنیلی)) بۆ جاری دووەم هەڵبژێررایەوە و ((تیۆدۆر رۆزفلت))ی کردە جێگری خۆی. بەڵام ئەم جارەی سەرۆکایەتیەکەی زۆری نەخایاند و دوای یەك ساڵ کوژرا و دوابەدوای ئەو رووداوە جێگرەکەی شوێنی گرتەوە. بەکوژرانی ((مەك کنیلی)) و هاتنە سەر کاری ((رۆزفلت)) سەردەمێکی نوێ لەمێژووی ئەمریکا دەستی پێکرد ـ سەردەمێك کە بەزۆر جاران بەسەردەمی پێشکەوتن و رووداوە پێشکەوتن خوازیەکان ناودەبرێت. لەم سەردەمەدا بەرنامەیەکی چەند لایەنە لەپێناو چاکسازیە کۆمەڵایەتیەکان، چاککردنی ژیانی کرێکاران و خۆش گوزەرانی کۆمەڵایەتیدا رەنگ رێژی کرا. لەرووی سیاسەتی دەرەوە ((رۆزفلت)) هەمان سیاسەتی سەردەمی ((مەك کنیلی)) پەیرەو دەکرد. ئەو هیوای زیادکردنی دەسەڵاتی ئابووری و سیاسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی لەجیهاندا دەخواست. ((تیۆدۆر رۆزفلت)) کە بەچاوێکی ووردترەوە چاودێرۆی فراوانبوونی دەسەڵاتی ژاپۆنی لەئاسیادا دەکرد، گەشتە ئەو ئەنجامەی کەپێویستی ژاپۆن بەکەرەسەی خاو، ئەو وولاتە ناچار دەکات کە بۆ بەدەست هێنانی بازارە ئابوریەکان سیاسەتی فۆاوانخوازی بگرێتە بەر. ((رۆزفلت)) باوەری وابوو کەئەو وولاتە بۆ هاوایی و فیلیپین پلانێکی داگیرکەرانەی دارشتووە. بەتایبەت پاش رێککەوتن نامەی ژاپۆن لەگەڵ ئینگلیز لەساڵی ۱۹۰۲ و ناکۆکی نێوان ژاپۆن و رووسیا لە چین، سووربوو لەسەر ئەوەی کەلەگەڵ وولاتی ژاپۆن لەسەر مەسەلەکانی تایبەت بەئاسیا پێك بێت و بگاتە ئەنجام. لەبەرئەوە بۆ ئاشتکردنەوەی نێوان رووسیا و ژاپۆن هەنگاوی نا، خەڵاتی ئاشتی نۆبلی بۆ ئەم سەرکەوتنە پێ بەخشرا. لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لەفیلیپین بەنهێنی رێککەوتنێکی لەگەڵ ژاپۆندا مۆر کرد، کە بەپێی ئەو رێککەوتنە بەشێوەیەکی رەسمی دانی بەدەسەڵاتی ئەو وولاتە بەسەر کۆریادا ناو و لەبەرامبەردا ژاپۆنیش چاوپۆشی لە هەرجۆرە پلانێکی فراوانخوازی کرد بەنیسبەت فیلیپینەوە. پاش یەسەرکەوتنی ژاپۆن بە سەر روسیادالە ساڵی ۱۹۰٤ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ۱۹۰۸ دانی بە دەسەڵاتی ئابوری ژاپۆن لە مەنچوری دانا و لەبەرامبەریشدا پشتیوانی ئەو وولاتەی بۆ ((سیاسەتی کراوە.)) لەبواری بازرگانی چیندا بەدەست هێنا. لەجەنگی جیهانی یەکەمیش پاش ئەوەی ژاپۆن سیاسەتی فراوانخوازی خۆی لە وولاتی چین پەرەپێدا، ئەمریکا جارێکی تر رێککەوتننامەیەکی لەساڵی ۱۹۱۷ لەگەڵ ژاپۆن مۆر کرد و ئەم جارەش بەشێوەیەکی رەسمی

دانی بەبەرژەوەندیە بە تایبەتیەکانی ژاپۆن لەچین دانا و ژاپۆنیش لەبەرامبەردا بەڵێنی دایەوە کە پشتگیری تەواوی ((سیاسەتی کراوە)) لەچین بکات.

سیاسەتی ((تیۆدۆر ڕۆزفلت)) لەکیشوەری ئەمریکا، بریتی بوو لەهەوڵدان بۆ جێگیرکردنی نفوزی دەستەلاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان. بۆ دەست بەسەردا گرتنی بازرگانی و سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان درووستکردنی کاناڵێك کە هەردوو ئۆقیانوسی ئارام و ئەتلەسی پێکەوە ببەستێتەوە بە پێویست دەزانرا .سیاسەتی ((ڕۆزفێلت)) بە کارهێنانی دەسەلات بوو بە شێوەیەکەی مام ناوەند. ئەویت :((پەندێکی بەناو بانگ هەیە، بەنەرمی قسەبکە ،بەلأم با گۆپاڵێکی قورسیشت پێبێت)) مەبەستی ئەوە بوو لە کاتی نیشاندانی شێوازی نەرم لە سیاسەتی دەرەوەیدا، هێزو دەسەلاتی جەنگی وویلایەتە یەکگرتووەکان پیشانی جیهان بدات. دروستکردنی کەناڵی پەنەما بۆ هێنانە دی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە کیشوەرەکانی ئەمریکای باشوور زۆر زەروور بوو. لە ساڵی ١٨٨٨ لە لایەن کۆمپانیایەکی فەرەنسی یەوە بە سەرپەرشتی ((فردیناند دولسپس)) هەوڵی هەلکەندنی کاناڵەکە لە پەنەما درا، بەلأم هەوڵەکان بەهۆی هۆکاری سیاسی و ئابوریەوە سەریان نەگرت.

((ڕۆزفلت)) بۆکرینی پشکی ئەو کۆمپانیا فەرەنسیە بری چل ملیۆن دۆلاری پێشنیار کردو ئامادەیشی لە سەر پێدانی دە ملیۆن دۆلارو زیاد کردنی ساڵانە دوو سەدوو پەنجا هەزار دۆلاری دیکەی بۆ کرێ گرتنی ناوچەی پەنەما کە ئەوکات لەژێر کۆنترۆلی کۆلۆمبیادا بوو دەربری. بەم شێوەیە ئەمریکیەکان لە ساڵی ١٩٠٣ توانیان ڕەزامەندی کۆمپانیا فەرەنسیەکان بەدەست بهێنن. بەلأم کۆلۆمبیا پێشنیارەکەی ئەمریکای ڕەتکردەوە.دواتر بە وەرگرتنی سەربەخۆی ئەو ناوچەیە گرفتەکەش چارەسەر کرا و بەپێی ڕێکەوتنامەیەك ئیمتیاز هەلکەندنی کەناڵەکە درا بە ئەمریکا و، نارەزای دەولتی کۆلۆمبیاش بە بری بیست و پێنج ملیۆن دۆلار بێ ئاکام بوو.

دەستێوەردانی ((ویلهلم))ئیمپراتۆری ئەڵمانی لە کاروباری ناوخۆی ڤەنزوێلا و کۆماری دۆمینیکەن ،((ڕۆزفلت))ی هاندا، کە بۆ پشتیوانی کردن لە سەر بەخۆی ناوچەکە ڕاگەیاندنێك وەك لێکدانەوەی ((بنەمای مۆنرۆ))دا دەربکات. بە پێی ئەم ڕاگەیاندنە، ((ڕۆزفلت))، ((بنەمای مۆنرۆ))ی پەرەپێداو ویلایەتەکانی یەکگرتووەکانی بەتەنها پارێزگاری ئەم کیشوەرە لە قەلەم دا. لێکدانەوەکەی ناوبراو بۆ ((بنەمای مۆنرۆ))ی بەم شێوەیەی لێهات: کەئەگەر لەحاڵەتێکدا وولأتانی دەرەوەی کیشوەری ئەمریکا بیانەوێت بەپێچەوانەی ((بنەمای مۆنرۆ)) لەکاروباری ناوەوەی ئەو کیشوەرە تەداخول بکەن و ببنەهۆکارێك بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان

کۆمەڵگاکانی ئەم کیشوەرە، ئەوا ویلایەتە یەکگرتووەکان ناچار دەبێت، وەك پشتیوانی کردنی ئەم وڵاتانە بۆ بەرقەرارکردنی یاساو ئاسایشی کیشوەرەکەی پەنا بۆبەکارهێنانی هێزی سەربازی ببات.

لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩١٢ حیزبی کۆماریخواز کە لەدوای شەڕی ناوخۆوە بەدرێژایی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم دەسەڵاتی سیاسی ئەمریکای گرتبو بەدەست و چەندەها سەرۆك کۆماری گەورەی وەك ((تێئۆدۆر ڕۆزفلت))ی هێنابوویە نێو مەیدانی سیاسەتی جیهانی، دووبەرەی پەرتەوازەیی و دووبەرەکی حیزبی بوویەوە. ((تێئۆدۆر ڕۆزفلت)) کەلەساڵی ١٩٠٨ خۆی لەمەیدانی سیاسەت دوورخستبویەوە و هاوڕێ و هاوڕێبازە حیزبیەکەی کەناوی ((تافت)) بوو، شوێنی گرتبوویەوە، لەساڵی ١٩١٢ دووبارە بڕیار دا بەشداری کێ بڕکێ کانی هەڵبژاردن بکاتەوە. حیزبی کۆماریخواز بەردەوام پشتیوانی لە ((تافت)) دەکرد و ((ڕۆزفلت))یش بەلایەنگرەکانی خۆی حیزبێکی نوێی بەناوی ((پێشکەوتنخواز)) دامەزراند، بەناوی کاندیدای حیزبەکەوە چالاکیەکانی خۆی دەست پێکرد. بەهۆی دووبەرەکی حیزبی کۆماریخوازەوە، زەمینەیەکی لەبار بۆ سەرکەوتنی حیزبی دیموکرات فەراهەم کرا. لەساڵی ١٩١٢ ((ڤدرۆ ویلسۆن)) سەر بەباڵی لیبراڵ دیموکرات هەموو ئەم ئەگەر و هەوڵانەی پوچەڵکردەوە و توانی بچێتە نێو کۆشکی سپیەوە.

((ویلسۆن)) نوێنەری میسالی و بیرکردنەوەی دیموکراتیکی ئەمریکای سەدەی بیستەمە. بەدرێژایی ماوەی سەرۆك کۆماریەتەکەی هەوڵی گونجاندنی بنەما شاکاریەکان و سیاسەتی دەدا. زیاتر لەخزمەتکاری مرۆڤایەتی و بانگەشەکاری ئاکار دەچێت تاسیاسەتمەدارێکی دڵ پڕۆکی دەسەڵات خواز. باوەڕی وابوو کەبۆ دەستەبەرکردن و پاراستنی مافی مرۆڤ پێویستە هەموو نەتەوەکان پێکەوە هاوکاری بکەن و دونیاش بۆ گەشەکردنی دیموکراسی ئارام و ئامادە بکەن. ڕۆژگار وای هێنایە پێشەوە کە ((ویلسۆن)) لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی پلەی سەرۆك کۆماری بەدەست بهێنێت و ئەرکی بەرقەرارکردنی ئاشتی لە جیهانە شڵەژاوە بگرێتە ئەستۆ. بەوپەڕی تێکۆشانەوە دەیویست پیشانی بدات کەسەردەمی سیاسەتی بێلایەنی و دەستتێوەرنەدان لەکاروباری جیهان بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکان کۆتایی پێ هاتووە کاتی ئەوەیە کەئەمریکا بەسەقامگیریەکی تەواو ئەرکە نوێیەکانی جیهان قەبوڵ بکات. بۆ بەرەو پێش بردنی بیروراکانی خۆی لە لایەن سنای ئەمریکاوە ڕەخنەی لێ گیرا و، بە هۆی پشتیوانی لێ نەکردنی بیروڕای گشتی بەوە نەیتوانی جەماوەرێکی زۆر لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە. کۆتایی

هاتنی ئەمەنی ((ویلسۆن)) زۆر دڵتەزێن بوو، لەساڵی ۱۹۱۹ سەکتە لێداو نیوەی لەشی لە کارکەوت و تاکۆتایی هاتنی سەردەمی سەرۆکایەتیەکەی ژیانێکی بێ پشتیوان و تەنیایی بردەسەر.

سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لەوسەردەمەدا لەسەر بنەمای دەستێوەرنەدان لەکاروباری ئەمریکا، دەڕۆشت. جەنگ لەگەڵ ئسپانیا، خاڵێکی گرنگ بوو، لەبەرقەرارکردنی پەیوەندی ئەمریکا لەگەڵ وولاتانی تردا، بەو ناونیشانەی کە سیاسەتی باوی ئەمریکا لەسەر بنەمای دەستێوەردانی کاروباری وولاتی ئەوروپا هەر بەردەوام بوو، پەرەسەندنی دەسەلاتی ئەمریکا لە رۆژهەلاتی ئاسیا و دەریای کاریبی و ئەمریکای لاتین، بەدواداچوونی چالاکانەی ((سیاسەتی کراوە)) لە چین، بەپارێزگاری کردن و دابین کردنی بەرژەوەندیە بازرگانیەکانی ئەمریکا لێك دەدرایەوە و هەرچەندە بە هەلگیرسانی جەنگی ئسپانیا، ئەمریکا پێی نایە قۆناغێکی نوێ لەڕووی سیاسەتی دەرەوەیدا، بەلام بیروڕای گشتی ئامادەیی وەرگرتنی ڕاستیەکانی جیهان و قبولکردنی ئەرکە نوێیەکانی تێدا نەبوو. ئەمریکا خوازیاری پاراستنی بێلایەنی و دەستێوەرنەدان و لەهەمان کاتدا دەستەبەرکردنی ئازادی نێو دەولەتی بوو.

بێلایەنی لەسەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانیەوە، ئەمریکای ڕووبەڕووی بارودۆخێکی ئالۆز کردەوە. کەشتیە بارهەلگرەکانی ئەمریکا کەورەترین باری خواردەمەنی و کەرەستەی جەنگیان بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان دەگواستەوە، ئەم هەنگاوەش کەشتیەکانی ئەمریکای ڕووبەڕوو چەندەها هێرش و دەست درێژی ژێر دەریایەکانی ئەلمانیا کردەوە. سیاسەتی سەربازی ئەلمانیا، بەکارهێنانی ژێر دەریایەکانی خۆی بۆ پەلاماردانی کەشتیە بازرگانیەکانی هاوپەیمانان، مەبەستی گەمارۆ خستنە سەر ئابووری ئینگلیز، بە پێویست و گرنگ دەزانی. بەپێی ((پەیمانی ساسکس))ی مانگی مەی ساڵی ۱۹۱٦ ئەلمانیا بەلێنیدا کەپەلاماری کەشتیە بازرگانی و ئەفەربەرەکان نەدات. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەرەستەیەك لەئارادا نەبوو، ئەلمانیا تەنها ڕێگای سەرکەوتنی بەسەر هاوپەیمانەکانی لەجەنگی ژێر دەریایدا بینی. پێش ئەم مێژوو لەمانگی مەی ۱۹۱٥ کەشتیەکی ئەفەر هەلگری ئینگلیزی بەناوی ((لوسیتانا)) ڕووبەڕووی هێرشێکی موشەکی جەنگی هێزی دەریایی ئەلمانیا بوویەوە، ژمارەیەکی زۆر لەسەرنشینەکانی کە سەدوبیست و چوارریان پەنابەری ئەمریکی بوون خنکان. ئەم ڕووداوە دەنگی بیروڕای گشتی جیهانی دژ بەئەلمانیا بەرز کردەوە و ((ویلسۆن))یش ئەم کارەی بەدەست درێژی کردنە سەر مافەکانی مرۆڤ وەسف کرد ـ بەلام هێشتا بیروڕای گشتی ئامادەی شەڕکردن لەگەڵ ئەلمانیا

نەبوو. بەئاڵوگۆڕکردنی چەند نوسراوێکی ڕەسمی، ئەڵمانیا بەڵێنیدا بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێش وەخت هێرش نەکاتە سەر کەشتیە بازرگانیەکانی ئەمریکا و لەکاتی ڕوودانی هەرکارەساتێك کەببێتە هۆی تێکشکانی کەشتیەکان، هەوڵی ڕزگارکردنی سەرنشینەکان بدات. ئەمریکاش دەستتێوەردانی خۆی تەنها بەدابینکردنی خواردەمەنی و تەقەمەنی بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان تایبەت کردبوو، هەرچەدنە ئەم هاوکاریە لەڕێگەی ئەو یارەمتی داراییەی کەبەشێوەی قەرز بەهێزەکانی هاوپەیمانانی دەدا زیادی کرد.

لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩١٦ ((ویلسۆن)) بەزۆرینەی دەنگ بۆ جارێکی تر پۆستی سەرۆك کۆماری بەدەست هێنایەوە. لەساڵی ١٩١٧ لە ووتارە بەنرخەکەیدا لەسنا، ڕای گەیاند : لایەنگیری ئاشتیە بەبێ سەرکەوتن. چونکە سەرکەوتن لەشەڕدا هەمیشە سەپاندنی بیروڕای سەرکەوتوو بووە. بەسەر ژێرکەوتوودا. ووتیشی ئاشتی تەنها لەگەڵ یەکسانیدا بەردەوام دەبێت و ئەوەش ئاشتیەکە کەئاسایشی ووڵاتە گچکەکان، ئازادی دەریاکان و سنووری چەك و تەقەمەنی دەستەبەر بکات و هێزێکی ئامادەش ئەرکی پاراستنی ئاشتی جیهان بگرێتە ئەستۆ. لەسەر بنەمای ئەم بۆچوونانە بوو کە ((ویلسۆن)) لەجێنیوەری ١٩١٨، چواردە بەندە بەناوبانگەکەی خۆی شیکردەوە. گرنگترینیەشی بنەما چواردە بەندەکەی ((ویلسۆن)) پێشنیازی قەدەغەکردنی ڕێککەوتننامەی نهێنی و دەستپێکردنی سیاسەتە ئاشکراکان، دابینکردنی ئازادی دەریاکان، یەکسانی مافی بازرگانی و دورستکردنی ئەنجوومەنی ڕێککەوتنی نێو دەوڵەتی بۆ پاراستنی ئاشتی جیهانیە.

پڕوپاگەندەکانی دژ بەئەڵمانیا لەلایەن ئینگلیزەوە بۆ ئامادەکردنی بیروڕای گشتی خەڵکی ئەمریکا پەرەیان سەند. ئەم بۆچونەیان بڵاوکردەوە کە ئەڵمانیان دەیەوێت دیکتاتۆریەتێکی سەربازی جیهانی دابمەزرێنێت. بەڵام دوای ئەم هەوڵانەش هێشتا بیروڕای گشتی لە ئەمریکا ئامادەی خۆ هەڵقورتاندنی لەجەنگی ئەورووپیەکاندا نەبوو، ئەوەی لەڕاستیدا بوو بەهۆی تێوەگلانی ئەمریکا لەشەڕەکەدا ، بڵاوبوونەەی نوسراوێکی نهێنی بوو کە لەلایەن ئینگلیزەوە خرایە بەردەستی ئەمریکاییەکان. لەم نوسراوەدا دەوڵەتی ئەڵمانیا داوای پشتیوانی و یارمەتی مەکسیکی کردبوو لەکاتی ڕوودانی هەر شەڕێك لەگەڵ ئەمریکادا و لەبەرامبەریشدا بەڵێنی دابوو ـ پاش سەرکەوتن ـ ویلایەتەکانی نیومەکسیکۆ و ئاریزۆنا و تەکزاس بۆ مەکسیکیەکان بگەڕێنێتەوە. بڵاوبوونەوەی ئەم نوسراوە ئەمریکیەکانی ئامادەی شەڕکردن کرد و لەمانگی ئەپریلی ١٩١٧ ((ویلسۆن)) ڕۆشتە نێو کۆنگریس و ووتارە مێژووییەکەی خۆی خوێندەوە:

((ئێمە لەگەڵ میللەتی ئەڵمانیدا شەڕ ناکەین، بەڵکو تەنها ڕووبەڕووی دیکتاتۆریەتی سەربازی دەوڵەتی ئەڵمانیا دەبینەوە. دەبێت دونیایەك درووستبکەین کە دیموکراسی تیایدا بپارێزرێت. ئێمە ئێستا لەپێناو ئەو بنەمایە تێدەکۆشین کە بەمانی مرۆیی ناو دەبرێت. بۆ پاسەوانی کردنی مافە ڕاستەکانی نەتەوە بچووکەکان و ئازادیان، بۆ بەرقەرارکردنی لێك تێگەیشتنی نێوان نەتەوە ئازادەکان، بەمەبەستی چەسپاندنی مافی دان پێدانراوی هەریەکەمیان شەرەدەکەین، ئاشتی و ئارامی هەموو وولاتان لە پێناو دابینکردنی ئازادی جیهاندا دەستەبەر دەکەین.))
لەساڵی ۱۹۱۷، ئەو کاتەی کە ـ چارەنوسی هاوپەیمانان هێشتا دیار نەبوو ـ فەرەنسا داگیر کرابوو، ئیتالیا شکستی خواردبوو هەروەها ڕووسیاش بەرەو دۆڕاندن دەچوو، ئینگلیز بەشێکی گەورەی کەشتیە بازرگانیەکانی تێك شکابوون، ویلایەتە یەکگرتوەکان هاتە مەیدانی شەڕ کردنەوە. گرنگترین پاڵپشتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەشداریکردنی هێزە دەریایەکانی بوو لەشەڕەکەدا. زیاتر لەدووملیۆن سەربازی ئەمریکی ڕەوانەی ئەورووپا کران و سی و پێنج ملیۆن دۆلاریش وەك یارمەتی درا بەهێزەکانی هاوپەیمانان، لەبەرەی فەرەنساوە هێزە دەریایەکانی ئەمریکا زەرەرو زیانێکی گەورەو گران بەکەشتی گەلی ئەڵمانیا گەیاند و هێزەکانی ئەو وولاتەیان ناچار بەپاشەکشێ کرد. لە ۳ی ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۹۱۸، ئەڵمانیا وەك گفتوگۆکانی ئاشتی، ڕزامەندی لەسەر بنەما چواردە بەندەکەی ویلسۆن دەبری. هەر لەم ساڵەی هەڵبژاردندا، کۆنگرێس ژمارەیەکی زۆر لەکۆماریخوازەکانی بۆ سنا ناردبوو، دژایەتی خۆی لەسەر نوسراوەکانی ((ویلسۆن)) دەربڕیبوو. کۆمیتەی پەیوەندیەکانی دەرەوەی سنای ئەمریکا، بەسەر کردایەتی ((هێنری کابوت لاج)) ڕەخنەی لەسیاسەتی ((ویلسۆن)) گرت ـ سیاسەتی کۆماریخوازەکان بریتی بوو لە پاراستنی بێلایەنی، گەرەنتی پێدانی ئازادی بازرگانی و کراوەیی دەستی ئەمریکا لەبازرگانی جیهاندا.
ئەمریکا وەك نەریتێکی هەمیشەیی و بەبێ هیچ جۆرە کۆسپێك لەڕووی کاروباری وولاتانی ئەورووپی، ئازادی بازرگانی نێو دەوڵەتی بۆ خۆی بەدەست هێنا بوو، حیزبی کۆماریخواز جوودایی خوازانیش، لەگەڵ بەردەوامبوونیان لەسەر سیاسەتی فراوانخوازی لەئاسیای ڕۆژهەلات و ئەمریکای لاتینی ـ کە ئەم سیاسەتەیان بۆ برەودان بە بازرگانی و بەرژەوەندی سەرمایەدارە گەورەکان بە پێویستی و گرنگ دەزانی ـ ڕووبەڕووی سیاسەتی ناوبراو بوونەوە و نارەزاییان لەسەر تێوەردانی ئەمریکا لەکاروباری ناوخۆی ئەورووپا کە بەپێچەوانەی نەریتی ڕابردوو بوو، دەربری. لەوەها بارودۆخێکی ئالۆزدا ((ویلسۆن)) بۆ بەشداریکردن لەگفت و گۆکانی ئاشتی

بەرەو شاری پاریس کەوتە ڕێ. پێشنیازی ئاشتی و ئارامی و درووستکردنی ئەنجوومەنی ڕێککەوتنی نێو دەوڵەتی، هەردووکیان لەسنادا ڕووبەڕووی شکست بوونەوە. کۆنگرێسیش لەوەها بڕیارێك بەهەموو شێوەیەك خۆی دوورخستەوە.

بیرۆکە میسالیەکانی ((ویلسۆن)) لەمەیدانی پڕ فێڵ و تەڵەکەبازی سیاسەتی ئەورووپادا بەبۆچوونی دوور لەڕاستی و واقیع لێك دەدرانەوە و ئەمریکاش سووربوو لەسەر ئەوەی کەبەهیچ شێوەیەك دەست لەنێو کاروباری ئەورووپا وەرنادات. ((ویلسۆن)) زیاتر لەهەموو شتێك جەختی لەسەر ئەرکی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەکاروباری سیاسی جیهان دەکردەوە. بیروڕای گشتی ئەمریکا هێشتا ئامادەی قبولکردنی ئەم ڕاستیانەی نەبوو، لەبەر ئەوە مەسەلەی بەشداریکردنی ئەمریکا لەکۆمەڵەی نەتەوەکان و جەختکردنەوە لەسەر ئاشتی و ئارامی لەکۆنگرێسی ئەمریکا شکستی هێنا.

دەستێوەردانی ئەمریکا بەسوودی هێزەکانی هاوپەیمانان و کۆتایی هێنان بەجەنگی یەکەمی جیهانی، خۆویستانە و خۆنەویستانە ئەم وڵاتەی لەکاروباری سیاسی جیهاندا تێوە گلاند و سیاسەتی بێلایەنی و جوودایی خوازی ئەو وڵاتەی کۆتایی پێهێنا. لەم کاتە بەدواوە ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك زلهێزێکی جیهانی خۆی بەدونیا ناساند و پشکی ئەم وڵاتەش لەکاروباری جیهاندا بەگرنگ و بنچینەیی ژمێررا.

ئۆتۆمبیلی فۆردی بەنرخێکی هەرزان پێشکەش بەئەمریکا کرد

ژنانی ئەمریکا پاش ململانێیەکی زۆر لە ساڵی ١٩٢٠ مافی سیاسیان بەدەست هێنا

## بەشی هەشتەم:

# فرانکلین ڕۆزفلت وپلانە چاکسازیەکان

سەرکەوتنی ئامێر و پیشەسازی لەگەڵ داهێنانە هونەریەکان، ئەمریکای وەك زلهێزێکی جیهانی بە دونیا ناساند. لەسەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا بەپێشکەوتنی ئامێرە نوێیەکان، بەروبوومی پیشەسازی و کشتوکاڵی زیادی کرد و ئەمریکا جگە لەدابینکردنی پێداویستیەکانی ناوخۆ، هەموو هەوڵەکانی خۆشی بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستیەکانی هێزەکانی هاوپەیمانان، لەبازاڕەکانی دەرەوەدا خستەکار. لەم ساڵانەدا بەپەرەسەندنی بازاڕەکانی ناوخۆ، سوود وەرگرتن لەئامێر و ئامرازە هونەریەکان، پەرەسەندنی سەرمایەگوزاری و سوود و قازانجی کڕین و فرۆشتنی پشك، ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی مادی کۆمەڵگەش زیادی کرد. لەنێو هەڵپەی ئەم ڕەونەقە ئابووریەو خۆشگوزەرانیە مادیەدا هیچ کەس باوەڕی نەدەکرد، کە قەیرانێکی سەخت و دژوار و درودرێژ لەنێو «سەنگەرێکدا» خۆی مەڵاس دابێت. سیاسەتی نێو دەوڵەتی ((ویلسۆن)) بەشداریکردنی ئەمریکا لەجەنگ، کەرەزامەندی زۆرێك لەسیاسەتمدارەکانی لەسەر بوو، بەخێرایی فەرامۆش کراو سیاسەتی جوداخوازی لەسەر بنەمای پاراستنی بێلایەنی، نەبوونی دەستتێوەردان لەکاروباری ئەورووپا و گەرەنتی کردنی ئازادی بازرگانی نێو دەوڵەتی دووبارە و چڕی پەیڕەو کرایەوە. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٠ ـ ١٩٣٢ حیزبی کۆماریخواز سێ سەرۆك کۆماری ڕەوانەی کۆشکی سپی کرد. ((وارن هاردینگ)) ، ((کالوین کولیج)) ، ((هربرت هوور)) هەرسێکیان نوێنەری بیرکردنەوەی سیاسەتی باوکی کۆماریخوازەکان بوون. لەهەڵبژاردنەکانی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی ((وارن هاردرینگ)) بەدرووشمی گەڕانەوە ((بۆ ڕەوشی ئاسایی)) کە دەستەواژەیەکی داهێنەری خۆی بوو، سەرکەوتنی بەدەست هێنا. مەبەست لە((ڕەوشی ئاسایی)) ئەوەبووکە ئەمریکا دوور لەچاکسازیە ناوخۆیەکان و ململانێ نێو دەوڵەتیەکان بۆ ڕۆژگارە خۆشەکەی جاران بگەڕێتەوە. پشتیوانیکردنی دونیای بازرگانی و بەهێزکردنی سەرمایەداری

گەورەکان، پەرەپێدانی کاروباری بازرگانی، زەمانەت و پاسەوانی کردنی ئازادی بازرگانی دەرەکی لەگەڵ پاراستنی بێلایەنی سیاسی، لەبەرنامە گرنگەکانی حکومەتی ئەو کاتە بوو. سیاسەتی ساڵەکانی ۱۹۲۰، هەروەکو ئەم سیاسەتەی کەلەسەردەمی برەوی بازرگانی پاش شەڕی ناوخۆدا پەیڕەو کرا، لەسەر ئەو بنەمایە ڕاوەستابوو کە ئەگەر دەوڵەت بتوانێت بەپێی بچووکترین دەستێوەردان لەڕێکخستنی کاروباری بازرگانیدا، ئەوپەڕی هەلومەرجێکی لەبار و گونجاو بۆ بازرگانی و پێشکەوتنی پیشەسازی بڕەخسێنێت، بەدڵنیاییەوە کۆمەڵگەیەکی پڕ لەناز و نیعمەت و ژیانێکی خۆشگوزەران بۆ هاوڵاتیان دەستبەر دەبێت. لەم سەردەمەدا پیشەسازی تایبەتی پشتیوانیەکی تەواوی لێکرا. ((ئەندرۆ ملون))سولتانی ئەلەمنیۆم کرا بەوەزیری خەزێنەو سیاسەتی کەوتە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی سەرمایەدارە گەورەکان و کۆمپانیا قۆرخ کاریەکان. ((ملون)) سیاسەتی ئەو کاتەی دەوڵەتی لەڕوانگەی دەسەڵاتی سەرمایەداری سیاسیەوە بەم شێوەیە لێك دایەوە : ((دەوڵەت واتە بازرگانی، کەئەرکەکەی تەنها لەپشتیوانیکردنی کاروباری بازرگانیدا)) کورت دەکرێتەوە. ((کالوین کولیج)) سەرۆك کۆماری ئەوکاتیش جەختی لەسەر ئەم ووتەیە کردەوە : ((ئیش و پیشەی سەرەکی ئەمریکا بازرگانیە.)) ڕەخساندنی بارودۆخێك کەگونجاوترین دەرەنجامی لەڕووی برە وو پەرەپێدانی دونیای بازرگانیەوە لێبکەوێتەوە، بەئەرکی سەرەکی دەوڵەتی ئەمریکا لەقەڵەم دەدرا. سەردەمی ڕووداوە پێشکەوتنخوازیەکان بە پەرچە کردارێك دەژمێررا لەبەرامبەر تەشەنەکردنی ناڕەزاییە کۆمەڵایەتیەکان و گرفتە ئابووریەکاندا، بەهۆی ئەو ڕەونەقە مادیەی کە لەساڵەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانیدا هاتە ئاراوە، بەتەواوی فەرامۆش کرا. ڕەونەقی ئابووری لەگەڵ داهێنانە هونەریەکان موژدەی هاتنی ((ساڵە خۆشەکانی)) دەیەی ۱۹۲۰ی بەئەمریکیەکان دەدا.

زنجیرە ڕێسایەکی کومرگی نوێ لەنێوان ساڵەکان ۱۹۲۲ ـ ۱۹۲۸ بۆ پشگیریکردنی سەرمایەدارانی ئەمریکا دەرکران، کەبەربەستێکی نوێتریان لەبەرامبەر شتومەکی هاوردەدا درووستکرد، بازاڕی مۆنۆپۆلکراوی ناوخۆییان خستە بەردەستی پیاوانی دونیای بازرگانی. داتانی باج لەسەر دەرامەتی کۆمپانیاکان کە بەلای قۆرخکارەکانەوە. دڵخۆشکەر نەبوو، هێدی هێدی کەمکرایەوە و لەئەنجامدا هەڵوەشایەوە. یاساکانی چاودێریکردنی کە کاروباری هێڵەکانی ئاسنی خستبوویە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتەوە، گۆڕانی بەسەردا هاتوو بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خرایە ئەستۆی کۆمپانیا تایبەتەکان. دامەزراوە بازرگانیەکان بە هۆی پشتیوانیکردنی بانکەکانەوە، کەمتمانە و قەرزێکی بێ سنووریان دەبەخشی، پەرەیان سەند. لەم سەردەمەدا زۆرێك لەماڵەکان لەسەر بنەمای متمانە هەڵدەسوڕان، ملیارەها پشك لەبواری بازرگانیدا بڵاودەبوونەوە و

کارگەکانیش تانەو پەڕی توانای خۆیان بەرهەمیان دەهێنا. بەڵگەی بەهادار و پشکەکان بەردەوام لەبەرەوپیش چوندا بوون و کۆکردنەوەی سەروەت و سامانیش تاڕادەیەك ئاسان بوو، هەرکەس شتێکی دەکڕی، زەرەری نەدەکرد و هەموو خەڵکیش دەستیان بەکڕین و فرۆشتن کردبوو. پیشەی سەرەکی ئەمریکا بە ووتەی ((کولیج)) بازرگانی بووە هیچ شتێك جگە لەپەیداکردنی سەروەت و سەرمایەگوزاری پڕ سوود و قازانج بایەخی نەبوو، ئەوانەی کە ئیشی کڕین و فرۆشتنی پشکیان دەکرد، پسپۆڕانی بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە، بەرهەمهێنەر و فرۆشیارانی کەلوپەلی بازرگانی، بازاڕێکی چاکیان پەیدا کردبوو. بەڵام لەپشت ڕووخساری پڕ بەرەکەتی بازاڕەکانەوە، چەندەها گیروگرفتی گەورە خۆیان حەشار دابوو، کە سەرمایەداریەکی سەروبەری لێکەوتبوویەوە، هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی قەیرانەکەی ١٩٢٩ بوو.

سەروەت و سامانی زۆری سەردەمی جەنگ، هاوکات لەگەڵ پشتیوانی لەڕادە بەدەری دەوڵەت لەدونیای گەورەی بازرگانی و بەکارهێنانی ئامێری پێشکەوتوو، ئابووریەکی بەرواڵەت پڕ ڕەونەقی هێنایە ئاراوە کە کڕین و فرۆشتن و دەڵاڵی پشکی بەتەنها ڕێگایەك بۆ بەدەستهێنانی پلەوپایە و سەروەت دادەنا.

لەم ساڵانەدا کۆمەڵگای ئەمریکا بەرەو کۆمەڵگەیەکی ڕاست ڕەو هەنگاوی دەنا. ئەوەی ئەمریکی و بۆ ئەمریکا دەگەڕایەوە بەلایەوە بەڕێز و پیرۆز بوو، دەمارگیریەکی توندی بۆ ڕێوڕەسمی ئەمریکایی پیشان دەدا. گیانی یەکڕیزی لەگەڵ گروپە تایبەت و ئازادەکان و بەسووك سەیرکردنی ئەو گرووپانەی کە غەیرە ئەمریکایی بوون بوو بەشتێکی باو. بەچاوی شك و گومانەوە سەیری کۆچبەرە تازە هاتووەکان و بیرکردنەوەی دەرەوەی دەکرا. نەبوونی شەکیبایی لەگەڵ بیر تەسکی و یان ترسان لەئەمریکای گۆڕاو بوو بەناسنامەی ڕوحی کۆمەڵایەتی ساڵەکانی ١٩٢٠. کۆچبەر و سۆسیالیستەکان بەتۆمەتی هەبوونی غەیرە ئەمریکایی خرانە ژێر پاڵە پەستۆیەکی زۆرەوە. هەر لەم ساڵانەدا ژمارەیەك لەهاوڵاتیان بەتۆمەتی بیرکردنەوەی ئازادگێری گیران یان لە ووڵات دوورخرانەوە. یاساکانی کۆچکردن گۆڕانیان بەسەردا هاتوو دیاردەی کۆچکردن سنوورێکی نوێی بۆ دانرا.

گروپی دژ بەڕەگەزپەرستی و دەمارگیری ((کوکلس کلان)) دووبارە سەری هەڵدایەوە. ئەم گروپە لەساڵی ١٩١٥ دووبارە دامەزرایەوە، بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر نەیتوانی لایەنگرێکی ئەو تۆ لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە. پاش شەڕەکەی ١٩١٩ ژمارەی ئەندامەکانی بەخێرایی زیادی کرد و گیانێکی نوێی کرا بەبەردا. کلانە نوێیەکان بەپێچەوانەی جاران، لەسەرتاسەری ووڵاتدا دەستیان بەچالاکی کرد و جگە لەڕەشەکان ئازار و ئەشکەنجەی هەموو ئەو کۆچبەرە تازە هاتوانەیان دەدا

کەلەهەموو کون و قوژبنێکی ئەم جیهانەوە دەهاتن، بەتایبەت کۆچبەرانی ئاسیایی و جولەکە و کاتۆلیك و سۆشیالیستەکان و، بۆ تەمێکردنی ئەو کەسانەی کە ـ بەبۆچوونی ئەوان ـ رێزیان لەبەها پیرۆزەکان ئەمریکایی نەدەگرت ئەو پەڕی توندوتیژیان بەکار دەهێنا. دەرکردنی یاسای قەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتنی مادە بێهۆشکەرەکان لەساڵی ١٩١٩، هۆکارێکی سەرەکی بڵاوبوونەوەی فەساد و تاوان و کوشتن و بڕین بوو. بەهەزارەها شوێنی نایاسایی بۆ مامەڵەکردنی نهێنی دروستکران و قازانجێکی زۆرروزەبەندەی بەنسیبی گروپە قاچاغچی و چەتەکان کرد. شارە گەورەکانی وەك شیکاگۆ بوون بەشوێنێکی لەبار و گونجاو بۆ نەشونماکردنی گروپە تاوانبارەکان و گروپەکانی مافیا.

ئۆتۆمبیل، ڕادیۆ و سینەما و داهێنانە نوێیەکانی پێشکەوتنی پیشەسازی لەم ساڵانەدا کەوتنە بازاڕەوە و پەیوەندیکردنی ناوچەکانیان ئاسانتر کرد. ئەو گۆڕانکارییەی کە هێڵەکانی ئاسن لە ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی ئەمریکا، لەپاش شەڕی ناوخۆ درووستی کرد، بەخستنە بازاڕی ئۆتۆمبیل، شێوەیەکی نوێی وەرگرت.

هەرچەندە ماوەیەکی زۆر بەسەر داهێنانی ئۆتۆمبیلدا تێدەپەڕی، بەڵام لەبەر گرانی نرخەکەی سوودێکی ئەوتۆی لێوەرنەدەگیرا. ((فۆرد) ، سەرمایەداری ئەمریکی بەبەکارهێنانی شێوازێکی نوێ، سوود وەرگرتن لە پسپۆڕییەتەکەی، ڕێکخستنی کاروباری کارگەکان، پێدانی کرێی ڕۆژانەی زیاتر بەکرێکارانی شارەزا، خێرایی بەرهەمی ئۆتۆمبیلی گەشە پێدا و ژمارەیەکی زۆر ئۆتۆمبێلی بەنرخێکی هەرزان خستە بازاڕی داوخواستەوە. ئۆتۆمبێل لەڕاستیدا شۆڕشێك بوو لەژیانی خەڵکی ئەمریکادا، لەلایەکەوە هۆکارێکی سەرەکی بەرقەرارکردنی پەیوەندی ناوچەکان و خێراکردنی کارکردن بوو، لەلایەکی تریشەوە خاڵێکی گرنگی وەرچەرخانی گرنگ بوو لەبواری پیشەسازیدا و، ملیۆنەها کەسی لەبێکاری ڕزگارکرد و بەمەبەستی هاتوچۆکردنی ئۆتۆمبێل چەندەها شارێگەی نوێ درووستکران و گۆڕانێکی گەورەی بەسەر ژیانی شار نشینیدا هێنا. سینەما لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم وەك ئامێرێکی سەرگەرمی و ڕابواردن خرایە بەردەستی هاوڵاتیان و بەسەرهەڵدانی سینەمای قسەکەر (ناطق) لەساڵی ١٩٢٧ بەخێرایی لەنێو کۆمەڵگەی ئەمریکیدا بڵاوبوویەوە و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاری لەژیانی تێکڕای خەڵکی کرد. هۆلی هوود، بوو بەکابەی هیوا و ئارەزووەکان، ملیۆنەها دۆلار لەم پیشەسازیە نوێیەدا سەرمایەگوزاری کراو دەرهێنانی فیلم ڕەونەقێکی تێجگار گەورەی پەیدا کرد و چەندەها دەرهێنەری نوێی ناساند. لەیەکەمین فڕینی برایانی ڕایتەوە تا ساڵی ١٩٢٤، فڕۆکە وانی کەبەجۆرێك لەوەرزش و سەرگەرمی دەژمێررا، بەپەرەسەندنی پیشەسازی درووستکردنی فڕۆکە

گۆڕانێکی نوێی بەسەرداهات و لەساڵی ١٩٢٧ ((چارلز لیند بێرگ)) بەفڕینێکی تاك نەفەر بەسەر ئۆقیانووسی ئەتڵەسیدا لەئەمریکاوە بۆ ئەورووپا، نامێرێکی نوێی پەیوەندیکردنی پێشکەش بە جیهانی پیشەسازی کرد. ڕادیۆش وەك هۆکارێکی تری سەرگەرمی وبواری فێرکردن، خایە بازاڕەوە و لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا ڕۆڵێکی گەورەی لەڕووی پڕوپاگەندە کردنەوە گێڕاو لەماوەی کەمتر لەدەساڵدا وەك پێویستیەکی سەرەکی سەری دەرکرد لەنێو هەموو ماڵێکی ئەمریکیدا.

داهێنانە هونەریەکان و پێشکەوتنە پیشەسازیەکان گیانی گەش بینی هەستی متمانە بەخۆ بوون و دڵنیایان لەکۆمەڵگەی ئەمریکیدا بەهێز کرد. دەسەڵات و سەروەت باڵی بەسەر دونیای نوێدا کێشا و زیادە ڕەویکردن لەئاڵوگۆڕی دارایی و مامەڵەی بێ پشتیوان و کڕین و فرۆشتنی بێ سود و قازانجی پشکەکانی لێکەوتەوە. لەساڵی ١٩٢٧ کاتێك کە (هربرت هوور)) وەزیری بازرگانی دەوڵەتی کۆماریخواز پۆستی سەرۆك کۆماری بێ سپێررا، کۆمەڵگەی ئەمریکی بەرواڵەت لەناز و نیعمەت و ڕەونەقێکی ئابووری بێ وێنەدا دەژیا. ((هوور)) کەخۆی بەئەندازیاری ئەم ((سەردەمە خۆش))ە دەزانی، لەووتەیەکیدا ڕایگەیاند : ئەمریکا زیاتر لەهەر کارێکی تر لەسەردەمی بەختەوەری و لەناو بردنی هەژاری نزیك بووەتەوە و ئەوەندەی نەماوە کە لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا سەرکەوتنی تەواو بەدەست بهێنێت. لەلوتکەی سەربەستی و متمانە و گەش بینیدا، هەیور لای قەیرانی ئابووری لەشێوەی ڕووخانێکی لەناکاوی بەهای پشکی کۆمپانیاکاندا دەرکەوت. دوابەدوای ئەم ڕووداوە ڕێژەی بەرهەمهێنان و پیشەی کرێکاران کەمی کرد و لەماوەی کەمتر لەدوو ساڵدا نرخی بەرهەمی نەتەوەیی گەیشتە ٥٠٪ و زیاتر لەدوانزە ملیۆن کرێکار پیشەکەی خۆیان لەدەستدا. دونیای بازرگانی دووچاری وەرشکستبوون هات و هەژاری و وێرانی سەرتاسەری ویلایەتە یەکگرتوەکانی گرتەوە. نرخی پشکی بۆرسە لە هەشتا و حەوت بلیۆن دۆلارەوە گەشتە نۆزدە بلیۆن، فرۆشتنی شت و مەکی بەرهەمهێنراو بۆ لە ٤٠٪ و بەرهەمی کشتوکاڵی بۆ ٦٠٪کەم بوویەوە، بانکەکانی وڵات یەك لەدوای یەك وەرشکست بوونی خۆیان ڕادەگەیاند. لێشاوی بێکاران لەسەرتاسەری وڵاتدا کەوتە ڕێ، برسێتی خەڵکی ناچار دەکرد کەلەنێو زبڵدانەکاندا بەدوای پارویەك خۆراکدا بگەڕێن و جووتیارەکانیش بەدەست ئەو باجەی کەلەسەریان دیاری کرابوو دەیان ناڵاند و زەویەکانیان لێ سەنرایەوە و ئاوارەی شارەکان بوون. هەژاری و ووشکە ساڵی و وەرشکست بوونی ئابووری، شوێنی متمانەی میللی گرتەوە. قەیران، واتای لەدەستدانی ئابڕوی سەرمایەدارەکان و دروستکردنی شك و گومانی بیروڕای

گشتی بۆ نەرزشی دونیای بازرگانی دەگەیاند، سەرمایەداریە سەرکەوتوەکەی دەیەی ۱۹۲۰ بەیەکجاری لاواز و شکستی خوارد.

دابەشکردنی نادادپەروەرانەی سەروەت، شێوازی مۆنۆپۆل و چڕبونەوەی دەسەلاتی داریی، هۆکاری سەرەکی سەرهەلدانی قەیران بوو. لە ٥٪ی ژمارەی دانیشتوان زیاتر لەیەك لەسەر سێی تێکڕای سەروەت و سامانی ولاتیان بۆ خۆیان قۆرخکردبوو، دامەزراوە سەرەکیەکانی بازرگانی بە فێل و تەلەکەبازی جۆراوجۆر، کڕین و فرۆشتنی نهێنی کۆمپیاڵە بازی وقۆرخکردن، زۆرترین دەرامەتیان لەژێر دەستی گروپێکی دەسەلاتداردا مۆنۆپۆل کرد. بانکەکانیش کە بەبێ پالپشتی پێویست، قەرز و متمانەیەکی لەرادەبەدەریان دەخستە بەردەم سەرمایەدارەکان، هۆکارێکی دیکەی سەرهەلدانی قەیران بوون. نەبوونی هاوسەنگی بازرگانی دەرەکی و دانی قەرزێکی زۆر بەو ولاتانەی کەزۆر لاواز بوون و توانای دانەوەی قەرزەکانیان نەبوو، بارودۆخەکەی زیاتر ئالۆز کرد. ئەو ولاتە ئەوروپیانەش ـ کە بونیادی داراییان بەهۆی شەڕەکانەوەلاواز بووبوو ـ توانای ڕاکێشانی بەرووبومی بەرهەمهێنراوی ئەمریکایان نەبوو. لەبەر ئەوە بازاڕەکانی دەرەوە بەڕووی بازاڕەکانی بازرگانی ئەمریکادا داخران و لە ئەنجامدا سەرمایەگوزاری ولات ڕووی لە بازاڕەکانی ناوخۆ و کڕین و فرۆشتنی پشك و بازاڕی بۆرسەی ناوەوە دەکرد. کۆمپیاڵە بازی نرخی پشکەکانی تاڕاددەیەك لەنرخە ڕاستەقینەکەی خۆی بەرزتر کردەوە و بوونە هۆی بەرزبوونەوەی نائاسایی تێکڕای نرخەکان لەبازاڕی بۆرسەدا. بەروبوومی زیاد لەداوخواست، لەبازڕەکاندا بەبێ کڕیار دەمایەوە. زۆرینەی خەلك کەچینی بەکاربەری کۆمەلگە بوون توانی کڕینی بەرهەمەکانیان نەدەبوو. لەساڵەکانی ۱۹۲۸ ـ ۱۹۲۹ کرێی کرێکاران لەبواری بەرهەمهێناندا نزیکەی ۱۲٪ زیادی کرد، لەکاتێکدا کەقازانجی کۆمپانیاو خاوەن کارگەکان گەیشتە لە ٦٢٪ . بەرزبوونەوەی ئاستی کڕین لەگەل زیاد بوونی مووچەی تێکڕای خەلکی و نزمبوونەوەی نرخی بەروبوومەکان ڕێگاچارەیەکی کاتی بوو، کەئەویش لەو ماوەیەدا گرنگیەکی زۆری پێنەدرا و پشت گوێ خرا. دەولەت کەتەنها ئامانجی، پەرەپێدانی دونیای بازرگانی بوو، لەبواری ڕێکخستنی دونیای ئابووریدا هیچ ڕۆلێکی نەدەگێڕاو بەباوەڕ بەئازادی بازرگانی، خوودی سەوداگەرانی لەکارەکانیاندا سەر پشك کردبوو. ئەو بۆچوونەی، کەقەیرانی ئابووری وەك ڕابردوو لەناکاو دەرەوێنێتەوە و پاش تێپەڕبوونی بەنێو هەلکشان و داکشانەکانی ڕێگادا کۆتایی پێدێت، بیرکردنەوەیەکی بەتاڵ بوو.

قەیرانەکەی ۱۹۲۹ دەساڵی تەواوی خایاند و هیچ کاتێکیش کۆتایی پێ نەهات، تەنها لەکاتی ئەو ڕەونەقە ئابووریە کە لەئەنجامی جەنگی دووەمی جیهانیەوە هاتە ئاراوە، پاشەکشێی کرد. ئەو پلانە چاکسازیانەی کە لەلایەن دەولەتی دیموکراتی ((فرانکلین ڕۆزفلت))ەوە

جێبەجێکران، بوون بەفاکتەری سەرەکی ڕزگار بوونی کەپیتالیزم و چارە و دەوایەك بۆ ئەو ئابوورییە ناتەندرووستییەی کە دونیای بازرگانی درووستی کردبوو.

لەسیاسەتی ئابووریدا دەکرا سێ ڕێگا چارەی سەرەکی ڕەچاو بکرێت : یەکێك لەو ڕێگایانە فرێنی بوو لە هێشتنەوەی باروودۆخەکە بەبێ ئەوەی گۆڕانی بەسەردا بهێنرێت و دەستتێوەرنەدانی دەوڵەت لەکار و باری ئابووری و سپاردنی پشت ڕاستکردنەوەی کارەکان بۆ خوودی سەرمایەدار و خاوەن کارگەکان، بۆ ئەوەی بە هەوڵ و تێکۆشانی تاکەکان و داهێنانی دونیای بازرگانی کۆتایی بەقەیرانەکە بهێنێت و شوێن پێی گشتی ئابووری ئەمریکا پتە و ڕێك و پێك بکەن. سیاسەتی ((هوور))سەرۆك کۆماری ئەوکات، لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا هەماهەنگ بوو، بەو هیوایەی کەبەپشتیوانی کردنی لەچینی سەرمایەدار و نەبوونی دەستتێوەردانی دەوڵەتی لەکاروباری بازرگانی و ووردەووردە لەبێ برەوی بازاڕ کەمبکرێتەوە وسەرمایەداری ڕەواج پەیدا بکاتەوە. ڕێگایەکی تر، گۆڕانی بنەماکانی بنچینەی کۆمەڵگە، سنووردار کردنی هێزی سەرمایەداری، یەکسان دابەشکردنی سەروەت و سامان و، هەڵوەشاندنەوەی خاوەنداریەتی تایبەتی هێزەکانی بەرهەمهێنان بوو، کەلەبنچینەدا پێچەوانەی سیستەمی باوی کۆمەڵگەی ئەمریکی بوو. درووستکردنی پردی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و ئابووری، ڕێگایەکی دیکە بوو، بەشێوەیەکە کە دەوڵەت بەدەستتێوەردانی لەکاروباری ئابووری، داهێنان کاری لەهەموو بوارەکاندا بگرێتە دەست و لەڕێگەی سەرمایە گوزاری گشتیەوە بچێت بەهانای دونیای بازرگانیەوە و بە بەکارهێنانی ڕێ و شوێنی نوێ یارمەتی دەربێت بۆ ئەوەی هێدی هێدی سیستەمی سەرمایەداری لەناوەڕۆکەوە چاکسازی لەخۆیدا بکات. گرینەی سەرمایە گوزاری گشتی و دەستتێوەردانی دەوڵەت لەکاروباری ئابووری، بەهاتنە سەر کاری دەوڵەتی دیموکراتی لەسەردەمی سەرۆك کۆماری ((فرانکلین ڕۆزفلت))دا گرنگی زۆری پێدرا. بۆچوونەکانی لۆرد ((کینز))، ئابووری ناسی بەناوبانگی ئینگلیزی، دەربارەی پەیوەندی دەوڵەت و ئابووری، ڕۆڵی سەرمایەگوزاری دەوڵەتی لەپێناو زیادکردنی دەرامەتەکان و ڕێژەی بەکارهێنان و ڕەونەقی چالاکیە ئابوورییەکان، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر سیاسەتی نوێی ئەمریکا و پلانە چاکسازیەکان درووست کرد. ((بیرۆکەی گشتی ، پیشە و بەهرە)) نوسینی ((کینز)) لەیەکێك لەبەرهەمە ئابوورییە هەرەگرنگەکان دەژمێررێت. زۆرێك لەبیریاران ئەو بەرهەمە بەهاوتای ((سامانی نەتەوەکان))ی ئادەم سمیپ و ((سەرمایە))کەی کارل مارکس دادەنێن. گرینەکەی ((کینز)) لەڕووی زانستی ئابوورییەوە بایەخێکی زۆری هەیە و لەڕاستیدا بەتەواوکەری بیروبۆچوونی ئابوورینناسە کلاسیکەکان لەقەڵەم دەدرێت. لەجیاتی ئەوبۆچوونەی کەخۆهەڵقورتاندنی دەوڵەتی لەکاروباری

ئابووریداقە دەغەدەکرد، ((کینز)) باوەڕی وابوو کە [بەپێچەوانەوە ، ئەم دەستێوەردانە] بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی جیاوازی و نایەکسانی نێوان پاشەکەوت و سەرمایەگوزاری زۆر پێویست و زەرورە. ((سەرمایە گوزاری ناپەسەند)) واتای بەرهەمی کەم و بێکاری زۆر دەگەیەنێت و لەپێناو بوژانەوەی ڕەونەقی ئابووری پێویستە ڕێژەی سەرمایە گوزاری زیاتر بکرێت. سەرمایە گوزاری دەوڵەتی، وەك ڕێگاچارە و دەرمان بەکار بهێنرێت، چوونکە ئەم سەرمایەگوزاریە، لەلایەکەوە دەبێتە هۆی زیادبوونی دەرامەتی تاکەکەسی و ڕێژەی بەکار هێنراو و لەلایەکی تریشەوە ڕەخساندنی چەندەها پیشەی نوێ، نزمبوونەوەی ڕێژەی بێکاری لێدەکەوێتەوە. کۆکردنەوەی پاشەکەوتەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمهێنان و پیشە، بە سەرمایە گوزاری گشتیەوە دەبەسترێتەوە. لەڕاستیدا بۆچوونەکەی ((کینز)) ڕێگای بۆ پەرەپێدانی خزمەتگوزاریەکان و چالاکیەکانی دەوڵەت کردەوە. درووستکردنی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و ئابووری بەبیرۆکەیەکی نوێ لەساڵەکانی قەیراندا دەژمێررا. بەسەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری فاتیحەی سەرمایە گوزاری سەرکەوتوو ، بەلایەنی کەمەوە بۆماوەیەك خوێندرابوویەوە و ئەمریکا پێویستی بەبیرۆکەیەکی نوێ هەبوو کە جگە لەگونجانی لەگەڵ بارودۆخ و ژینگەی کۆمەڵایەتیدا، یارمەتی دووبارە زیندوو کردنەوەی ژیانی ئابووری ئەمریکا بدات. ((کینز)) ڕێگاچارەیەکی خوازراوی بۆ ڕزگار بوون لەگێژاوی قەیران خستە ڕوو. قبوڵکردنی ئەو بیرۆکەیە زیاتر لەبەر ئەو بارودۆخە لەناکاوە و بێ برەویە ئابووریە بوو کەئەمریکا پێیدا تێدەپەڕی. بەهەڵبژاردنی ((ڕۆزفڵت)) بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری لەساڵی ١٩٣٣، سەردەمی ((پێشنیازی نوێ)) و پلانە چاکسازیەکانی دەستی پێکرد.

دووجار پێش ئەم مێژووە، گۆڕانکاریەکی دیاریکراو لەسەر ڕێژەی مێژووی ئەمریکا درووست کردبوو. شۆڕش و سەربەخۆیی، کۆتایی بەسەردەمی کۆچنشینەکان هێنا و بناغەی حکومەت و کۆمەڵگەیەکی نوێی ڕەنگ ڕێژ کرد، شەڕی ناوخۆ کەلەپێناو ڕێگەگرتن لەدابەشبوونی ویلایەتەکان سەری هەڵدا و لەگەڵ گۆڕانی سەرمایەداری پیشەسازیدا، پێشکەوتنی زانستی و بەرهەمەندی کارگەکانی لەگەڵ خۆی هێنا. قۆناغی سێیەم، دەورەی سەرۆك کۆماری ((فرانکلین ڕۆزفلت)) و جێبەجێکردنی ((پێشنیازی نوێ))یە، کە پاش قەیرانی ساڵەکانی ١٩٣٠ و ئاشکرابوونی لاوازی سەرمایەداری و وەرشکستبوونی دونیای بازرگانی، لەگەڵ پلانە چاکسازیەکاندا دەستی پێکرد.

گرنگترین هۆکار کەشکستی بازاڕی ئابووری لێکەوتەوە، کۆتایی هێنان بەسەردەمی ((لەسەفەر))و سیاسەتی ئابووری ئازاد بوو. دونیای بازرگانی کەنەیاری هەرجۆرە دەستێوەردانێکی دەوڵەت لەکاروباری ئابووریدا بوو، کەوتبوویە گێژاوێکی وەهاوە کە یارمەتیدانی دەوڵەتی بەتەنها

ڕێگەیەك بۆ دەربازبون لەم بارو دۆخە دەبینی. یارمەتیدانی بێکاران، جێگیرکردنی چاودێری دەوڵەتی بەسەر سیستەمی دراو بانکەکانەوە، هاوکاریکردنی کۆمپانیا بازرگانەکان، چاککردنی لایەنی کشتوکاڵی، ڕێکخستن و دابینکردنی مافی کرێکاران، گشتاندنی بیمە کۆمەڵایەتیەکان، دابینکردنی غەرامەی بێکاری و هاندانی بازرگانی، لەو جۆرە چاکسازیانە بوون کە ((ڕۆزفلت)) وەك سەرمەشقی کارەکانی خۆی دەستنیشانی کردن. بەهۆی ئەو یاسایانەی دەری کردن، چاودێری و دەستتێوەردانی دەوڵەتی لەهەموو بوار و زەمینە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکاندا پەرەپێدا و ڕۆڵی دەوڵەت لەکاروباری ئابووریدا بایەخێکی زۆرتری پەیدا کرد. سیاسەتی ((پێشنیازی نوێ)) تەنها لەسەردەمی ڕۆزفلت دا پیادە نەکرا، پاش کۆتایی هاتنی قەیرانەکەش، هەندێك لەداهێنانکاریەکانی هەر کاریان پێکرا و، چوارچێوەی گشتی سیاسەتی ئابووری دەوڵەتی بۆ ساڵەکانی دواتریش دیاری کرد.

بەداخستنی بانکەکان، چاودێریکردنی کاروبارەکانیان دەستی پێکرد. ئەو بانکانەی کە بناغەیەکی مادی بەهێزتریان هەبوو، ڕێی کارکردنیان پێدراو بانکە ئاساییەکانیش هەڵوەشانەوە. سیستەمی بانکی و متمانەیی (ئعتباری) ووڵات گۆڕانی تێدا کراو کۆمەڵە ڕێسایەکی دیاریکراو بۆ بانکە نوێیەکان دانران. دەزگای بۆرسە، کڕین و فرۆشتنی پشك و بەڵگەی بەهادار خرانە ژێر چاودێری دەوڵەتەوە. لەبواری کشتوکاڵیشدا چەند هەنگاوێك جێبەجێکران. ئەو یاسایانەی کەلەساڵی ١٩٣٠ بڕیاریان لەسەردرا، بناغەی سیاسەتی کشتوکاڵی ئەمریکایان لەسەر دامەزار. بەرهەمی زۆر و سەرنەکەوتوویی جووتیاران لەپەرەپێدانی بازاردا، کاری لە دابەزاندنی نرخی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان و کەمبوونەوەی دەرامەتی جووتیاران کردبوو. بەڵام یاسای نوێ یارمەتی جوتیارەکانی دەدا بۆ ئەوەی بتوانن ڕێژەی بەرهەمهێنانی خۆیان کەم بکەنەوە، لەسەر دەوڵەتیش پێویست بور کە بەرووبوومی زیادەی جووتیارەکان بکڕێت، بەرهەمی گەنم بیمە بکات و لەبەرامبەر بەڵێنی کەمکردنەوەی چاندن، متمانەی پێویست پێشکەش بەجووتیاران بکات. لەپڕۆژە گرنگەکانی ئەم سەردەمە، بەرنامەی ئاوەدانکردنەوەی دۆڵی تەنسی یە کە کاریگەریەکی زۆری لەسەر گۆڕانکاری ئابووری ویلایەتەکانی باشوور هەبوو. دەوڵەت بەدرووستکردنی بەنداوی جۆراوجۆر لەبەردەم ڕووباری تەنسیدا ، ووزەی کارەبا و ئاوی ناوچەکەی دابین کرد و یارمەتی دەرێکی باش بوو بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو ناوچانە. سەرمایە گوزاری گشتی کەیەکێك لەئامۆژگاریەکانی ((کینز)) بۆ برەوپێدانی ژیانی ئابووری هەژمار دەکرا، بەشێوەیەکی بەربڵاو لەئاوەدانکردنەوەی ئەو دۆڵەدا بەکار هێنرا. ئەم شێوازە ئەزموونیەی ئابووری تێکەڵاو ـ نیمچە دەوڵەتی و ئازاد ـ کاریگەریەکی زۆری لەسەر پاراستنی سیستەمی سەرمایەداری هەبوو.

دەوڵەتی فیدراڵ بەسەرفکردنی ملیۆنەها دۆلار لەپێناو لەناوبردنی بێکاری لە وڵاتدا دەست پێشخەری کرد، درووستکردنی جادە، پارك و دارستان، بەڕێوەبەرایەتیە نوێیەکان بە پلەی یەکەم بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بێکاری و ڕاکێشانی لاوان و گروپە کۆمەڵایەتیە جۆراوجۆرەکان بەرەو پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوە خانە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. ئەم ئەزموونە پیشانی دا، کە لەکاتی سەرهەڵدانی هەرجۆرە قەیرانێکدا، دەوڵەتێکی هۆشیار و بەئاگا تاچ ئەندازەیەك دەتوانێت لەگۆڕانکاری کۆمەڵایەتیدا بەسوود و کاریگەر بێت. زیادبوونی هەژاری و بێ ئەوایی کەئەزموونی ڕاستەوخۆی زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگەبوو، دەرکردنی یاساکانی بیمەی کۆمەڵایەتی لێکەوتەوە. بیمە کۆمەڵایەتیەکان بەمەبەستی یارمەتی مادی لەکاتی بێکاری، هەژاری، پیری و نەخۆشیدا پێشکەش دەکران.

گرفتی سەرەکی، ژمارەی بێکارەکان بوو، کەبە هەمورو ئەو ڕێ و شوێنانەی کەلەساڵی ١٩٣٨ لەلایەن دەوڵەتی فیدراڵەوە گیرایە بەر، نزیکەی دەملیۆن کەس دەخەملێنرا. تەنها جووڵەیەك کەجەنگی دووەمی لەڕووی ئابووریەوە هێنایە کایەوە، ئەم گرفتەی کۆتایی پێهێنا. بەڵام کۆششی دەوڵەتی فیدراڵ بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارە و ئەو ئەرکەی کەگرتیە ئەستۆ، قەبولکردنی ئەو بیرۆکەیەی مومکن کرد، کە دەوڵەت بەهەرحاڵ لەبەڕێوەبردنی کاروباری ئابووری و دابینکردنی خۆشگوزەرانی گشتیدا لێپرسراو و بەرپرسیارە.

گرنترین پلانی چاکسازی ڕۆزفلت، ڕێکخستنی یەکیەتیە کرێکاریەکان و یارمەتیدانی پاراستن و چەسپاندنی مافی کرێکاران بوو. ((فرانسیس پەرکینز)) وەك یەکەمین وەزیری ئافرەت لەکابینەی ئەمریکادا ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری کرێکارانی گرتە ئەستۆ و لەپێناو چاککردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی کرێکاران و ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان کرێکار و خاوەن کار هەنگاوی نا.

مافی ئازادی کۆبوونەوەی کرێکارن بەئاسانی دانی پێدا نەدەنرا. بزووتنەوە کرێکاریەکان زۆرجار توندوتیژی لێدەکەوتەوە. مانگرتنە یەك لەدوایەکەکانی ساڵەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم، بەهۆی ڕووبەڕوو بوونەوەی سەرباز و خاوەن کارەکانەوە، بەکارەساتی دڵتەزین و خوێناوی کۆتاییان دەهات. لەدەیەی ١٩٢٠ کاتێك کەدەوڵەت وازی لەکاروباری بازرگانی هێنا و تەنها ڕۆڵی تەماشاگەر و هاندەرێکی دونیای بازرگانی دەگێڕا، ژیانی کرێکاران لەڕووی دامەزراندنی سەندیکاییەوە بەقۆناغێکی ئاسکدا تێپەڕی. خاوەن کار، کە ئامرازەکانی دادوەری و هێزی سەربازی وڵاتی لەژێر دەستدابوو، ئەو پەڕی دڵڕەقی ڕووبەڕووی داواکاریە ڕەواکانی کرێکاران دەوەستایەوە. قەیرانی دەیەی ١٩٣٠، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا بوو لەسەر لاوازی و

وەرشکست بونی سیستەمی ئابووری لیبرالیزم و داننان بەو ڕاستیەی کەبەپێی زەمەنەکان، پێویست بوو پێداچوونەوەیەکی گشتی لەسەر هەموو دام و دەزگا ئابووریەکان بکرێت و، درووستکردنی دامەزراوە نوێیەکان بەمەبەستی پشت ڕاستکردنەوە و ڕێکخستنی پەیوەندیە کرێکاریەکان لەو جۆرە هەنگاوانە بوون ((فیدراسیۆنی کاری ئەمریکا )) کە بەسەرکردایەتی ((سامویل کۆمپەر)) لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم دامەزرابوو، تەنهاکرێکارە پسپۆڕەکانی ـ ئەویش بەپێی مەرجی قورس و گران ـ وەردەگرت و گیانی دانوسان و ڕاهاتن لەگەڵ ئەو دەزگا ئابووریانە، سیاسەتی گشتی ((سامویل کۆمپەر)) بوو، لەدەستدانی زیاتر لە ٥٠٪ی تێکڕای ئەندامانی ئەو فیدراسیۆنەی لێکەوتەوە. چالاکی ئازادانە، کەدەوڵەت هەموو دامەزراوە کرێکاریەکانی لەسەر هان دەدا، بووە هۆی ئەوەی کە ((جۆن لوئیس)) یەکێك لەرابەرە کرێکاریەکانی پێشنیازێکی نوێ سەبارەت بەوەرگرتنی کرێکارە نەشارەزاکانیش بخاتە ڕوو. بەڵام ((فیدراسیۆنی کاری ئەمریکا)) پێشنیازەکەی ڕەت کردەوە و لەبەر ئەم هەڵوێستە ((جۆن لوئیس)) و ژمارەیەك لەئەندامەکانی تر وازیان لەو یەکیەتیە هێنا و دامەزراوەیەکی نوێیان بەناوی ((کۆنگرەی ڕێکخراوە پیشەسازیەکان)) درووست کرد. بزووتنەوەی کرێکاری کەلەساڵەکانی ١٩٢٠دا بەرەو نەمان دەچوون، لەناکاو کورووتینێکی نوێیان وەرگرت و ((جۆن لوئیس)) و کۆنگرەی ڕێکخراوە پیشەسازیەکان توانی بەبێ‌پیاهەڵدان ملیۆنەها کەس بەدەوری خۆی کۆبکاتەوە. کرێکارانی بەرهەمهێنانی پۆڵا، ئۆتۆمبێل و فرۆکە، ئاسن و تایەی ئۆتۆمبێل و ڕستن و چنین هاتنە ناو ئەم سەندیکایەوە. گرنگترین ماوەی خۆسەلماندنی هێزە کرێکاریەکان بۆ ئەم ساڵانەی ١٩٣٠ دەگەڕێتەوە، کەتەنها و تەنها بەکار و چالاکیەکانی ڕابەرانێکی وەك ((لوئیس)) ەوە نەبەسترا بوونەوە، بەڵکو پشتیوانی ڕاستەوخۆی دەوڵەتی ((ڕۆزفلت)) خۆی لەخۆیدا هۆکارێکی سەرەکی ئەم سەرکەوتنانە بوو. ئەم سیاسەتە کەلەیاسای ((واگنەر))دا ڕەنگی دایەوە، کاریگەریەکی زۆری لەسەر چارەنوسی کرێکاری ئەمریکایی درووست کرد. یاسا پێشنیاز کراوەکەی ((واگنەر)) ئازادی مافی هەڵبژاردنی سەندیکای بەبێ خۆهەڵقورتاندنی خاوەن کار بۆ کرێکاران دەستەبەر کرد، سەندیکای بەتەنها سەرچاوەیەکی کرێکاری لەقەڵەم داو دەستەیەکی بۆ بەداوادا چوون و ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان کرێکار و خاوەن کار دەستنیشان کرد. ئەرکی ئەم دەستەیە ئەوەبوو کە هەڵبژاردنی سەندیکاکان لەڕووی بەئەندام بوونی کرێکار و ڕێگە گرتن لەدەستتێوەردانی خاوەن کار بۆ هەڵبژاردنی ((کەسانی متمانە پێکراو)) بخاتە ژێر چاودێریەوە و جگە لەوەش گوێ لەداواکاری و گرفتەکانی کرێکاران بگرێت. مافی مانگرتن، دامەزراندنی سەندیکا، گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە لەگەڵ خاوەن کار و ڕێگە گرتن لە دەرکردنی نایاسایی کرێکاران،

لەو جۆرە ڕێ و شوێنانە بوون کە لەبەرژەوەندی کرێکارەکاندا گیرانە بەر. یاسایەکی دیکەش هەر لەم ساڵانەدا بڕیاری لەسەر درا، کەتیایدا ئەوپەڕی ماوەی کارکردن و کەمترین ڕێژەی کرێی ڕۆژانەی دەستنیشان کرد و کارکدنی منداڵانی قەدەغە کرد. گرنگی دانی دەوڵەتی ((ڕۆزفلت)) بەمەسەلەی کرێکاران، هۆکارێکی سەرەکی سەرکەوتنی بیروڕاکانی ئەوانبوو.

هەڵبەت دەستێوەردانی دەوڵەت لەکاروباری کرێکاران هەمیشە لەبەرژەوەندی کرێکاراندا نیە. بەپێی یاسایەکی پێشنیازکراوی دیکە، کەلەسەردەمی ((ترومن))داو لەلایەن ((تافت ـ هارتلی))یەوە خرایە ڕوو، دەوڵەت لەو شوێنانەی کە بەپێویستی بزانێت دەتوانێت ڕێگە لەمانگرتنەکان بگرێت و یان کاتی گفتوگۆکان پێش مانگرتن بەئارەزووی خۆی دوا بخات [ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەرژەوەندی کرێکاران دەخاتە مەترسییەوە]. هەر ئەم مەسەلەی دەستێوەردانەی دەوڵەت، جیاوازی لەنێوان سەندیکا کرێکاریەکانی ئەمریکا و سەندیکا هاوشێوەکانی لەئەورپای ڕۆژئاوادا درووست کرد. سەندیکا کرێکاریەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا سەربەخۆیی خۆیان دەپاراست، بەپێچەوانەی کرێکارانی پیشەسازی ئەمریکا کەلەسەریان پێویست بوو، لەکاتی دامەزراندنیاندا پەیوەندی بکەن بەسەندیکایەکەوە و لەم هەڵبژاردنەشدا ئازادیەکی ڕەهایان پێدرابوو.

قەیرانی ئابووری، بەرنامەی پشتیوانی دەوڵەت لەکرێکارن و دامەزراندنی سەندیکای کرێکار بەگەورەکان، شوێن و پێگەی ئەم چینەی لەکۆمەڵگەی ئەمریکادا گۆڕی. هەرچەندە ئەم هەنگاوانە نەیانتوانی گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی لەسیستەمی ئابووری ئەمریکادا بکەن، بەڵام بەهەر حاڵ هەنگاوێکی پۆزەتیف بوو کە گۆڕانی بەسەر ژیانی زۆرێك لەئەندامانی کۆمەڵگەدا هێنا. هەڵوەشانەوەی ((فیدراسیۆنی کاری ئەمریکاو کۆنگرەی ڕێکخراوە پیشەسازیەکان)) یەکیەتیەکی گەورە لەکرێکارانی پسپۆڕ و نیمچە پسپۆڕ پێك هێنرا. دەسەڵاتی فراوانی یەکیەتیە کرێکاریە گەورەکان لەپاڵ دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدراڵی و کۆمپانیا گرنگەکان یەکیان گرت. لەئەنجامی چاکتربوونی ژیانی کرێکاران و جووتیاران، ژیانێکی ئابووری و سیاسی نوێ پێشکەش بەم دووگروپەی کۆمەڵگە کراو یەکیەتیە گەورەکان خۆیان وەك هێزێکی گەورە بەکۆمەڵگە ناساند. بەقەولی ((گالبریت)) ئابووری ناسی بەناوبانگی ئەمریکی، سیستەمی سەرمایەداری لەجیاتی بنەمای کێبرکێ، بیرۆکەی ((دەسەڵاتی هاوسەنگ))ی هەڵبژارد. هێزی کۆمپانیا بازرگانی و دامەزراوە پیشەسازیەکان، لەگەڵ دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدراڵی و سەندیکای کرێکاری و جووتیاریەکان جۆرە هاوسەنگیەکی هێنایە ئاراوە. بەرهەمی دەیەی ۱۹۳۰ ((ژیانی خۆشگوزەران)) بوو کەبەهۆی دەرکردنی کۆمەڵە یاسایەکی وەك یاسای واگنەر و دابینکردنی

غەرامەی بێکاری و یاساکانی ڕێکخستنی کشتووکاڵی بەبەرژەوەندی ئەو کرێکار و جووتیارە پسپۆڕانەی کە بۆ بازاڕە گەورەکان کاریان دەکرد، کۆتایی هات. بەڵام جوتیارانی تۆوکاری هەژار و کرێکارە نەشارەزاو ناپسپۆڕەکان، هیچ سوودێکیان لەم بەرنامەیە نەبینی و یاسا چاکسازیەکان ئەوانی نەگرتەوە. هەر بەو جۆرەی کە ((گالبریت)) بیرمان ئەخاتەوە، کەمەمانە تەنها چەوساوانێك بوون کەسیاسەتمەداران لەبیریان کردن. ئەمانە خەڵکانێك بوون لەنێو پیشە کۆنکرێتیەکاندا و ناوێتە لەکەمینە نەژادیەکان ـ زۆرێك لەوانە کاتێك هاتنە نێو دونیای ئابووریەوە ـ وەك ئەوکاتەی کە((کۆنگرەی ڕێکخراوە پیشەسازیەکان)) بەئەندامبوونی ڕەشەکان لەو یەکیەتیەدا پەسەند کرد، کەسانێکی زۆر بەتوانا و لێهاتوویان لێدەرچوو. پلانە چاکسازیەکان و ((پێشنیازی نوێ)) بوون بەفاکتەرێکی سەرەکی لەپەرەسەندنی دەسەڵاتی حیزبی دیموکراتدا و لەڕاستیدا بەهۆی کارەکانی ((ڕۆزفلت)) و سەرکەوتوویی ئەم ڕابەرەسیاسیەوە بوو کەحیزبی دیمووکرات توانی بگاتە ئەم ئاستە و ببێتە حیزبی زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگە. دواتریش هەرچەندە بەرنامەکانی ((ڕۆزفلت)) لەپاش خۆی بەتەواوەتی پەیڕەو نەدەکران، بەڵام حیزبەکەی بەردەوام لەشێوەی حیزبی زۆرینەدا مایەوە. ئەوەی کەشەڕی ناوخۆ لەسەدەی نۆزدەیەمدا بۆ سەرکەوتنی کۆماریخوازەکان هێنایە پێشەوە و حیزبی کۆماریخواز بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ کردە حکومڕانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، قەیرانی ئابووری دەیەی ۱۹۳۰ بۆ دیموکراتەکانی هێنایە پێشەوە. پلانە چاکسازیەکانی ((ڕۆزفلت)) دەربارەی تێکڕای خەڵکی ئەمریکا، لەقۆناغێکی مێژوویی لەبار و گونجاودا بەسوود وەرگرتن لەو دەرفەتەی کە ڕەخسابوو، لەبەرژەوەندی حیزبی دیموکرات کۆتایی پێهات. جووتیارەکان پاش دەرچوونی یاساکانی چاککردنی کشتووکاڵ، کە دەوڵەتی ناچار بەپشتیوانی لەو چینەی کۆمەڵگە دەکرد، زیاتر سەرنجیان بۆلای ئەو حیزبە دەچوو. تاگەشتبوویە ئەو ڕاددەیەی کەلە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹٤۹دا، پشتیوانیکردنی جووتیاران بوو بەیەکێك لەهۆکارەکانی سەرکەوتنە چاوەڕوان نەکراوەکەی ((هاری ترومن)) کە تائەو کاتەش لەسەر سیاسەتی ڕۆزفلت و حیزبی دیمووکرات وەفادار مابوویەوە. هەر لەم سەردەمەدا حیزبی دیمووکرات توانی ڕەشەکانیش بۆلای خۆی ڕابکێشێت. ڕەشەکان کەلەبەر سەرکەوتنی شەڕی ناوخۆ و ئازادی کۆیلەکان لەگەمارۆی (ڕەهنی) کۆماریخوازەکاندا بوون، ووردەووردە بۆیان دەرکەوت کەحکومەت گرنگیەکی ئەوتۆیان پێنادات. ((ویلسۆن)) یش لەگەڵ ئەوەی کە ڕۆڵێکی گەورەی لەڕووی سیاسەتی دەرەوە و چەسپاندنی ئاشتی و ئارامیدا دەگێڕا، وەك کەسێکی نمونەیی و مرۆڤ دۆست خۆی ناساند، بەڵام نەیتوانی هیچ جۆرە کاردانەوەیەك لەم بارەیەوە ئەنجام بدات و، جیاکردنەوەی شوێنی کارکردنی ڕەشەکان لەنێو بەڕێوەبەرایەتیە حکومیەکاندا، لەو کاتەوە دەستی پێکردوو

ڕەشەکانیش بەردەوام لەناو زەلکاوی دەمارگیریە نەژادیەکاندا نقووم دەبون. بەدەستیەکاربوونی حکومەتی ((ڕۆزفلت)) گرنگیدان بەو دیاردە دزێوە کەڕیانی لەڕەشەکان تالکردبوو دەستی پێکرد. لەسالی ۱۹۳۰دا ژمارەی نوێنەرەکانیان لە کۆنگرەدا زیادی کرد. سیاسەتی ((ڕۆزفلت)) جەختی لەسەر دامەزراندنی ڕەش پێستەکان لەبەڕێوەبەرایەتیەکان، کارگەکان و بەرنامەکانی ئاوەدانکردنەوە دەکردەوە و لەهەموو کەس زیاتر ((ئەلنور))ی هاوسەری بۆ پشتیوانی کردن لەڕەشەکان تێدەکۆشا و توانی سەرنجی زۆرێك لەڕەش پێستەکان بۆلای خۆی ڕابکێشێت. هەر جۆرە کردارێکی ڕەگەز پەرستی لەسەر بنەمای نەژاد و ڕەنگی پێست، لەسەندیکا کرێکاریەکاندا قەدەغەکرا و هەرئەم هەنگاوەش بوو کەوای کرد زۆرێك لەڕەشەکان بەدەستپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی، پەیوەندی بە هێزەکانی سوپای ئەمریکاوە بکەن و دەرفەتی یەکسانیان وەك گروپە سەربازیەکانی دیکەی ویلایەتە یەکگرتووەکانە بۆ دەستەبەر بکرێت.

ئەگەر ململانێ چاکسازیەکان و ((پێشنیازی نوێ)) لەئەمریکا بایەخێکی شۆڕش گێڕانەی هەبایە، ئەواو هۆکارەکەی بۆ گۆڕانی سیستەمی ئابووری نەدەگەڕایەوە، بەلکو لەبەر گۆڕانی شێوازی بیرکردنەوەی تێکڕای خەلك بەرامبەر بە حکومەتی فیدرالی بوو. لەماوەی چەند سالێدا، دەولەت و دام و دەزگاکانی، کە ئاسنامەکەی تەنها لەکۆکردنەوەی باج و باجی گومرگ و قەدەغەکردنی مادە سڕکەرەکان و درووستکردنی پارکەکاندا کورت دەکرایەوە، بەبەرچاوی تێکڕای هاولاتیانەوە، بووبەدۆست و پشتیوانی هەژار و بێنەواکان و تێکڕای خەلکی ئەمریکا و قەلغانێك بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە و گیرگرفتەکانیان.

((فرانکلین ڕۆزفلت)) بوونیادنەری سەرۆك کۆماریەتی مۆدێرنە. کاتێك کەئەو بوو بەسەرۆك کۆمار پلە و پایە و ڕۆلی دەسەلاتی جێبەجێکردن ئەوپەڕی لاوازی و بێ دەسەلات سەیر دەکرا. حکومەتەکانی ڕابردوو کرابوون بەئامێرێکی یاریکردن بەدەستی دونیای سەرمایەداریەوە و کاروباری بازرگانیان بەهەموو شێوەیەك پشتگوێ خستبوو. بایەخ وگرنگی ڕۆلی ((فرانکلین ڕۆزفلت)) بەبەراورد لەگەل ئامۆزاکەی، واتە ((تیئۆدۆر ڕۆزفلت)) و تەنانەت ((ویلسۆن))یش زیاتر بەرزترە، کۆشکی سپی لەسەردەمی سەرۆك کۆماریەتی ئەودا کرا بەناوەندی بەڕێوەبردنی کاروباری وولات، سەرچاوەیەك بۆ خستنەرووی بیرۆکە نوێیەکان و هۆکارێکیش بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەرنامانە. بەپەرەسەندنی ئیختیاراتی دەسەلاتی جێبەجێکردن، دەسەلاتی یاسادانانیش کەوتە ژێرکاریگەریەوە. ((ڕۆزفلت)) یەکەمین سەرۆك کۆمار بوو کەتوانی لەڕێگەی ڕادیۆوە پەیوەندیەکی خۆمانە و خۆشەویستانە لەگەل خەلکیدا بەرقەرار بکات. بەووتارە گەرم و بەپێزەکانی لەپێناو بەدەستهێنانی متمانەی هاولاتیان و دلنەوایی دانەوەیان تێدەکۆشا. لەتاریکترین ڕۆژەکانی

قەیراندا دووپاتی دەکردەوە کە ((تەنها دەبێت لەترس بترسین.)) گفتوگۆ سادەو پڕ لەخۆشەویستیەکەی، لەناخی هەموو تاکێکی ئەمریکادا هەستی بەیەکەوە بەستنی لەگەڵ دەوڵەت و حکومەتەکەیدا دروست کرد. خەڵکی ویلایەتەکانی دیکەش سەرنجیان بۆ لای دەوڵەتی فیدراڵی و حکومەتی واشنگتۆن ڕاکێشرا و ((فرانکلین ڕۆزفلت)) بەکەسێك لەخۆیان دەزانی.

((فرانکلین ڕۆزفلت)) لەنێو ژینگەیەکی خۆشگوزەراندا پەروەردە کرابوو، ئاستێکی خوێندەواری بەرزی هەبوو، لەتەمەنی لاویەتیدا هێز و ووزە لە پێیەکانی بڕا، بەڵام بەهێزی ئیرادە و پتەوی کەسایەتیەکەی، ئەوی بەسەر هەموو تەنگ و چەڵەمەکاندا زاڵ کرد. لەکاتی سەرۆك کۆماریەتی ((هوور))دا فەرمانداری ویلایەتی نیویۆرك بوو، چالاکیەکانی لەهەڵبژاردنەکاندا بەدرووشمی خۆشگوزەرانی ((خەڵکی فەرامۆشکراو)) دەست پێکرد. قسەکانی زۆر دڵگیر بوون و توانی لەدڵی تێکڕای خەڵکی ئەمریکادا جێی خۆی بکاتەوە. هەر بەو شێوەیەی کە ((ویلیام داگلاس)) دادوەری گەورە و بەناو بانگی ئەمریکی نوسیویەتی : ((ڕۆزفلت سەرۆك کۆماری تێکڕای خەڵك بوو نەك سەرۆك کۆمارێك کەتەنها پشتیوانی لەبەرژەوەندی گروپێکی تایبەت بکات. لەگەڵ خەڵکی بەرادەیەك سادە و خۆشەویستانە گفتوگۆی دەکرد، کەئەوان خۆیان لەبەڕێوەبردنی کاروباری حکومەتدا بەشەریك و بەشداری دەزانی.)) لەسەردەمی ئەوادابوو کەکرێکاران بەمافە کۆمەڵایەتیەکانیان شادبوون و سەرمایەداری دەستی بەچاکسازی لەناوەڕۆکی خۆی کرد. لەم ڕووەوە سیاسەتی ڕۆزفلت لەگەڵ نەریتە دیموکراتیەکانی ئەمریکادا هەماهەنگ بوو، بەرادەیەکی زۆر سوودی لە بەرنامەکانی سەردەمی ڕووداوە پێشکەوتن خوازیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم وەرگرت، ((پێشنیازی نوێ))، بەووتەی ((فرانك فریدل)) نوسەری ژیان و بەسەرهاتی ((ڕۆزفلت))، لەچوارچێوەی نەریتەکانی ڕابردووی ئەمریکادا هەنگاوی نا.

((ڕۆزفلت)) و هاوکارەکانی، هەموویان لەنەوەی سەردەمی پێشکەوتوخوازی سەرەتای سەدەی بیستەم بوون و باوەڕ بەدادپەروەری کۆمەڵایەتیان لەو سەردەمەوە وەرگرتبوو. هۆکاری سەرکەوتنی ناوبراو جگە لەلێهاتوویی سیاسی کەپەرەسەندنی حیزبی دیموکراتی لێکەوتەوە، سیاسەتی نەرمی ئەوە، کەلەپێناو ڕزگارکردنی ئابووری وولاتەکەی لەتاقیکردنەوەی هیچ جۆرە ئەزموونێك سڵی نەدەکردەوە. سیاسەتی چاکسازی ((ڕۆزفلت)) هەردوو لایەنی عەینی و کردەیی لەخۆدەگرت، لەم ڕووەوە لەگەڵ فەلسەفەی فێرکردنی پراکماتیکی ((جۆن دیوی)) واتە ((فێربوون لەئەزموون))دا هەماهەنگ بوو. بەڵام ((پێشنیازی نوێ)) نەبووە هۆکاری گۆڕانی سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەمریکا و لەبەرامبەر ناڕەزایی دەسەڵاتی دادوەری و کۆنگریس و سەرمایەدارەکاندا پشت ڕاست کرایەوە و لەواقیعدا شۆڕشێك بوو کە لەنیوەی ڕێگادا ڕاوەستا.

هاوپەیمانی بەهێزی نێوان باڵی محافەزەکاری حیزبی دیموکراتی باشوور ـ کە زۆربەیان سەرۆکایەتی کۆمیتە جیاوازەکانی کۆنگرەیان لەئەستۆدا بوو ـ لەگەڵ کۆماریخوازە محافەزەکارەیەکانی باکوور، کەبەرگریکاری بەرژەوەندی خاوەن پیشەسازیەکان بوون، زۆرێك لەیاسا شارستانی و پڕۆژە کۆمەڵایەتیەکانی ئەو سەردەمەی پوچەڵ کردەوە. ئەم دژایەتی کردنەی پلانە چاکسازیەکان بەتایبەت لەساڵی ١٩٣٨ەوە ڕۆژ بەرۆژ زیادی دەکرد. پێشتر کۆمەڵێك نارەزایی لەلایەن دەسەڵاتی دادوەری و دادگای باڵاوە ئاراستەی دەوڵەتی فیدراڵی کرابوون بەبیانووی ئەوەی کەئەم پرۆژانەی دەوڵەت لەبوارەکانی ڕێکخستنی کاروباری بازرگانی، ئەو یاسایانەی کە پەیوەندیان بەخۆشگوزەرانی گشتییەوە هەیە، یاسای پشتیوانی کردن لەسەندیکا کرێکاریەکان و زۆرێك لەیاسا چاکسازیەکانی تری ڕۆزفلت، بەپێچەوانەی قانوونی ئەساسی ئەمریکا هەنگاو دەنێن. دەسەڵاتی دادوەری کە لەسەردەمی کۆڕانکاری پیشەسازی ئەمریکای پاش شەڕی ناوخۆدا، هەردەم لەپێناو پشتیوانی کردنی لەبەرژەوەندیەکانی سیستەمی سەرمایەداری هەوڵی دابوو، پلانە چاکسازیەکانی ڕۆزفلتی بەدەستێوەردانی نایاسایی دەوڵەت لەکاروباری بازرگانی لێك دایەوە. دادوەرەکانی دادگای باڵا بەبێ قانوونی ئەساسی لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە و بۆ هەتاهەتایە هەڵدەبژێررێن و لەسەردەمی ((ڕۆزفلت))دا زۆرێك لەم دادوەرانە سەربەو محافەزەکارانە بوون کە بۆماوەیەکی دوورودرێژ لەخزمەت بەرژەوەندیەکانی خاوەن سەرمایەکاندا کاریان کردبوو. ناوبراو هەوڵیدا ژمارەی داوەرەکانی دادگای باڵا زیاد بکات. بەڵام ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر بویەوە و تاوانی ئەوەیان خستە پاڵ کەگوایە ئەو دەیەوێت حکومەتێکی بەهێزی تاکڕەو لەئەمریکادا دابمەزرێنێت. ململانێی ((ڕۆزفلت)) لەگەڵ دادگای باڵا بۆ زیادکردنی ژمارەی دادوەرەکانی ئەم دادگایە نەگەشتە ئەنجام، بەڵام بەدەست کێشانەوەی یەکێك لە دادوەرکان ڕێگا بۆ هەڵبژاردن هەموار کرا ((ویلیام داگلاس))ی ـ کە مامۆستای زانکۆی ییل بوو و داوتر بوو بەیەکێك لەبەناوبانگترین ئەو دادوەرانەی کە تاکو ئێستا دەسەڵاتی دادوەری ئەو وڵاتە بەخۆوەی بینیوە ـ بۆ ئەم پۆستە هەڵبژارد. لەم سەردەمە بەدواوە یاساکان بەپەری ووردبینی و فراوان دیدیەوە لەلایەن دادگای باڵاوە دەخرانە ژێر لێکۆڵینەوە و پاساویش بۆ هەندێکیان دەهێنرانەوە.

ڕۆزفلت لەقۆناغە جۆراوجۆرەکاندا هەوڵی دەدا بەتەرخانکردنی گوژمەیەکی هاوسەنگ، سەرمایە گوزاری گشتی، هاندانی کەرتی تایبەتی، جەخت کردنەوە لەسەر دادپەروەری کۆمەڵایەتی، یارمەتی پێشکەوتنی باری ئابووری حکومەتەکەی بدات. بەڵام بەهۆی دژایەتیکردنی دادگای باڵا و دەستێوەردانی کۆنگرێسەوە، هەندێك لەبەرنامە چاکسازیەکانی هەڵوەشێنران و ئەویش بەناچاری ڕێگەی میانە ڕەوانەی هەڵبژارد. ((فرانکلین ڕۆزفلت)) تەنها

سەرۆك كۆمارێكە لەمێژووی ئەمریكادا، كەتوانیبێتی بۆ جاری چوارەم متمانەی گەلەكەی بەدەست بهێنێتەوە و ببێتەوە بە سەرۆك كۆمار. گرفتەكانی سەردەمی قەیرانی ئابووری، ئەو بارودۆخە ئالۆزەی كە جیهانی پێدا تێدەپەری، كاریگەریەكی زۆریان لەسەر دووبارە هەڵبژاردنەوەی ناوبراو هەبوو. بەڵام زیاتر لەهەمووشتێك كەسایەتی، لێهاتوویی، مرۆڤ دۆستی سەركەوتوویی خوودی ((رۆزفلت)) لەبەدەست هێنانی پشتیوانی تێكرای گەلەكەی بوو، كە ناوبراوی بۆ ماوەیەكی درێژخایەن كردە سەرچاوەزەی دەسەلات لەووڵاتەكەیدا.

((پێشنیازی نوێ)) و پلانە چاكسازیەكان هەموو گرفتەكانیان چارەسەر نەدەكرد. زۆرێك لەبەرنامە چاكسازیەكان چ لەلایەن كۆنگرێسەوە بێت و چ لەلایەن دادگای باڵاوە ئاستەنگێكی زۆریان خرایە بەردەم، هەندێك لەپلانەكان گۆڕانیان بەسەردا هات و هەندێكی تریش هەڵوەشانەوە. پاش مردنی ((رۆزفلت)) ژمارەیەكی زۆر لەلایەنگرانی ((پێشنیازی نوێ)) بەتۆمەتی ئەوەی كە بەنیاز بوون سیستەمی ئابووری ئەمریكا بڕوخێنن و هەوڵی لەناوبردنی كێبركێی ئازادیان داوە تاوانبار كران. پلانە چاكسازیەكانیش بەناوی ئەوەی كە دژایەتی و ناكۆكی كۆمەڵایەتیان دووبارە لەكۆمەڵگەی ئەمریكیدا زیندوو كردۆتەوە، رەخنەیەكی زۆریان لێگیرا. سەرەتاكانی دەیەی پەنجا، ئەو سەردەمەی كە ئەمریكا بەرەو كۆمەڵگەیەكی راستڕەو هەنگاوی دەنا، لەڕاستیدا بەنیشانەی پەرچەكرداری محافزەكارانە لەبەرامبەر ((پێشنیازی نوێ)) و كردەوە چاكسازی خوازیەكانی دەوڵەتی ((رۆزفلت)) هەژمار دەكرێت.

((پێشنیازی نوێ)) سەركەوتنێكی گەورەی بۆ چینی هەژار و بەشخوراوی كۆمەڵگە دەستەبەر كرد. چاككردنی ژیانی كرێكاران، پشتگیریكردنی جووتیاران و گرنگیدان بەگرفتە كۆمەڵایەتیەكان و هەوڵدان لەپێناوی بنەبڕكردنی دیاردەی رەگەزپەرستی، لەو جۆرە سەركەوتنانەن. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا سیاسەتی چاكسازی سەردەمی ((رۆزفلت)) بەهانای سیستەمی ئابووری سەرمایەداریەوە هات و رێك و پێكی كرد. بەڵام كاری چاكسازی كۆتایی پێ نەهات و بەووتەی ((هێنری والاس)) هاوكاری رۆزفلت كەسەردەمێك پۆستی جێگری سەرۆك كۆماری لەئەستۆدا بوو : ئەوان ((منداڵانی قۆناغی گواستنەوە)) بوون و ((رێبوارانێكیش بوون كەبەئامانجی سەرەكیان)) نەگەشتن. دەستپێكردنی جەنگی جیهانی لەساڵی ١٩٣٩، تێوەگلانی ئەمریكا لەنێو مەسەلە نێودەوڵەتیەكان، سەرنجی دەوڵەتی ((رۆزفلت))ی بۆ سیاسەتی دەرەوە راكێشا.

## بەشی نۆیەم:

### ئەمریکا لەنێو گێژاوی سیاسی و سەربازیدا

لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٣٠، پەرەسەندنی دەسەڵاتی فاشیزم لە ئەوروپا، دەستدرێژییەکانی ژاپۆن لەئاسیا، ئەمریکای خستە نێو بارودۆخێکی ئاڵۆزەوە. ئیتالیای فاشیست، سنووری ئیمپراتۆریەتەکەی تاوەکو لیبیا و ئەسیوپیا فراوانکرد. ئەڵمانیای هیتلەری بەداگیرکردنی ناوچەی راین، ئەمساو کۆنترۆڵکردنی سودت لەچیکۆسلۆڤاکیا، سێبەری شەڕەکەی خستە ناو خاکی ئەوروپاوە. بەو هێرشەی کردیە سەر چین و ژاپۆن، دەستی بەسەرناوچەی مەنچووریدا گرت و بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی دوورگەکانی ئۆقیانوسی ئارام، هێزەکانی خۆی پڕ چەك کرد.

بیروڕای گشتی خەڵکی ئەمریکا لەم بارودۆخەدا ئامادەی ڕووبەڕوو بوونەوە و ململانێ لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپی و کێشمەکێشمە سیاسیەکانی ئاوی نەبوو، بەشکست هێنانی سیاسەتی دەرەوەی ((ویلسۆن)) لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا، جەخت لەسەر سیاسەتی جوودایی خوازی و بێلایەنی لەکاروباری تایبەت بە ئەوروپا دەکرایەوە. بەڵام ئەمریکا نەیدەتوانی بۆسیاسەتی گۆشەگیری ساڵەکانی ڕابردوو بگەڕێتەوە. هێزی سەربازی ئابووری ئەمریکا لەکۆتایی هێنان بە جەنگی یەکەم، ئەو وڵاتەی خۆویستانە یان خۆنەویستانە بەرەو بەشداریکردن لەسیاسەتی جیهانی ئاراستە کرد.

قەرزی جۆربەجۆر و یارمەتیە مادیەکان، ئەمریکایان لەنێو مەسەلەکانی ئەوروپادا گیرۆدە کردبوو و بەناچاری دەبوو دەست لەسیاسەتی بێ لایەنی و کەنارگیری بشواتەوە و بچێتە ڕیزی وڵاتانی هاوپەیمانانەوە، ((کۆنفرانسی واشنگتۆن)) لەساڵی ١٩٢١ لەپێناو کەمکردنەوە و سنووردارکردنی هێزە دەریاییەکانی وڵاتانی ئەوروپا و ژاپۆن، ڕێککەوتن لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا ژاپۆن بەمەبەستی زەمانەت کردنی سەربەخۆیی چین، ڕێککەوتن نامەی گەرەنتی ئاشتی

نێو دەوڵەتی و خۆ دوورخستنەوە لەبەکارهێنانی هێز ـ کە بەڕێککەوتنی ((کلوگ ـ بریاند))ی نێوان وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکا و فەرەنسا ناسراوە ـ سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکای لەگەڵ چالاکیە نێو دەوڵەتیەکاندا هەماهەنگ کرد. بەڵام سیاسەتی گۆشەگیری لەئەمریکا تائەو کاتەش لایەنگرێکی زۆری هەبوو و لەساڵەکانی ۱۹۳۵ و ۱۹۳۷، سێ نوسراوی پەیوەندیدار بە مەسەلە جیهانیەکان لەکۆنگرەدا بڕیاریان لەسەر درا. ئامانج لەو نوسرا و بڕیارانە بەهێزکردنی شوێن پێی کۆنگرێس و لێ سەندنەوەی هەندێك لەدەسەڵاتەکانی سەرۆك کۆماری بوو. زۆرێك لەئەندامەکانی کۆنگرێس لایەنگری پاراستنی سیاسەتی بێ لایەنی بوون و ئەو سیاسەتەیان بەتەنها گەرەنتیەك بۆ ئازادی بازرگانی دەزانی، لەهەمان کاتیشدا دەستێوەردانی ئەمریکایان لەکاروباری ئەوروپادا، بەواتای لەسێدارەدانی ئازادی بازرگانی جیهانی کەئەمریکا وەك نەریتێکی هەمیشەیی بەشدار بوو تیایدا، لێك دەدایەوە.

فرانکلین ڕۆزفلت و وەزیری دەرەوە ((کوردل هال)) دژی بۆچوونی جوودایی خوازی بوون و لەپێناو پەرەپێدانی پەیوەندیە بازرگانیەکان، دەستێوەردانی ئەمریکایان لەنێو کاروباری ئەوروپادا بەپێویست و زەروور دەزانی. لەساڵی ۱۹۳۵ ((کوردل هال)) پێشنیازی تیجارەتی بەرامبەرکێی لەگەڵ شەش وڵاتی جیهانیدا خستەڕوو، دواتر بڕیاری پەسەندی لەسەر دراو بەپێی ئەو بڕیارە ئەمریکا ڕەزامەندی لەسەر ئەوە دەربڕی، کەلەمەودوا کەبەهیچ جۆرە گۆڕانکاریەکی ناوچەیی کەبەزۆر بەسەر وڵاتانی ئەوروپیدا بسەپێنرێت، ڕازی نەبێت.

ساڵی ۱۹۳۹ ئاگری شەڕ خاکی ئەوروپای هەژاند. داگیرکردنی فەرەنسا لەلایەن ئەڵمانیا، هێرشە سەربازیەکانی ئەڵمانیا بۆ سەر پۆڵەندا، دانیمارك، نەرویج، هۆڵەندا و بەلجیکا بۆمببارانی ئاسمانی ئینگلیز لەساڵی ۱۹٤۰، ئەمریکایان بەرەو خۆ هەڵقورتاندن لەکاروباری ئەوروپا پەلکێش کرد. چیتر کەس نەبوو کەبەرگری لەسیاسەتی بێ لایەن بکات. فراوانبوونی دەسەڵاتی ((نازیسم)) لەئەڵمانیا و پەرەسەندنی دەسەڵاتی ((میلیتاریزم)) لە ژاپۆن، ئەمریکای خستە نێو مەیدانی سیاسەتی جیهانیەوە. بڕیاری قەدەغەکردنی ناردنی چەك بەرەو وڵاتانی بەشەڕ هاتوو هەڵوەشایەوە، برگەی ((قەرز و کرێ)) بڕیاری لەسەر درا کەبەپێی ئەو بڕیارە ئەمریکا تەقەمەنی هێزەکانی ئینگلیز و وڵاتە هاوپەیمانەکانی دیکەی لەشێوەی قەرز یان کرێ دابین دەکرد. هێزە دەریایەکانی ئەمریکا خرانە حاڵەتی ئامادە باشیەوە، سەدان هەزار سەربازی دیکەش قۆناغی فێرکردنی سەربازیان تێپەڕاند، کارگە جۆراوجۆرەکانی بەرهەمهێنان، چالاکیەکانی خۆیان تایبەت کرد بەبەرهەمهێنانی چەك و تەقەمەنیەوە. هێزە سەربازیەکانی

ئەمریکا، ئایسلەند و گریلەندیان لەباکووری ئۆقیانوسی ئەتڵەسی داگیر کرد و بۆ پاریزگاریکردنی ئینگلیز ئامادەباشی خۆیان ڕاگەیاند. پاش هێرشەکەی ئەڵمانیا بۆ سەر رووسیا، ((ڕۆزفلت)) و ((چەرچل)) سەرۆك وەزیرانی ئینگلیز، لەمانگی ئاگۆستی ۱۹٤۱ لەئۆقیانوسی ئەتلەسی نزیك کەناراوەکانی نیوفوندلەند کۆبوونەوە و ڕاگەیاندنێکیان بەناوی ((گەلاڵەنامەمی ئاتلەنتیك)) دەرکرد کە تیایدا بنچینەی سیاسەتی هاوپەیمانانیان لەبەرامبەر دەست درێژکاریەکانی فاشیزمدا دەستنیشان کرد : ڕێگەگرتن لەپەرەسەندنی دەسەڵاتی سەربازی وولاتان، بەرەنگاربوونەوەی گۆڕینی سنووری ناوچەکان بەبێ ڕەزامەندی خەلکی ئەو ناوچانە، پاراستنی مافی تاکەکان لەدیاریکردنی جۆری حکومەتەکەیان، گەڕانەوەی مافی حکومڕانی و سەربەخۆیی بۆ ئەو وولاتانەی کە دەست درێژیان کرابوویە سەر، ئازادی هاتووچۆ لەنێو دەریاکان و هاوکاری ئابووری نێوان وولاتە جۆراوجۆرەکان، فەراهەمکردنی زەمینەی هاوکاری نێودەولەتی و دابینکردن و چەسپاندنی ئاشتی جیهانی، گرنگترین خاڵەکانی ئەو گەلاڵەنامەیە بوون.

بەشداریکردنی ئەمریکا لەشەڕ، بەو هێرشەی هێزە ئاسمانیەکانی ژاپۆن بۆ سەر بنکەیەکی سەربازی ئەمریکا بەناوی ((پرل هاربر)) لەهاوایی، لەڕۆژی ۷ی دیسەمبەری ۱۹٤۱، مسۆگەر کرا.

هێزەکانی ژاپۆن لەیەك کاتدا و لەچەند لایەکەوە هێرشیان کردە سەر دوورگەکانی میدوی، گوام و فیلیپین و زەرەرو زیانێکی زۆریان بە پێکە سەربازیەکانی ئەمریکا گەیاند. لەبەرامبەریشدا ویلاتە یەکگرتووەکان لەڕۆژی ۸ی سیپتەمبەردا شەڕی دژ بەژاپۆنی ڕاگەیاند و سێ ڕۆژ دوای ئەم ڕاگەیاندنە ئەڵمانیا و ئیتالیای یەکگرتوو و ژاپۆن بەرەیەکی بەهێزیان دژ بەئەمریکا دامەزراند و هاتنە مەیدانی جەنگەوە. گۆڕەپانی جەنگی یەکەمی جیهانی تاڕادەیەك دەتوانین بڵێین تەنها سنووری ئەورووپاو ئۆقیانوسی ئەتلەسی گرتبوویەوە، بەلام جەنگی دووەم سنووری هەموو کیشوەر و دەرکانی بەزاند و [سنووری جەنگەکەش تادەهات فراوانتر دەبوو]. سیاسەتی جەنگ بە پلەی یەکەم سەرنجی بۆلای بەرەی ئەورووپاوە چوو. پێکدادان لەئۆقیانوسی ئارام کەوتە قۆناغی دووەمەوە. لەم بارودۆخە دژوارەدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان ئامادەیی هێزە سەربازیەکانی بەمەبەستی ڕەوانە کردن بەرەو بەرە جۆربەجۆرەکانی جەنگ ڕاگەیاند. ڕۆڵی ئەمریکا لەجەنگەکەدا و پشتیوانی کردن لەهێزەکانی هاوپەیمانان دژ بە کردەوە داگیرکاریەکانی دەولەتانی بەرەی محوەر ((ئەڵمانیا ، ئیتالیا ، ژاپۆن)) لەڕادەبەدەر کاریگەر و تەنانەت هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنی هاوپەیمانان و تێکشکانی

بەتەواوەتی هێزەکانی ئەڵمانیای هیتلەری و هاوپەیمانەکانی بوو. پاش جێگیر بوونی هێزەکانی ئەمریکا لەبەرەی ئەفریقا، هێزەکانی متحدەین بەسەرکردایەتی جەنەراڵ ((روەمل)) ناچار بەپاشەکشێ کراو تاناوەڕاستەکانی ساڵی ١٩٤٣، باکوری ئەفریقا بەتەواوەتی لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە کۆنترۆڵ کرا. ئیتالیای فاشیست شکستی خوارد و مۆسۆلۆنی دانی بەدۆڕانەکەیدا نا. حکومەتە نوێکەی ئیتالیا پەیمانێکی ئاگر بەستی مۆر کرد و پەیوەندی کرد بەبەرەی هاوپەیمانانەوە. بەپێشڕەوی کردنی هێزە سەربازیەکانی ئەمریکا بەرەو کەنارەکانی نۆرماندی بەفەرماندەیی جەنەراڵ ((ئایزەنهاوەر)) سەرکردەی بەرەی هاوپەیمانان، ئەڵمانیاش چوونە نێو سەنگەری بەرگری کردنەوە، لەبەرەی ڕۆژئاوادا دەستی بەشەڕ کرد و بەناچاری چەند یەکەیەکی لە وولاتی ڕوسیاوە بانگهێشت کردەوە. هێرشە ئاسمانیە یەك لەدوایەکەکانی ئەمریکا و ئینگلیز و شارەکان و کارگەکان و بنکەکانی چەك و تەقەمەنی ئەڵمانیایان وێران کرد. سوپاکەی یەکیەتی سۆڤیەتیش لەبەر ئەوەی لەجەنگ لەگەڵ ئەڵمانیادا زەرەو زیانێکی گەورەی لێکەوتبوو، لەبەری ڕۆژهەڵاتدا دەستی بەشەڕ کرد و ئەڵمانیەکانی ناچار بەپاشەکشێ کرد. هێزەکانی ڕوسیا لەبولگاریا و ڕۆمانیا و مەجەڕ جێگیر کران و لەڕێگەی سەر سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیاوە پێشڕەویان کرد و خۆیان گەیاندە نزیك بەرلین. سوپای ئەمریکا و ئینگلیزیش پاش ڕزگاربوونی فەرەنسا لەژێر چنگی فاشیزمدا، بەرەو خاکی ئەڵمانیا کەوتنە ڕێ و پەلاماری پێگە و بنکە سەربازیەکانی هێزەکانی ئەڵمانیایاندا. لەمانگی مەی ١٩٤٥ پاش خۆکوشتنی هیتلەر، هێزەکانی ئەڵمانیا کە لەهەردوو بەرەکەدا لاواز و شکستیان خواردبوو، خۆیان بەیەکجاری تەسلیم بەهێزەکانی هاوپەیمانان کرد.

لەئۆقیانوسی ئارام، هێزە دەریایی و ئاسمانیەکانی ئەمریکا پاش چەندەها هێرشی چڕوپڕ و بەردەوام بۆ سەر بنکە سەربازیەکانی ژاپۆن، توانیان هێزەکانی ژاپۆن لە فیلیپین تێك بشکێنن و کۆتایی بەبەرگریکردنی ئەو وولاتە بهێنن. بەڵام وادەردەکەوت کە ژاپۆن هێشتا دەستی لەبەرگری هەڵنەگرتووە، لەمانگی ئاگۆستی ١٩٤٥، لەکاتی دەسەڵاتداریەتی ((ترومن))دا، ئەمریکا تاقیکردنەوەیەکی ناوەگکی بەئەنجام گەیاند و لەو پەلاماردانەدا بەبەکارهێنانی مووشەکی ئەتۆمی هەردوو شاری هیرۆشیما و ناکازاکی لەگەڵ خاکدا یەکسان کرد. ژاپۆنیش بەبێ هیچ جۆرە مەرجێك خۆی تەسلیم بەهێزە سەربازیەکانی ئەمریکا کرد.

ڕۆڵی ئەمریکا لەسەرکەوتنی هاوپەیمانان و شکانی هێزە سەربازی و فاشیستیەکاندا زۆر کاریگەر بوو. بەشداریکردنیشی لەجەنگ لەلایەکەوە بووە هۆی ڕزگاربوونی وولاتانی ئەوروپا و لەلایەکی تریشەوە ڕۆڵی ئەمریکای لەچەسپاندنی ئاشتی جیهانیدا ڕوون کردەوە.

کۆتایی هاتنی جەنگی دووەم سەرهەڵدانی دوو زلهێزی جهانی : ئەمریکا و یەکیەتی سۆڤیەتی لێ کەوتەوە. زیاتر لەیەك سەدە پێش ئەم ڕووداوە ((تۆکڤیل)) لەکاتی لێکۆڵینەوەی دیموکراسی لە ئەمریکادا پێشبینی کردبوو : ((ڕووسیا و ئەمریکا دوو میللەتن کەلەسەر دوو بنەمای جیاواز ڕاوەستاون، بەلام وادەردەکەوێ بەرەو ئامانجێکی هاوبەش هەنگاو دەنێت... ڕێگای جیاوازیان گرتۆتە بەر و بەرەو پێشەوە دەڕۆن، لەگەڵ ئەمەشدا وادەردەکەوێ کە ویستی غەیبی خوداوەند بەئاڕاستەیەك دەڕوات کە لەداهاتوودا هەریەك لەوانە چارەنوسی نیوەی جیهانیان لەژێر دەستدا بێت.)).

((ڕۆزفلت)) دانی بەڕاستیەکانی جیهانی پاش شەڕ دانا و لەپێناو بەرقەرارکردنی ئاشتیەکی یەکجارەکیدا هەوڵی دەدا، ئاشتیەك کە تەفاهومی یەکیەتی سۆڤیەتیش لەگەڵ دابێت و لەڕووی سیاسیەوە دەرفەتی هەڵبژاردنی حکومەتی خوازراو بەبێ بەکارهێنانی زوڵم و ستەمبۆ میللەتان دەستەبەر بکات، لەبواری ئابووریشدا بەمەبەستی خستنە بازاڕی بەروبوومی ناوخۆی وولات پارێزگاری تەواو لەبازاڕەکانی دەرەوەی وولات بکات. دەوڵەتی ((ڕۆزفلت)) لەهەموڵەکانیدا بۆ چەسپاندنی ئاشتی جیهانی، لەساڵی ۱۹۳۳بەرەسمی دانی بەحکومەتی یەکیەتی سۆڤیەت دانا. ئەو باوەڕی وابوو کەلەڕێگەی گفتوگۆکردنی دۆستانەوە دەتوانێت لەگەڵ سۆڤیەتدا دانوسان بکرێت و هاوکاری کردنی ستالینی بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی بەپێویست و زەروور دەزانی. بەپێچەوانەی ((چەرچل)) کەبەچاوێکی گومانا وی سەیری سیستەمی حکومڕانی ڕووسیای دەکرد و هەمیشە لەوەی هەر لەسەرەتاوە ((بلشویزمی))ی لەسێدارە نەداوە خۆی سەرزەنشت دەکرد. ((ڕۆزفلت)) زۆر بایەخی بەجیاوازی ئایدۆلۆجیەکان نەدەدا و پێی وابوو کەدەکرێت بەرژەوەندیەکانی وولاتە زلهێزەکان دانوسانیان لەسەر بکرێت و هاوکاری نێوان ئەو دوو زلهێزەی بەهۆکاری سەرەکی بەدیهێنانی ئاشتی جیهانی لەقەڵەم دەدا. جارێکیان زۆر بەڕاشکاوی بە چەرچلی ووت کە خوردی خۆی چاکتر لەهەموو دام و دەزگاکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و ئینگلیز دەتوانێت هاوکاری و سەرنجی ستالین ڕابکێشێت، ((ئەو بەتێڕوانینێکی ئیجابیانە مامەڵ لەگەڵ خوردی خۆمدا دەکات، ئومێدەوارم ئەم نیاز پاکیە هەر بەردەوام بێت.)) بەهۆی ئەو کۆنفرانسەوە جۆراوجۆرەکانی کە لەکاتی جەنگدا دەبەسران، وەك کۆنفرانسەکانی تاران و یالتا، گەورە

بەرپرسانی وڵاتانی پەیوەندیدار کۆبوونەوە و لەپێناو دیاریکردنی چارەنووسی جەنگ و دابینکردنی ئاشتیدا گفتوگۆیان کرد. ئەمریکا بەو پەڕی دڵنیایی متمانە بەدەسەڵاتی ئابووری و وڵاتەکەی و سەرکەوتنی لەجەنگی جیهانیدا، داوای بەدیهێنانی ئاشتیەکی سەرتاسەری لەسەر بنەمای لێك تێگەیشتن بەرامبەر کێی دەکرد. دامەزراندنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، دان نان بەمافی میللەتان بۆ هەڵبژاردنی ڕژێمی حکومەتەکەیان لەدرووستکردنی سیتەمی دراوی نێو دەوڵەتی و کێشانی وێنەی داهاتووی بازرگانی جیهانی، جێگای سەنج و بایەخی ویلایەت یەکگرتووەکان بوو. ڕووسیاش لەپێناو بەرپەرچ دانەوەی هە هێرشێکی چاوەڕوان نەکراو هەوڵی بەهێزکردنی سنوورەکانی ڕۆژئاوای وڵاتەکەی دەدا و بۆ ئەم مەبەستەش درووستکردنی ناوچەیەکی ژێر کۆنترۆڵی خۆی لەنیمچە دوورگەی بالکان بەپێویست دەزانی. ئەم بابەتانە لە ((کۆنفرانسی یالتا))ی نێوان ((ڕۆزفلت)) و ((ستالین))دا گفتوگۆیەکی تێروتەسەلیان لەسەر کراو هاوکاریکردنی ڕوسیاش لەبەرەی ئۆقیانوسی ئارامدا بۆ شکاندنی هێزەکانی ژاپۆن جەختی لەسەر کرایەوە.

سالی ۱۹٤٤ ((ڕۆزفلت)) بۆ جاری چوارەم لەلایەن حیزبی دیموکراتەوە کاندید کرایەوە. ((ڕۆزفلت)) لەیەکەم هەنگاویدا ((هێنری والاس))ی ـ کەپێشتر جێگری خۆی بوو ـ لەبەر بەرژەوەندی حیزبی لەسەر کار لابرد. ((والاس)) کەسێکی ئازادی خواز، واقیع بین و شارەزا بەسیاسەتی جیهانی بوو، گروپە محافەزەکارەکانی حیزبی دیموکرات زۆر کەمیفیان پێ نەدەهات و ((ڕۆزفلت)) بەمەبەستی بەدەستهێنانی پشتگیری ئەم باڵە بەهێزە ((هاری ترومن)) سیناتۆری میسیۆری بۆ پۆستی جێگری خۆی هەڵبژارد. ((ترومن)) دەست پەروەردەی حیزب لەمسیۆری و لەڕووی سیاسیشەوە محافەزەکارو بێ تەجرەبە بوو. بەمەرگی لەناکاوی لەناکاوی ((ڕۆزفلت)) لە ۱۲ی ئەپریلی ۱۹٦٥ واتە ماوەیەکی کورت پاش ((کۆنفرانسی یالتا))، ((ترومن)) شوێنەکەی گرتەوە و ئەمریکا یەکێك لەگەورەترین سەرکردە سیاسیەکانی خۆی لەدەستدا.

((فرانکلین ڕۆزفلت)) بەبەناوبانگترین سیاسەتمەداری ئەمریکا لەسەدەی بیستەم دەژمێررێت. ئەو کاتێك بو بەسەرۆك کۆمار، کەقەیرانی ئابووری بوون و «ناسنامەی» وڵاتی خستبووە مەترسیەوە و ڕەوشی سیاسی جیهانیش بەسەرهەڵدانی فاشیزم لەو پەڕی ئاڵۆزیدا بوو، بەڵام پێش ئەوەی ماڵئاوایی لەم دونیایە بکات، توانی ئابووری وڵاتەکەی بگەیەنێتە لووتکە و حکومەتەکەی وەك گەورەترین هێزی سیاسی بەجیهان بناسێنێت. ناوبراو بەتێگەیشتن لەڕاستیەکانی جیهان، هاوکاری نێوان دەوڵەتەکانی بەتەنها فاکتەرێك بۆ چەسپاندنی ئاشتی

هەژمار دەکرد. گلەیی و گازەندەیی لەو جۆرە کەگوایە ((ڕۆزفلت)) لەبەرامبەر کۆمۆنیزمدا توندوتیژی پێویستی بەکارنەدەهێنا و کەسایەتیەکی ئایدیالیزمی بوو، گریمانەیەکی بەتاڵە. کەسێکە وەك ((نیکسۆن)) کەهەمیشە بەناوی قارەمانی بەرەنگاربوونەوەی کۆمۆنیزم لەئەمریکا شانازی بەخۆیەوە دەکرد، دوای ماوەیەکی دوورو درێژ و پاش ئەزموونە تاڵەکەی ڤێتنام، ئەوجا گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە ئاشتی و ئارامی جیهانی بەهاوکاری و لێك تێگەشتنی وڵاتەکانەوە بەستراوەتەوە نەك جیهادی ئایدیۆلۆجی و جەنگ و ململانێ خوازی.

جەنگی دووەمی جیهانی، ئەمریکای بۆ هەمیشە لەسەنگەری سیاسەتی جوودایی خوازی هێنایە دەرەوە. ڕۆڵی ئەمریکا لەجەنگ و پشکی لەئاشتیدا، ئەو وڵاتەی لەمەفامی زنجیرێکی جیهانیدا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك ئەرك و لێپرسراویەتی نوێ کردەوە.

زنجیرەیەك ڕووداوی یەك لەدوایەك پاش جەنگی دووەم، ناکۆکیە سیاسی و عەقیدەیەکانی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتی توندتر کرد و بارودۆخێکی پڕ لەترس و گومان باڵی بەسەر جیهاندا کێشا، ئەو سەردەمەی کەلەساڵی ١٩٤٧ بەدواوە بەسەردەمی جەنگی سارد ناوبانگی دەرکردوو دەستی پێکرد. هەردوولا لەپێناو ئاشتی هەوڵیان دەدا، بەڵام پێشینەی مێژوویی، ڕێ و شوێنی سیاسی و، گۆڕانکاریەکانی ناوخۆی هەردوولا، بووە هۆی ئەوەی کەهەر یەکە ڕێگایەکی جیاواز بۆ گەشتن بەم ئامانجە بگرنە بەر. جیاوازی بیروباوەڕ، متمانەی سەردەمی شەڕی لەناو برد و بارودۆخێکی ڕەخساند کە دواتر بەجەنگی سارد کۆتایی هات.

ئەمریکا لەسەر ڕێڕەوی گۆڕانی مێژوویی وڵاتەکەی بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ جۆرە بەربەستێکی دەرەکی ببێتەوە و وەك هێزێکی گەورەی جیهانی لێهاتبوو. بنەما دیموکراتیەکانی دوور لەهەر جۆرە کێشە و گرفتێکی وڵاتانی ئەوروپی چەسپان و لەنێو ئەمریکیەکاندا باوەڕ بەبوونی چارەنوسی جوودا و جیاواز لەوڵاتانی دیکەی ڕەنگ ڕێژی کرد. لەگەڵ ئەوەش، بیرۆکەی گەورەیی ڕێ و ڕەسمی ئەمریکایی واتە سیستەمی سەرمایەداری، خاوەنداریەتی تایبەتی و دیموکراسی سیاسی بەهێزتر کرد. ئەم هەستی ڕابەرایەتی و خۆ بەگەورە زانینە، بەجێگیر بوونی کۆمۆنیزم لەڕووسیا، ڕووبەڕووی لاوازی گومان بوویەوە، ترسان لەتەشەنەکردنی کۆمۆنیزم، بیری لەدەستدانی بازارە جیهانیەکان و سنووردابوونی بازرگانی نێودەوڵەتی ئەمریکای لەگەڵ خۆیدا هێنا. لەدەیەی بیستدا بەرەنگاربوونەوەی هزری سۆسیالیستی لەڕادەبەدەر زیادی کرد و دان بەحکومەتە نوێیەکەی ڕووسیادا ـ تاساڵی ١٩٣٣ ـ نەنرا. ((ڕۆزفلت)) بەهەمەو توانایەکیەوە هەوڵی بەدەستهێنانی متمانەی ((ستالین)) و هاوکاری بەرامبەری لەپێناو چەسپاندنی ئاشتیدا دەدا. ناوبراو باوەڕێکی تەواوی بە دانانی یاسایەکی نوێی جیهانی هەبوو هەروەها بەباشی دەیزانی

که مرۆڤ لەکاتێکدا کەپێداویستیەکانی لەناوبردنی خۆی بەتەواوەتی دەستەبەر کردووە، جیهانیشی بەگوشراوی و بچووککراوەیی دروست کردووە. پاراستنی ئەم هاوسەنگیە مەترسیدارە پێویستی بەتێرامان و (وورد بوونەوەیەکی) نوێ لەهاوکاری نێو دەوڵەتیدا هەبوو. رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کەلەساڵی ١٩٤٥ دامەزرا، وەڵامدانەوەیەك بۆ پێویستی جیهانی بۆ دابینکرن و پاراستنی ئاشتی بوو، بەڵام بەتەنها بەس نەبوو و لێك تێگەیشتن و دانوسانی نێوان هەردوو دەسەڵات، بەگەرمتیەك بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دەژمێررا. جێگرەکەی ((رۆزفلت)) نە ئەو ئەزموون و شارەزاییەی هەبوو، نەلەگەڵ ئەم شێوازە نوێیەی کەپێویستی بەگەمە سیاسیەکان، گفتوگۆ، نەرم و نیانی و دانوسان هەیە، ئاشنایی هەبوو. ئەمریکا بەپشت بەستن بەسەرکەوتن لەجەنگ، ئابووری پێشکەوتوو و گەشەدار، هەبوونی چەکی ئەتۆمی داوای رابەرایەتی جیهان دەکرد. پاش مردنی ((رۆزفلت)) نێرراوی ((ترومن))، ((هاری هاپکینز)) بیری ستالینی خستەوە کە سیاسەتی رۆزفلت و بەشێوەیەکی گشتی ئەمریکا، لەسەر بنەمای ئاشتی یەکجارەکی لەگەڵ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا راوەستاوە و بەردەوام دەبێت.

((چەرچل)) کە پێشتر بەچاوێکی گومانەوە سەیری سیستەمی حکومرانی رووسیای دەکرد، باوەری وابوو کەتەشەنەکردنی دەسەڵاتی یەکیەتی سۆڤیەت لەئەورووپای رۆژهەڵات کۆتایی نایەت، هەر لەبەر ئەوە بۆچوونەکانی لەگەڵ ((ترومن))دا هەماهەنگیەکی زیاتری هەبوو. لەمانگی جولای ١٩٤٥ جارێکی دی بەرپرسانی ئەمریکا و روسیا و ئینگلیز لەپتسدام ـ نزیك بەرلین کۆبوونەوەیەکیان ساز کرد و پێکەوە بارودۆخی ئەوکاتی جیهانیان تاوتوێ کرد. ئەم دیدارەی نێوان ستالین و ترومن کە بۆ یەکەم جاربوو ئەنجام دەدرا، ماوەیەکی کەم پێش هێرشە ئەتۆمیەکەی ئەمریکا بۆ سەر شاری هێرۆشیما سازدرا و بەپشت بەستن بەم سەرکەوتنە سەربازی و پیشەسازیە، گفتوگۆکانیان دەست پێکرد و بەراشکاوی بە ((مولوتۆف))ی راگەیاند کەسیاسەتی خۆبەدەستەوەدانی رۆزفلت لەبەرامبەر ستالین ئیدی کۆتایی پێهاتووە.

((ترومن)) و راوێژکارەکانی کەچەرچلیشیان لەنێواندا بوو، سیاسەتی سەختگیری لەبەرامبەر رووسیەکانیان بەهۆکاری سەرەکی رێگە گرتن لەپەرەسەندنی کۆمۆنیزم دەزانی. پێشنیازی بەردەوامبوونی داگیرکاری سەربازی ئەڵمانیا و دادگایکردنی هاوکارانی هیتلەر بەتۆمەتی تاوانی جەنگی ،لەلایەن هەردوو دەسەڵاتەوە جەختی لەسەر کرایەوە، بەڵام رازی بوون بەدەست بەسەراگرتنی بالکان لەلایەن یەکیەتی سۆڤیەتەوە، کەلە ((کۆنفرانسی یالتا))دا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ رێك کەوتبوون لەسەری، لەگەڵ سیاسەتی نوێی ئەمریکادا نەدەگونجا. بەشێوەیەك کەیەکێك لەمێژوونوسانی ئەمریکی بەناوی ((ئالپرویتز)) لەکتێبی ((دیپلۆماسی ئەتۆم :

هێرۆشیما و پتسدام))دا دەنوسێت : ترومن وای دەزانی کەبوونی چەکی ئەتۆمی، یەکیەتی سۆڤیەت ناچار دەکات کەدان بەهەموو بۆچوون و داواکاریەکانی ئەمریکادا بنێت بۆ ئەوەی ناوچەکانی ژێرکاریگەری سوپای سوور چۆڵ بکات و لەدامەزراندنی حکومەتێکی ملکەچی مۆسکۆ لەئەوروپای ڕۆژهەلاَت چاوپۆشی بکات. بۆمبارنکردنی هێرۆشیما و بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی بە ووتەی ((ئاپرویتز)) تەنها لەبەر کۆتایی هێنان بەجەنگ لەئاسیاو خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆن نەبوو، بەلکو زیاتر بۆ دەرخستنی هێز و توانای سەربازی ئەمریکا بوو، سیاسەتی ((ترومن))یش بەپشت بەستن بەم هێز و دەسەلاَتە ناڕاستەیەکی توند و چەق بەستووتری دەرکرد. دەرئەنجامی وەها سیاسەتێك زیاتر بوونی گومانی ((ستالین))، پەرەسەندنی دەسەلاَتی یەکیەتی سۆڤیەت لەبالکان و دەستپێکردنی جەنگی سارد بوو.

((ستالین)) بەهەر جۆرێك بوو بەبەکارهێنانی دەسەلاَتی خۆی لەنێو لیوای حکومەتی پۆلیسیدا، دەسەلاَتی یەکیەتی سۆڤیەتی لەئەوروپای ڕۆژهەلاَتدا فراوانتر کرد ـ لەبەر داخرانی ڕێگاکانی گفتوگۆ ـ دەستی بۆ بەکارهێنانی سیاسەتی داگیرکاریانە زیاتر کرایەوە، کەسایەتیە پڕ لەگومان و متمانە پێنەکراوەکەی لەبەرامبەر فشاری ئەمریکا و دەرخستنی هێزە سەربازیەکەیدا، ئەوەندەی دیکە سەرسەخت و توندوتیژ تر دەبوو. ((ستالین)) چاك دەیزانی کەسەرکەوتنی ڕوسیا لەجەنگ، لەئەنجامی پشتیوانی و دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی دونیای سەرمایەداریەوە هاتبوویە ئاراوە، ئەگینا ((دیکتاتۆری پرۆلیتاریا)) بەدەستی فاشیزمەوە لەسێدارە درابوو. بەلاَم واقیعیەتی جیهانی پاش جەنگ ڕازی بەسەروەری و گەورەیی ڕۆژئاوا نەدەبوو، بەلکو داوای دانوسان و تەبایی دەکرد تاوەکو ئاشتی جیهانی سەقامگیر بکرێت.

جەنگی سارد لەسەردەمی دەمارگیری، چەق بەستوویی و دەربڕینی بیروڕا ووشك و بەردین بوو. ململانێی نێوان هەردوو سیستەمی کەپیتالیزم و کۆمۆنیزم، کێبڕکێ و پێشبڕکێ لەپێناو پەرەپێدانی هێز و دەسەلاَت لەجیهان، لەنێوان ئەمریکا و یەکیەتی سۆڤیەتدا دەستی پێکرد. لەنێو هەراو هوریای ئەم جەنگە خاچپەرستیە نوێیەدا، سیاسەتمەداری ئەمریکا هەرگیز باوەڕی نەدەکرد کە یەکیەتی سۆڤیەت ڕابەری ڕەهای دونیای کۆمۆنیزم نەبێت و یان جیاوازی بیروڕا لەنێوان وولاَتە کۆمۆنیستەکاندا سەر هەلبدات. بۆچوونی پەسەندکراو تاتەم دواییەش، جەنگی ساردی بەپەرچە کردارێکی شەهادەتەندانەی دونیای ئازاد لەبەرامبەر دەست درێژی کۆمۆنیزم لەقەلەم دەدا، هەرچەندە دەستەواژەی ((جیهانی ئازاد)) کەبەوولاَتانی دەرەوەی بازنەی دەسەلاَتی کۆمۆنیزمی دەوترا، ئعتبارێکی ئەوتۆشی نەبوو، بەلاَم ناتوانرێت ڕژێمی فرانکۆی ئیسپانیا بەحکومەتێکی دیموکراتیك و ئازاد دابنرێت، کەچی هەمان ئەندازە کە وولاَتانی لەو جۆرە

پەیوەندییەکی دۆستانەیان لەگەڵ ڕۆژئاوادا هەبوو، حکومەتەکەیان ـ بەو هەموو ئاڵۆزی و گێژاوەی کە ڕووبەڕووی ناوخۆی وڵاتەکەیان بووبوویەوە ـ لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەمریکادا هەماهەنگ بوون و دژی کۆمۆنیزم دەوەستانەوە، لەریزی وڵاتانی ئازاددا هەژمار دەکران. جەنگی سارد تەنها ڕووبەڕووبوونەوەی دوو زلهێز نەبوو، بەڵکو کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆشی لەسەر چارەنوسی هەندێك لەوولاتان هەبوو هەروەها گۆڕانی بەسەر ڕێڕەوی سیاسیاندا هێنا.

((چەرچل))لە ووتارە بەناوبانگەکەی خۆیدا لە ((فۆلتۆن))ی میسیۆری و بە ئامادەبوونی ترومن ڕایگەیاند، کە ((پەردەی ئاسنین)) بەزوترین کات لەئەوروپادا دێتە خوارەوە : ((هیچ کەس نازانێت کەڕووسیا و هاوکارەکانی چ پلان و پێشنیازێکیان بۆ داهاتوو هەیە و چ سنوور و ئەندازەیەك بۆ سیاسەتی فراوانخوازی و تەشەنەکردنی خۆیان دادەنێن.)) بەڵام دواتر زنجیرەیەك ڕووداوی پاش جەنگ سیاسەتی دەست درێژیکارانەی ستالینی ئاشکرا کرد.

هێزە سەربازیەکانی یەکیەتی سۆڤیەت، بەپێچەوانەی پەیمانە نێو دەوڵەتیەکان، پاش کۆتایی هاتنی جەنگ بەهیچ شێوەیەك خاکی ئێرانیان بەجێ نەهێشت و لە ئازەربایجان ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی ئەڵقە لەگوێی مۆسکۆ خستە گەڕ. دەوڵەتی ئێران سکاڵای خۆی بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی بەرز کردەوە و دواجار بەهۆی کاریگەری بیروڕای جیهانی، هێزەکانی ڕووس ناچار بەچۆڵکردنی خاکی ئێران کران. ڕووسیەکان خۆیان لەهەموو جۆرە هاوکاریکردنێکی وڵاتانی ڕۆژئاوا بەدوور دەگرت، کەئەمەش پێچەوانەی ڕێککەوتنە نێو دەوڵەتیەکان بوو، هەروەها بەئەندامبوون لەبانکی جیهانییان ڕەت کردەوە و خۆیان لەگەڕاندنەوەی ئەو قەرزە یەك بیلیۆن دۆلاریەی کە ساڵی پێشتر ((مۆلۆتۆف)) وەزیری دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت لە ئەمریکای داوا کردبوو دزیەوە. فشارێکی زۆریان بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی ڕێگا ئاویەکانی بسفۆڕ و دەردەنێل خستە سەر وڵاتی تورکیا، جگە لەمانەش ڕازی بەچوونە ناو ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کۆنترۆڵکردنی چەکە ئەتۆمیەکان نەبوون. بڕیاری دواهەمینیان بەهۆی بێ متمانەیی و ترسانیان لە ڕۆژئاوابوو. ((ستالین)) کەسەرچاوەی بەد گومانیەکە بوو، ئەم پێشنیازەی بۆ پلانی ڕۆژئاوا بۆ دەست بەسەرداگرتنی جیهان دەگەڕاندەوە.

لەم لاشەوە ((ترومن)) لەساڵی ١٩٤٧ بەمەبەستی پتەوکردنی هێزی سەربازی وڵاتەکەی، قۆڵی لێ هەڵماڵی. تێکڕای یەکەکانی هێزی سەربازی چ زەمینی و دەریایی و ئاسمانی لەنێو وەزارەتی بەرگری ((پنتاگۆن))دا جێگیر کرد، ئەنجوومەنی ڕاوێژکارانی ئاسایشی نەتەوەیی دامەزراند کە ڕاستەوخۆ لەژێر چاودێری سەرۆك کۆماردا بەڕێوە بچێت، دەزگای سیخوڕی ((سی ئای ئەی)) درووست کرد، هەموو ئەم دامەزراوانە لەماوەیەکی کەمدا پاش مردنی ((ڕۆزفلت))

بەمەبەستی پشتیوانیکردن لەسیاسەتێکی دیاریکراوی دەرەکی ـ کە بەجەنگی سارد ناوبانگی دەرکرد ـ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی یەکیەتی سۆڤیەت هاتنە ئاراوە. هاوکارەکانی پێشووی ڕۆزفلت و سیاسەتمەدارانی ((پێشنیازی نوێ)) کەبەکارهێنانی شێوازی شەڕخوازی و بەرەنگاربوونەوەیان پێ باش نەبوو، بەیەکجاری لەسەر کار لابران. ((هێزی والاس)) جێگری سەرۆک کۆماری سەردەمی ڕۆزفلت و وەزیری بازرگانی ((ترومن)) ئەم ڕێ و شوێنە نوێیەیان پەسەند نەدەکرد. لەساڵی ١٩٤٦ لەووتارێکدا، مەسەلەی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتە زلهێزەکانی وورووژاند و ئەمریکای بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم گۆڕانکاریانە بەچاوێکی واقیع بینانە بانگهێشت کرد : ((بەشێکی گەورەی گرفتی ئێمە لەگەڵ ڕووسیا، گرفتی ئاسایی ڕووبەڕووبوونەوەی هەردوو دەسەلاتە)) کە لەڕێگەی دووربینی و واقیع بینی دەتوانرێت پشت ڕاست بکرێتەوە ((ئێمە پێویستە دان بەوەدا بنێین کە مەسەلەکانی وولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات هیچ پەیوەندیەکی بەئێمەوە نیە، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ڕووسیاش بزانێت کە لەکاروبارەکانی ئەمریکای لاتینیدا نابێت دەست وەربدات.))

هەر لەساڵی ١٩٤٧ ((ترومن)) پێشنیازێکی دیکەی لەمەڕ پێشکەشکردنی یارمەتی دارایی و سەربازی بەوولاتانی یۆنان و تورکیا خستە بەردەم کۆنگرێس و بەهۆی جەخت کردنەوەی سیناتۆر ((واندنبرگ))، لەکۆماریخوازە دەسەلاتدارەکانی نێو کۆنگرێس، کە مەترسی کۆمۆنیزمی بەگەورەترین مەترسی وەسف کرد، ڕەزامەندی کۆنگرەی بەتەرخانکردنی بڕی چوارسەد ملیۆن دۆلار لەقۆناغی یەکەمدا بەدەست هێنا. لەم پێشنیازەدا ((ترومن)) ڕایگەیاند کە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەسەر پێشوازیکردنی خەلکی جیهانی ئازاد ڕاوەستاوە، کەنایانەوێ لەبەرامبەر زوڵم و ستەمی دەسەلاتی کۆمۆنیزمدا ملیان کەچ بکەن. ((بنەمای ترومن)) دوو ئامانجی هەبوو: بەهێزکردنی هێزی سەربازی و درووست کردنی چەکی نوێ بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا ڕێگە لەپەرەسەندنی دەسەلاتی کۆمۆنیزم بگیرێت و، دەستەبەرکردنی بارودۆخ و ژینگەیەکی لەبارو خۆشگوزەران و چاککردنی باری دارایی کۆمەلکە هەژارەکان ـ لەڕێگەی یارمەتی مادی ـ بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵگانە بتوانن و وورده وورده خۆیان لەبەرامبەر نفوزی بیروبۆچوونی کۆمۆنیستیدا ڕابگرن و ببنە [سەنگەرێك] کەبەرگری لەبنەماکانی جیهانی ئازاد بکەن. خستنە ڕووی پێشنیازەکەی ((مارشال)) وەزیری دەرەوە بۆ یارمەتیدانی ئەورووپای گۆڕەپانی شەڕ، لەبواری چاککردنی ژیانی ئابووریدا سەرکەوتنێکی گەورەی بۆ ئەمریکا دەستەبەر کرد. بەپێی ئەو پێشنیازە، پارە و کالا و ئامێری پێویست دەخرایە بەردەم وولاتانی ئەورووپی، تەنانەت ئەورووپای ڕۆژهەلاتیش دەیتوانی سوود لەم پێشنیازەی مارشاڵ وەربگرێت، بەلام لەبەر

نارەزایی ((ستالین)) پێشوازیەکی ئەوتۆی لێنەکرا.لەساڵی ١٩٤٨ بەرلین لەلایەن سۆڤیەتەوە گەمارۆ درا و ئەڵمانیای رۆژئاوا و بەرلین لێك دابران و هاتووچۆی نێوانیان راگیرا. بەڵام ئەمریکا لەرێگای ئاسمانیەوە خۆراك و کەلوپەلی پێویستی گەیاندە شارەکە. پێشنیازی پەیمانی ئاتلەنتیکی باکوور (ناتۆ) لەساڵی ١٩٤٩ بۆ رێگەگرتن لەهێرشی سەربازی یەکیەتی سۆڤیەت بۆ سەر ئەوروپای رۆژئاوا شێوازێکی دیاریکراوی بەخۆوە گرت. ئەمریکا بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی پەرەسەندنی کۆمۆنیزم لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپای رۆژئاوا بوو بەهاوپەیمان. ئەمە یەکەمین جاربوو کە ئەمریکا بۆ ماوەیەکی دووردرێژ لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپی پەیمانی سەربازی ببەستێت. پێش ئەو رووداوە تەنها تەکجار لەساڵی ١٧٧٨ لەسەردەمی سەربەخۆیدا لەگەڵ فەرەنسادا پەیمانی سەربازی مۆرکردبوو، کەماوەیەکی کەمی خایاند و لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی فەرەنسیدا هەڵوەشایەوە.

رێگەگرتن لەپەرەسەندنی کۆمۆنیزم، بوو بەبابەتی سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەم سەردەمەدا. بۆ یەکەمین جار لەمێژووی ئەمریکا ـ بەرگریکردن لەجیهانی ئازاد ـ کۆمەڵێك رێکەوتنی سەربازی قورس و گرانی لەسەردەمی ئاشتیدا بەسەر ئەمریکادا سەپاند، داواکاریەك لەدوای یەکەکانی کەرەستەی جەنگی، ژمارەیەکی زۆر لەکارگەکانی ئەمریکای خستە کار، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا سەرچاوەیەکی سەرەکی کۆکردنەوەی سەروەت و سامان بۆ سەرمایەدارەکان بوو. ئەمە دەسپێکی سیاسەتێك بوو، رووبەڕووبونەوەی کۆمۆنیزم ، ئەمریکای زهێزی خستە نێو گێژاوێکی سیاسی و سەربازی درێژخایەنەوە، کە تاجەنگی ڤێتنام و ساڵەکانی حەفتاش درێژەی کێشا.

شکستی ژاپۆن لەئاسیا و شەڕی ناوخۆی چین خاڵێکی نوێی ململانێ و ناکۆکی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەت بوو لەکیشوەری ئاسیادا. خۆ بەدەستەوەدانی بێ کۆت و بەندی ژاپۆن بەهێزەکانی ئەمریکا ـ لەساڵی ١٩٤٥ـ هاتنە سەرکاری ((مەك ئاتور))ی ژاپۆن بەدواوادا هات. مەبەستی ئەمریکا سنووردار کردنی هێزی سەربازی ژاپۆن، بەهێزکردنی بونیادی دارایی و زیادکرنی رەونەقی ئابووری و، لەپەرەپێدانی دیموکراسی و حکومەتی پارلەمانی بوو. ((مەك ئارتوەر)) لەم بارەیەوە رێ و شوێنێکی عاقلانەی گرتەبەر. ئابووری ژاپۆن وەك ئەڵمانیا، لەرێگەی یارمەتیە داراییەکانی ئەمریکاوە بەرەو پێشکەوتن و پەرەسەندن هەنگاوی نا، کەئەمەش کاریگەریەکی زۆری لەسەر سەقامگیری باری ئابووری رۆژئاوا و جیهانی سەرمایەداری هەبوو. چین بەدەست جەنگی ناوخۆوە دەیناڵاند، هەرچەندە ئەمریکا داوای دامەزراندنی حکومەتی چیانکایچك و هێزی میلیۆنی لەو وڵاتە دەکرد، بەڵام پێشنیازەکەی مارشال لەپێناو چاککردنی

باری ئابووری چین بەھەموو شێوەیەك ڕەت کرایەوە. ڕووسیا و ئەمریکا ھەردوکیان سەرنجیان بۆ لای ئەورووپا دەچوو و لەئەنجامدا پێشڕەومیکردنی کۆمۆنیستەکان لەچین زیاتر پەیوەندی بەباروودۆخی ناوخۆی وولآت و گۆڕانکاریە سیاسیەکانەوە پەیدا کرد، تاوەکو پشتیوانیکردنی یەکیەتی سۆڤیەت، کە لەڕاستیدا ھیچ کاریگەریەکی لەسەر گۆڕانی باروودۆخەکە نەبوو. (دین ئاچسن) وەزیری دەرەوەی سەردەمی ((ترومن)) پاش سەرکەوتنی ((مائو)) لەساڵی ١٩٤٩ ڕوونی کردەوە، کەئەم سەرکەوتنە لەئەنجامی گۆڕانکاریەکانی ناوخۆی ((چین))ەوە ھاتوەتە ئاراوە و تەنانەت دەستتێوەردانی ئەمریکاش نەیدەتوانی ڕێگای لێبگرێت. ھەر لەم ماوەیەدا یەکیەتی سۆڤیەت یەکەمین بۆمبی ئەتۆمی خۆی تاقیکردەوە و دەنگۆیەك بڵاوبوویەوە کە گوایە [چەند کەسێك]یان ھۆکارێك لەئەمریکا یارمەتی ڕووسیایان بۆ گەیشتن بەم سەرکەوتنە داوە. ژن و مێردێك بەناوی ((ڕوزنبرگ)) تۆمەتەکەیان خرایە پاڵ و لەسێدارە دران. ھەرچەندە بەتەواوەتی ڕوون نەبوویەوە کەئەم دووانە بەڕاستی کارەکەیان ئەنجام دابێت.

ئەم ڕووداوانە کاریگەریەکی زۆریان لەسەر بیروڕای گشتی ھەبوو، ناڕەزایەکانی دژ بەکۆمۆنیزم زیادی کرد و ترس و بیم کۆمەڵگەی ئەمریکای داپۆشی، شەبەحی گۆمۆنیزم وەك کراسەکەی حەزرەتی (عسمان (ر.ج)ی لێھات و گروپە جۆراوجۆرەکان وەك سەرچاوەیەك بۆ ھێنانەدی بەرژەوەندیەکانیان بەکاریان ھێنا. لاوێکی ئەندام لەنێو کۆنگرە کەبەدوای نازناوێك بۆ خۆی دەگەڕا، بەناوی ((ڕیچارد نیکسۆن)) وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکای بەتۆمەتی کارکردن و لایەنگیری کۆمۆنیزم تاوانبار کرد و بەمەشەوە نەوەستا تەنانەت ((الجرھیس))ی ـ کەیەکێك بوو لەیاریدەدەرانی ((دین ئاچسن)) ـ بە تۆمەتی سیخوری کردن بۆ ڕوسیا ھێنایە بەردەم دادگای وولآت و. سناتۆرێك بەناوی ((جۆزێف مەك کارتی)) کە لەپێشوی ئانەوەدا زۆر بلیمەت بوو، بنەمای سیاسەتەکەی لەسەر بنچینەی ترسان لە کۆمۆنیزم دانا، مەترسی لەناوچوونی وڵاتی ھێنایە نێو قسە و باسان و خەڵکی بەبێ ھیچ بەڵگەو نیشانەیەك بەچالاکی کۆمۆنیستی تاوانبار دەکرد، دام و دەزگاکانی دەوڵەتی بەلانکەی کۆمۆنیزم ناو دەبرد. ((مەك کارتی)) بەو پشتیوانیەی کە لەلایەن گروپە جیاوازەکانەوە لێی دەکرا، ڕۆژبەڕۆژ چاونەترس و نازاتر دەبوو. ئەو کۆچبەرانەی کە تازە دەھاتن و یان ئەو کرێکارانەی کەلەم ڕێگەیەوە دەیانویست نیشتیمانپەروەری خۆیان بسەلمێنن، سیاسەتمەدارانی محافزەکار و، ئەنجوومەنە نەژادپەرستیەکانی وەك ((جۆن بیرچ))، ھەموو ئەو تاك و گروپانە بوون کە پشتیوانیان لەم سیناتۆرە ھەل قۆزەر و جەنجاڵیە دەکرد، کە بەمەسەلەی کراسەکەی عوسمان لێکردنی شەبەحی کۆمۆنیزم ھەوڵی لەناوبردنی ئازادیەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکای دەدا.

((مەك كارتیزم))، واتە ئەو شێوازە ڕاست گەراییەی کە سیناتۆر ((مەك كارتی)) بەهات و هاوار بەرپێی کرد، لەڕاستیدا تۆڵەیەك بوو کە لەلیبرالیزمی سەردەمی ((ڕۆزفلت)) سەنرایەوە. ژمارەیەکی زۆر لەڕووناك بیران خرانە نێو ((لیستی ڕەش))ەوە، ژمارەیەکی تر لەسەر کار لابران و هەندێکیش خرانە نێو گرتووخانەکان و هونەرمەندانێکی وەك ((چارلی چاپلین))، نوسەرانێکی وەك ((ئارتور میلەر))، دەرهێنەرانێکی وەك ((جۆزێف لوسی)) بەتۆمەتی کار و چالاکی بۆ کۆمۆنیزم تاونبار کران. حیزبی دیموکراتیش تۆمەتی خیانەتی لەوولات خرایە پاڵ و ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیست ناچار بەناو نوسین لەدادگادا کران. تۆمەتی بێ بنەما ، غەرەزی شەخسی، لەگەڵ بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن کەسانی نامەسئولەوە ڕێگا خۆشکەر بوون بۆ ئەوەی ((مەك کارتی)) بۆ ماوەیەك دەسەڵات بەسەر بارودۆخەکەدا بسەپێنێت. ئەشارەزایی ((مەك کارتی)) زیاتر لەوەڵامدانەوە سادە و ساکارەکانیدا ڕەنگی دەدایەوە : چین بوو بەکۆمۆنیست چونکە ((خائینەکانی)) وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا وایان دەویست، یەکیەتی سۆڤیەت بوو بەخاوەنی بۆمبی ئەتۆمی، چونکە سیخورەکانی ئەمریکا یارمەتیان دان و ئەمریکیە کۆمۆنیستیەکانیش پلانێکی نێودەوڵەتیان بۆ لەناوبردنی کۆمەڵگەی ئەمریکی دارشت. لەکۆتایدا ڕایگەیاند کەهەرکەس دان بە مەنتیقی بوونی بۆ چوونەکانیدا نەنێت، دژی ئەمریکا و دوژمنی مرۆڤایەتیە. لەو جۆرە کەسانەی کەزۆر بەجورئەت و ئازایانە ڕەخنەیان لە ((کارتی)) و شێوازە نامرۆڤانەکەی گرت، هەردوو سیناتۆری ئەمریکی ((فۆلبرایت)) و ((مارگارێت چیس ئسمیت)) بوون، بەڵام بەگشتی کۆمەڵگەی ڕاست گەرایی پاش جەنگ ئامادەیی قبولکردنی کەسانێکی وەك ((مەك کارتی)) تێدابوو. کۆمیتەی چالاکیەکانی ((دژە ئەمریکایی)) لەسنا، کرا بەناوەندی فەرماندەیی ((مەك کارتی)) و بەبێ گوێ دانە یاسا، بەبێ هیچ جۆرە پاساو و بەڵگەیەك خەڵکی تاوانبار دەکرد و دەیخستە زیندانەوە و دواتر ڕەوانەی گۆڕستانی دەکرد. ((مەك کارتیزم)) کاریگەریەکی زۆری لەسەر سیاسەتی دەرەوەی کۆمەڵگەی ئەمریکی هەبوو. دادگای باڵا یاسایەکی کەبەهۆیەوە هەرکەس بیەوێت چالاکی شۆڕشگێڕانە ئەنجام بدات دەبێت سزا بدرێت، پەسەند کرد. گۆڕانکاری لەمەرجەکانی کۆچکردن بەرەو ئەمریکا کراو کۆمۆنیستەکان لەو مافە بێ بەش کران، بڵاوکردنەوەی بەرهەمی زۆرێك لەو نوسەرانەی کەبۆچوونێکی چەپیان هەبوو قەدەغەکرا.

بەڵام ((مەك کارتی)) بەو هەموو دەنگ و هەرایەی کە نایەوە، نەیتوانی خۆی وەك یەکەمین هیتلەری ئەمریکا بنوێنێت. چونکە دامەزراوەی سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی ئەمریکا هێشتا بنەما و نەریتە ئازادیخوازەکانی خۆی نەدۆڕاند بوو ـ ئەو نەریتانەی کە ڕێگایان بەکەسانێکی وەك ((مەك کارتی)) بۆ سنووردار کردنی ئازادیە تاکەکسیەکان و سەروەری سیاسی نەدەدا. ((مەك

کارتیزم)) بەو خێراییەی کەسەری هەڵدا بەهەمان شێوەش توایەوە. لەساڵی ١٩٥٤ کاتێك کەداوا کاریەکەی ((مەك کارتی)) بۆ دامەزراندنی یەکێك لەهاوکارەکانی لەڕیزەکانی سوپای ئەمریکادا ڕەت کرایەوە، ناوبراو وەك نەریتی هەمیشەیی خۆی دەستی بەهات و هاوار کرد، سوپای ئەمریکای بەو تۆمەتەی کەخستیە پاڵ حیزبی دیموکرات تاوانبار کرد. بەڵام ئەجارە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بەخستنە ڕووی چەند بەڵگەنامەیەك نهێنیەکانی ئاشکرا کرد، کەسایەتیە بەرژەوەندی خوازیەکەی بۆ هەموان دەرخست. چەند مانگ دوای ئەو ڕووداوە سنای ئەمریکا بە زۆرینەی دەنگ بەتاوانی بێ ڕێزی کردن بەرامبەر پلە و پایەی سنا بڕیاری دەستگیر کردنی ناوبراوی دەرکرد دوای سێ ساڵ لەو پەڕی نائومێدی و پەرێشانیدا سەری نایەوە. دیوانی باڵا بەدانانان بەیاساکانی لیبراڵ لەناوەڕاستەکانی دەیەی پەنجا، فەرمان بەتێکەڵکردنی نەژادی لە قوتابخانەکان ، هەڵوەشاندنەوەی سزادانی چوارده گیراوی کۆمۆنیست، وەك دەسەڵاتێکی یاسایی بەرێز و سەربەخۆ مایەوە. لەساڵی ١٩٥٢ حیزبی دیموکرات سناتۆر ((ئادلای ئستیۆنسۆن))ی ـ کەلەسەرمایەدارە لیبراڵەکان و درێژەپێدانی قوتابخانەی ڕۆزفڵت بوو ـ بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری کاندید کرد، بەڵام لە هەڵبژاردنەکاندا بەرامبەر بەرکابەرە کۆماریخوازەکەی واتە ((ئایزەنهاوەر)) شکستی خوارد. ((ئایزەنهاوەر)) کەسێکی نەرم و نیان و میانەڕەو بوو، بەڵام دەتوانرێت دەستنیشانکردنی ((جۆن فاستر دالس)) بۆ پۆستی وەزیری دەرەوە بەیەکێك لەهەڵەکانی ناوبراو دابنرێت، چونکە بەهەڵبژاردنی ((دالس)) دژایەتی و بەرەنگاربوونەوەی کۆمۆنیزم چڕ و توند تر کرایەوە و وەك جیهادێکی پیرۆزی نێوان فریشتە و ئەهریمەنی لێهات.

لە ١٩٥٠ قەیرانێکی سیاسی لەنیمچە دوورگەی کۆریا سەری هەڵدا کە بەخێرایی شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەربازی گەورەی بە خۆوە گرت. نیمە دوورگەی کۆریا حکومەتێکی دەست نیشاندەری چین بوو، لەساڵی ١٩١٠ بەدواوە یەکێك بوو لەداگیرگەکانی ژاپۆن. پاش جەنگی دووەمی جیهانی ، کۆریا بۆ دوو ناوچەی ژێردەسەڵاتی ڕووسیا و ئەمریکا دابەشکرا، بۆ ئەوەی دواتر بە هەڵبژاردنی ئازاد یەکیەتی هەردوو ناوچەکە دەستەبەر بکرێت. بەڵام بەو شێوەیەی لێ ئەهات و بارودۆخ و پشێوی جیهانی پاش جەنگ، پێویستی بە پراکتیککردنی وەها بەڵێنێك نەدەکرد. حکومەتەکانی ئەلقە لەگوێی ڕووسیا و ئەمریکا لەنیمچە دوورگەی کۆریادا بەرەسمی ڕاگەیەنران. لەساڵی ١٩٥٠ بەهۆی ئەو دەست درێژیەی کە لەلایەن هێزە سەربازیەکانی کۆریای باکوورەوە کرایە سەر کۆریای باشوور، ویلایەت یەکگرتووەکان لەژێر چاودێری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هێزەکانی خۆی بۆ پشتیوانیکردن لەکۆریای باشوور خستە حاڵەتی ئامادە باشیەوە. ((مەك ئارتور)) فەرماندەی هێزە سەربازیەکانی ئەمریکا لەئاسیای ڕۆژهەڵات، باوەڕی

وابوو کەپێویستە بەبەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی، ئەنجامی جەنگەکە ئەکلایی بکرێتەوە، بەلاّم ((ترومن)) داوای جەنگێکی سنوورداری دەکرد لەگەلّ کۆریادا. ئەمەش وای لە ((ئارتور)) کرد کە دژایەتی خۆی بۆ پێشنیازەکەی سەرۆك ڕابگەیەنێت و بەتوندی ڕەخنە لەسیاسەتی وولاّتەکەی بگرێت، لەبەرامبەریشدا حکومەتی ئەمریکا هەستا بەبانگهێشت کردنەوەی ((ئارتور)) و کۆتایی بە ئیقتیداری سەربازی ناوبراو هێنا. ئەم هەلّوێستەی ترومن لەسەردەمی گەیشتنە لووتکەی دەسەلاّتی ((مەك کارتیزم))دا - دژ بەسەربازەکان - هەنگاوێکی بەجەرگانە بوو، هەرچەندە ناڕەزایی نەیارانی حیزبی دیموکراتی لێکەوتەوە و ئەوانیان بە تۆمەتی هاوکاریکردن لەگەلّ کۆمۆنیزم تاوانبار کرد. بەهەر حالّ ((ترومن)) و ((دین ئاچسن)) وەزیری دەرەوە و ڕاوێژکارە سیاسیەکانی توانیان پارێزگاری لەسنووردار بوونی جەنگەکە بکەن، بەلاّم لەهەلّبژاردنەکانی سالّی١٩٥٢دا حیزبی دیموکرات نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنن و جلەوی دەسەلاّتی بۆ کۆماریخوازەکان چۆلّ کرد. ((ئایزنهاوەر)) فەرماندەی سەربازی ئەمریکا لەجەنگی دووەمی جیهانی و پالّەوانی سەرکەوتنی بەرەی هاوپەیمانان پۆستی سەرۆك کۆماری بەدەست هێنا، جەنگی کۆریا لە ١٩٥٣ کۆتایی پێهات و سنووری ناوچەکانی باکوور و باشوور ، بەپێی هێلّی ٣٨ پلە دیاری کران.

جەنگی کۆریا گۆڕانێکی نوێبوو لەسیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا. ئەمریکا نەتەنها خۆی لەنێو کاروبارەکانی تایبەت بە ئەورووپادا هەلّقورتاند، بەلّکو چەندەها ڕێککەوتنی نوێی لەئاسیا و ئۆقیانوسی ئارامدا مۆرکرد. لەگەلّ دەست بەکاربوونی وەزارەتەکەی ((دالس)) قۆناغێکی نوێی جەنگی سارد دەستی پێکرد و ئەمریکا بەلّێنەکانی خۆی لە ڕووبەڕووبوونەوەی جیهانی ئازاد و کۆمۆنیزمدا فراوانتر کرد. ((دالس)) دانی بەدەولّەت نوێکەی چیندا نەناو دژی بەئەندامبوونی ئەو وولاّتە لەنێو ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان وەستایەوە، حکومەتی ((چایکانچك)) لەدوورگەی تایوانی بەتەنها نوێنەرێکی ڕەسمی میللەتی چین ناوزەد کرد. بەمردنی ((ستالین)) لەسالّی ١٩٥٣ و دەست پێشخەری وولاّتی چین بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندیەکانی لەگەلّ ئەمریکا، ئەو بارودۆخەی کە لەئەنجامی جەنگی ساردەوە هاتبویە ئاراوە، گۆڕانی بەسەردا هات. بەدەرکەوتنی هەندێك لەسەرچاوە نوێیەکانی دەسەلاّت وەك چین، بزووتنە نەتەوەییەکانی وولاّتانی جیهانی سێ یەم، سیاسەتی جیهانی پێویستی بەنەرم و نیانیەکی زیاتر بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان هەبوو، بەلاّم وەزیری دەرەوەی ئەمریکا واتە ((دالس)) تەنها سیفەتێك کەتیایدا نەبوو ئەم نەرم و نیانیە بوو، چونکە ئەو کەسایەتیەکی تابلّیی ووشك و توند بوو. بەتێڕوانینی ئەو، جیهان لەنێوان دوو بۆچوونی سەرمایەداری و کۆمۆنیستیدا دابەشکرابوو، کەوەکو دوو هێزی ئەهورایی و ئەهریمەنی

پێکەوە شەڕیان دەکرد و، هەموو شتێك بەشێوەیەکی رەها یان سپی یان رەش بوو. ناسین و داننان بەراستیە نوێیەکانی ژیان بەلایەوە زۆر گران بوو.

((جۆن فاستر دالس)) قەشەزادەیەکی پرۆستانت بوو، کە باوەڕی وابوو لەلایەن مەسیحەوە پەیامێکی نوێی بۆ جیهانی شارستانی هێناوە. جەنگی ساردی بەرووبەڕووبوونەوەی کلاسیکی نێوان ڕاستی و درووستی لەگەڵ گوناە و ناشیرین لێك دەدایەوە و کۆمۆنیزمی لەگەڵ هەر شتێکی پیس و نەهرێمەنی یەکسان دەکرد. کەسایەتی دەمارگیر و بیرکردنەوەی ووشکی ئەو لەبەرمنگار بوونەوەی کۆمۆنیستە ((کافرەکان))، کە لەگەڵ دادوەری ناکاری لەکاروباری سیاسەتی دەرەوە، وێنەیەك لە ((دالس)) پیشان دەدات، کەنوسەری بەسەرهاتی ئەو ((تاونزەند هوپ)) لەکتێبی ((شەیتان و جۆن فاستر دالس))دا کێشاویەتی. ئەو لەتەمەنی ٦٥ ساڵیدا پۆستی وەزیری دەرەوەی پێ سپێررا. باوکی بانگەشەکاری ئاینی پرۆستانت لە وولاتی چین بوو، پێش خۆی دووکەس لەبنەماڵەکەی کرابوونە وەزیری دەرەوە و، بڕوانامەی زانکۆی پرینستۆنی هەبوو، هەروەها ئەرك و پیشە جیاوازەکانی وەك کاروباری دارایی لە ((ڤال ئیستریت)) ناوەندی بازرگانی نیۆیۆرك، ڕاوێژکاری مافەکان لە واشنگتۆن و، ئەندام لەدەستەی سیاسی ئەمریکا بۆ ڕێکخستنی پەیمانی هاوکاری لەگەڵ ژاپۆنی گرتبووە ئەستۆ. بەڵام بەم هەموو ئەزموونەی کەپەیدای کردبوو هێشتا نەیدەتوانی دەرك بەگرفت و تەنگ و چەڵەمەکانی جیهانی پاش جەنگ بکات.

((دالس)) بزووتنەوە نەتەوەییەکان، شۆڕش و هەستانەوە دژ بەحکومەتە دیکتاتۆریەکان و ڕاپەڕینی دژ بەکۆلۆنیالیزمی لەئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتینی ـ کە زۆربەیان پەیوەندیان بەجەنگی ساردیشەوە نەبوو ـ بە ((پلانی کۆمۆنیزمی نێو دەوڵەتی)) ناودەبرد.

((ئایزنهاوەر)) لەساڵی ١٩٥٢ بوو بەسەرۆك کۆمار، ئەو کەسێکی سەربازی میانەڕەو، ئاشتی خواز و سادە بوو. وەك ((ویلیام شانون)) لەکتێبی ((سەردەمی سەرۆك کۆماری ئایزەنهاوەر))دا نوسیویەتی: ئەو کەسایەتیەکی هاوسەنگ لەگەڵ شعورێکی سیاسی مامناوەند بوو، کە زیاتر لەپاسەوانی بنەماکانی سیاسەتی وولاتەکەی دەچوو تاکەسێکی داهێنەر بەکۆمەڵێك بەرنامەی چاکسازیخوازانەوە، ئەو سەربازێکی قارەمان و سەرکەوتوو بوو کە زیاتر لەهەموو شتێك بایەخی بەپاراستنی ڕەوشتی هەنووکەیی وولاتەکەی دەدا تاوەکو کەسێك بەدوای جموجوڵ و گۆڕاندا بگەڕێت. بەڵام دەستنیشانکردنی ((دالس)) بۆ پۆستی وەزیری دەرەوە لەگەڵ ئەو سیاسەتە میانە ڕەوانەدا هەماهەنگ نەبوو. بەهاتنە سەرکاری ((دالس) زرۆێك لەکادیرانی وەزارەت لەسەر کار لابران. ((جۆرج کنان))کە زیاتر لەهەر دیپلۆماسێکی تر شارەزای کاروباری

[مەسەلەکانی] تایبەت بەیەکیەتی سۆڤیەت بوو، خانەنشین کرا، سیاسەتی جەنگی ساردیش گەیشتە لووتکە.

بەهێزکردنی ووزەی ئەتۆمی پەرەپێدانی چەکی ناوەکی، ئامادەکردنی هێزێکی سەربازی پێشکەوتوو بەپشت بەستن بە پێشکەوتنی پیشەسازی، یارمەتی دارایی و سەربازی وولاتانی تازە پێگەیشتوو بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی کۆمۆنیزم و بەستنی چەندەها ڕێککەوتننامەی سەربازی لەناوچە جیاجیاکانی جیهان سیاسەتی دەرەوەی دەیەی پەنجا پێك دەهێنێت. هەندێك لەیارمەتیە داراییەکانی ئەمریکا وەك پێشنیازەکەی مارشال لەئەوروپا ئەنجامێکی باشی بۆ ئەمریکا بەدەست هێنا و ڕەونەقێکی نوێی بەژیانی ئابووری وولاتانی ئەوروپا بەخشی. هەرچەندە ئەم یارمەتیانە بەتەواوەتی گرفتەکانیان چارەسەر نەکرد، بەلام چەندەها بەلێن و ڕێککەوتنی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان بەدواوە بوو. لەباشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا و لەپێناو ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمۆنیزم، هاوکاری خۆی بۆ هێزەکانی فەرەنسا دژ بەوولاتانی هیند و چین دووپات کردەوە. لەو شوێنانەی کەدەرفەتی گفتوگۆکردنی لەگەل لایەنەکانی بەرامبەر بۆ دەرەخسا، دەرئەنجامی زۆرباشی لێدەکەوتەوە، وەك ئەو ڕێککەوتنەی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەت لەسالی ١٩٥٦، پاش ڕووداوی خۆمالیکردنی کەنالی سوێس، کەتیایدا جەخت لەسەر بەکارهێنانی هێز لەبەرامبەر ئیسرائیل و پشتیوانە فەرەنسی و ئینگلیزەکانی کرایەوە و بوو هۆی پاشەکشێ پێکردنی هێزەکانی ئیسرائیل لەسوێس و نیمچە دوورگەی سینا. بەلام بیری یەکپارچەیی دونیای کۆمۆنیزم بوویە کۆسپێکی گەورە لەبەردەم هەلسەنگاندنی ئەو گۆڕانکاریە جەوهەریانەی کە لەئەورووپای ڕۆژهەلاتدا ڕویان دەدا. لەوانە سەربەخۆیی دەولەت کۆمۆنیستەکانی وەك یوگسلافیا لە مۆسکۆ، ڕاپەڕینی مەجەر لەسالی١٩٥٦، کەبەو پەڕی توندوتیژی و زەبری سەربازی یەکیەتی سۆڤیەت دامرکایەوە، ناکۆکیەکانی نێوان چین و سۆڤیەت. داڕێژەرانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، هێشتا لەسەر سیاسەتی جەنگی سارد بەردەوام بوون و بەدوای جەنگێکی خاچ پەرستی نوێ کەوتن. ((دالس))یش زۆر بەشەیدایی بەبەستنی چەند پەیماننامەیەکی جۆراوجۆر خۆی لەکاروبارەکانی ئاسیای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا سەرقال کرد.

((جۆرج کنان)) دیبلۆماتی ئەمریکی کە ((سیاسەتی گەمارۆ دراو)) ی جیهانی کۆمۆنیزمی پێشنیاز کردبوو، دوای چەند سالێك لەبیرەوەریەکانی خۆیدا دەنوسێت : ((سیاسەتی دەرەوەی ئێمە لەڕووبەڕووبوونەوی کۆمۆنیزمدا پەنای بۆ هێزی سەربازی برد و ئەو دەرفەتانەی کە بۆ بەرقەرارکردنی ژینگەیەکی دۆستانە ڕەخسابوون لەدەستدا، لەئەنجامدا دانی بەدابەشبوونی ئەورووپا بۆ دوو بلۆکی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا دان... بەمردنی ((ستالین)) و گۆڕانکاریەکانی جیهانی

کۆمۆنیزم، سەردەمی جەنگی سارد بەرەو کۆتایی دەچوو ، بەڵام سیاسەتی ئێمە هێشتا لەسەر شێوازە دوژمنکاریەکانی هەر بەردەوام بوو.))

هەرچەند ((ئایزەنهاوەر)) وەکو خۆی هەمیشە خوازیاری درێژەدان بەسیاسەتی میانە ڕەوانە بوو، کار و کردەوەکانی لە چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو بارودۆخە ترسناکەی سەردەمی ((مەك کارتیزم)) و سیاسەتی سەردەمی ستالین بەرز دەنرخێنێت، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە، ئەوەیە کە ئەگەر لەجیاتی هەڵبژاردنی ((دالس)) بۆ پۆستی وەزیری دەرەوە، گوێی لەبیروڕاو بۆچوونەکانی وەك ((جۆرج کنان)) بگرتبایە و، بەرامبەر بەگۆڕانکاریەکانی جیهانی سێیەم و ڕاپەڕینە نەتەوەییەکان لێك تێگەیشتنێکی زیاتری پیشان بدایە و بەچاوێکی وورد تر سەیری گۆڕانکاریەکانی جیهانی کۆمۆنیزمی بکردایە، ئەوا ئەگەری زیاتری هەبوو کە لەدوای کۆتایی هاتنی هەشت ساڵی سەرۆکایەتیەکەی جیهانێکی ئارامتر و دوور لەمەترسی شەڕ بەجێ بهێڵێت.

لەڕووی سوننەتی مێژووییەوە، ئەمریکا هەمیشە پشتیوانی لەهێزی یاسا بەرامبەر بە دەست درێژی و زۆرداری کردوە و شێوازی سیاسەتی دەرەوەی لەسەر بنەمای پیلان دارشتن، گفتوگۆی نهێنی، ڕەت کردۆتەوە، جەختی لەسەر سیاسەتێك کردۆتەوە کە لەسەر بنەمای دادپەروەری، پاراستنی ئازادی و خۆ بەڕێوەبەری، لەگەڵ هاوکاری و لێك تێگەیشتن نێو دەوڵەتی بونیاد نرابێت. بەڵام دوای جەنگی دووەمی جیهانی ، ئەمریکا لەچوارچێوەی ڕابەری جیهانی ئازاد، بەڕادەیەك خۆی گیرۆدەی بەرگریکردن لەم ئامانجانە کرد و بەئەندازەیەك پشتی بەزێ و ڕەسمی ئەمریکی وەك نموونەی کۆمەڵگەیەکی چاکتر بەست، کەلەپێناو بەرگریکردن لەو بەها پیرۆزانەی خۆی لەنێوز گێژاوێکی سەرباز و سیاسی درێژخایەندا گرفتار کرد. ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کە لەدەیەی پەنجا بەدواوە وەك دارێژەری سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا ڕۆڵی دەبینی، بەبێ هیچ جۆرە گرنگیدانێك بەڕاستیەکانی جیهان بۆ درێژەدان بەم سیاسەتە، ئەو پەڕی هەوڵەکانی خۆی خستە گەڕ. دەرئەنجامەکەشی شکستە تاڵەکەی ڤێتنام بوو.

سەرکەوتنی ئەمریکا لە جەنگی ناوەندا

وێنەی چوار سەرکردەی ئەمریکا کە بەشاخێکەوە هەڵکۆڵدراوە

جۆرج واشنگتۆن، تۆماس جفرسۆن، تیۆدۆر رۆزفلت و ئەبراهام لینکۆڵن

# بەشی دەیەم:

## دەیەی پڕ لەئاژاوە و گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکان

دەیەی ١٩٦٠ لەڕووی گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکانەوە بەیەکێك لەسەردەمە سەرنج ڕاکێشەکانی مێژووی ئەمریکا دەژمێررێت. کۆشش لەپێناو دەستەبەرکردنی یەکسانی مافی شارستانی ڕەشەکان و نارەزایی دەربڕین دژ بەرەگەز پەرەستی، چالاکیەسیاسی و کۆمەڵایەتیەکان هاوکات لەگەڵ چاوکرانەوە و هۆشیاری توێژی لاوان سەبارەت بەبەڵێن و ئەرکەکانی دەوڵەت لەبەرامبەر هاوڵاتیان، بەرزبوونەوەی دەنگی نارەزایی دژ بەجەنگی ڤێتنام، ڕەت کردنەوەی هەر جۆرە جیاوازیەکی ڕەگەز و هەوڵدان بۆ بەرجەستەکردنی مافی کۆمەڵایەتی ئافرەتان، ئەو تایبەتمەندیانە بوون کە ئەمریکای ئەم سەردەمەی لەڕابردووی خۆی جیاکردەوە.

بەهەڵبژاردنی ((جۆن کەنەدی)) بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری لەساڵی ١٩٦٠، لیبرالیزمی ئەمریکا هێز و ووزەیەکی نوێی وەرگرت و سەرنجی کۆمەڵگەی ئەمریکی بۆ لای نادادپەروەریەکانی ئەو کات ڕاکێشا. نزیکەی یەك لەسەر چواری تێکڕای دانیشتوانی ئەمریکا بەدەست هەژاریەوەدەیناڵاند، دەمارگیری نەژادی نەتەوەی ڕەشی لەچوارچێوەی توندوتیژیە کۆمەڵایەتیەکاندا کۆت کردبوو، ژنان لەگەڵ وەرگرتنی مافە سیاسیەکانیان، بەڵام هێشتا لەزۆربەی خزمەت گوزاریە کۆمەڵایەتیەکانیان بێ بەش دەکران.سەردەمی سەرۆك کۆماری((کەنەدی)) سەردەمی ئومێدەواری وگەشبینی بوو.ئەو لاوترین کەس بوو کە توانیویەتی لەتەمەنی ٤٣ساڵیدا ببێتە سەرۆك و بەو پەڕی باوەڕ بەچارەسەر کردنی گرفتە کۆمەڵایەتیەکان، بەمتمانە بەخۆبوون و ڕوحیەتی لاویەتی و گەشبینی و ئومێدەواری، دەیەی سەر سوڕهێنەری شەستی بەبیرکردنەوەیەکی نوێوە دەست پێکردبوو.

ئەم سەردەمە بەبەراورد لەگەڵ دەیەی پەنجا زۆرجیاوازە. لەدەیەی پەنجا کۆمەڵگەی ئەمریکی زیاتر بایەخ و گرنگی بەئاسایش و خۆشگوزەرانی مادی دەدا لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی پڕ لەئازونیعمەت. خۆشگوزەرانی پاش جەنگ، بازاڕەکانی ئەمریکای لەبەرووبوومە جۆراوجۆرە ڕەنگاوڕەنگەکان پڕ

کردەوە.بەبەکارهێنانی ئامرازوئامێری کارەبایی، سوود وەرگرتن لەئامێرەنوێیەکانی ناومال، بیناکاری فراوان لەدەورووبەری شارەکان، بەسوود وەرگرتن لە پێشکەوتوو ترین ئامێرەکان، مزگێنی ژیانێکی ئاسوودەی مادی بەچینی ناوەندی کۆمەلگەی ئەمریکی دەدا. خەلکی ئەمریکا بەبێ گرنگیدان بەجەنگ و ئەو گرفتە کۆمەلایەتیانەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە،ڕوویان لەبازارەکانی بەکار بردن کرد، هەموو لەهیچ جۆرە هیوایەك بۆداهاتوو بەپشت گوێخستنی لایەنی کۆمەلایەتی دلیان بەخۆشگوزەرانی مادیەوە خۆش کرد. زۆربەی ئەندامانی کۆمەلگە بەژیانی پڕ لەئازونیعمەت و یەکسان، خانووی هاوشێوە و یەك جۆرە بیرکردنەوە ڕازی و خۆشحال دەبوون. کۆمەلە هۆکارێکی جۆراوجۆر لەپشت ئەم دیاردەیەوە بوون.

قەیرانی ئابووری سالەکانی سی، کۆمەلگەی ئەمریکی لەناباوەڕی و ترسان لە هەژاری و وەرشکست بوون نزیك کردەوە. هەندێکیان لەژیان بێ بەش کران و نومێدیان بە ئاینده لەدەستدا. بەلام سیاسەتی ئابووری ((ڕۆزفلت))، لەگەل برەو سەندنی لایەنی مادی سالەکانی جەنگ، بارودۆخەکەی هێور و ئارام کردەوە.ئەوەی پەنجاکان کە هێشتا بیرەوەریە تلەکانی سەردەمی هەژاری و پەرێشانیان فەرامۆش نەکردبوو،لەهیچ جۆرەهەولدانێکبۆ پڕکردنەوەی پێداویستیە مادیەکانیان سلیان نەدەکردەوە. لەلایەکی ترەوە کۆتایهاتنی جەنگی دووەمی جیهانی،دوو گەورە زلهێزی سۆڤیەت و ئەمریکای ڕووبەڕووی یەکتر کردەوە. جەنگی ئایدۆلۆجی و کێبرکێی سیاسی، بۆ پاراستنی سنووری دەسەلاتی جیهانی ئازاد و کۆمۆنیزم، قەیرانی سالەکانی جەنگی ساردی هێنایە پێشەوە کە تاشەستەکانیش هەر بەردەوام بوو. ترسان لەکۆمۆنیزم، سەرنجی بیروڕای گشتی بۆ لای سیناتۆرێکی بێ ناونیشانی وەك ((جۆزێف مەك کارتی)) ڕاکێشا.گروپە ڕاست ڕەوو محافەزەکارەکان بەهێزتربوون وکۆمەلگەی ئەمریکی زیاتر لەهەموشتێك هەولی پاراستنی ڕەوشی هەنووکەیی دابین کردنی ئاسایشی مادی دەدا. سەرۆك کۆمارێتی ((کەنەدی)) شەوق و زەوقێکی نوێی بەچاکسازیخوازان و توێژی لاوان بەخشی. لەشەستەکان، خۆشگوزەرانی و ئاسوودەیی، ترسی داهاتووی ڕەواندەوە و سەرنجی ئەمریکای بۆلای دیاردەی ڕەگەزو پەرستی و بێ سەروبەریەکانی ناوخۆڕاکێش.((کەنەدی)) کەسێکی خوێندەوار، لاوو، یەکەمین سەرۆك کۆماریش بووکەکە لەلایەن بنەمالەیەکی کاتۆلیکەوە پەروەردەکرابێت.بەبەراوورد لەگەل ((ئایزنهاوەر)) ماوەی سەرۆکایەتی ((کەنەدی)) بەسەرتای بەشێکی نوێ لەمێژووی سیاسی ئەمریکا دەژمێررا. ((ئایزنهاوەر)) لەتەمەنی ٧٥ سالیدا بوو بەسەرۆك کۆمار لەکاتێکدا کە ((کەنەدی)) توانی لەتەمەنی چل و سێ سالیدا ئەم پۆستە بەدەست بهێنێت.

بەپێچەوانەی ((ئایزنهاوەر)) کە زۆرینەی هاوکارەکانی سەر بەچینی سەرمایەداری و بازرگانە گەورەکانی ئەمریکا بوون ،کەنەدی توانی ژمارەیەکی زۆر لە توێژی لاوان، قوتابیانی زانکۆ،ماف پەروەران لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە.

بەلام لەرووی هەلسوڕاندنی کاروباری ناوخۆییەوە لەگەل ئەو هەموو گوڕوتینەی کە لەپێناو پراکتیزەکردنی دادپەروەری وکۆمەلایەتی دەیدا ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر بوویەوە.پێشنیازە چاکسازیەکانی لەبواری تەندروستی گشتی، فێرکردن، ڕێکخستنی شارەکان، ڕیفۆرمی باج و مافی شارستانی ڕەشەکان نایانتوانی ڕەزامەندی ئەندامانی کۆنگرێس بەدەست بهێنن. جگە لەمانەش، کەنەدی ناوی لەگەل خاوەن سەرمایە ودەسەلاتەفراوانەکەیان لەکاروباری سیاسیدا ئەدەچوو بەجگۆیەکدا. کۆمپانیای پۆلای ئەمریکا کە یەکێك لەدامەزراوە هەرە گەورەکان بوو،داوایەکی لەسەر زیادکردنی نرخەکان پێشکەش کرد،لەبەرامبەریشدا ((کەنەدی)) بەمەبەستی بەرپەرچدانەوەی خواستەکانی ئەو کۆمپانیایە، یاسای دژە تراستی خستە گەڕ و مەسەلەی [لێکۆلینەوە] بەدوادا چوونی کاروباری ناوخۆی کۆمپانیاکەی هێنایە ئاراوە. لەبەرامبەر ئەم سەخت گیریەی ((کەنەدی))دا بەڕێوەبەرانی کۆمپانیای پۆلا لەسەر داواکەیان پاشگەز بوونەوە و کۆتاییان بەمەسەلەکە هێنا.

شێوازی ((کەنەدی))، لەگرنگیدان بەفەرهەنگ و هونراوە و مۆسیقا و هاندانی هونەرمەندان و ڕوناکبیران لەگەل بیرکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەسیاسەتمەدارە کۆنەکاندا ئەدەگونجا. وەکو یەکێك لەنوێنەرە دەسەلاتدارەکانی کۆنگرێس دەلێ ((مۆزیکی مۆتسارت، هونراوەی رابێرت فراست و شانۆگەری بالە و گفتوگۆی فەلسەفە و ئەدەبیات کە ئەم ڕۆژانە کۆشکی سپی بەخۆوە سەرقال کردوە، لەڕادەبەدەر ئەرستۆکراتیانەیە.))

بەواتایەکی تر، سیاسەتمەدارە محافەزەکارەکان بەم شێوازەی ((کەنەدی)) زۆر بێزار دەبوون و دانیان بەو هەول و کۆششەی ئەو لەپێناو چاکسازیە کۆمەلایەتیەکاندا ئەدەنا.((کەنەدی)) ناچار دەبوو زۆر بەووردی کارەکانی ڕاپەڕێنێت و ئومێدەواربوو کە لەدەوری دووەمی سەرۆکایەتیەکەیدا بەهێز و ووزەیەکی زیاترەوە پەرە بەچاکسازیەکان بدات. ناوبراو لە ۲۲ی نۆڤەمبەری ۱۹٦۳،کاتێك بەئۆتۆبیلێکی سەر بەتال بەشەقامەکانی ((والاس)) لەتەکزاسدا تێدەپەڕی، ڕووبەڕووی هێرشێکی چەکداری بویەوە و کوژرا. مەرگی لەناکاوی ((کەنەدی)) ئەمریکا و جیهانی سەرسام کرد. حکومەتە یەك هەزار ڕۆژەکەی ((کەنەدی)) کەچاوی بەئاسۆیەکی ڕوناکتر بڕیبوو، کۆتایی پێهات و جیهانی دلگران کرد. ئەو ئونەی ئەوەیەکی لاوو ئومێدەواری ئەمریکا بوو، هەروەها ئەو گوڕوتینەی کە خستیە دلی چاکسازیخوازانەوە، دەسپێکی گۆڕانکاریەکانی دەیەی شەست بوو، دەیەیەك کە چاوەڕوانی سەرکەوتنی دادپەروەریە کۆمەلایەتیەکانی لێدەکرا.

گرفتی سەرەکی ((کەنەدی)) لەسیاسەتی دەرەوەیدا چارەسەرکردنی قەیرانی کوبا بوو. رژێمە نوێیەکەی کوبا بەسەرکردایەتی((فیدل کاسترۆ)) کە لەکۆتاییەکانی دەورەی سەرۆکایەتی ((ئایزنهاوەر))دا دەستی بەکار کرد، بۆ ئەمریکیەکان مایەی نیگەرانی بوو، هەر لەو کاتەوە دەزگای ((سی ئای ئەی)) و حکومەتەکەی ئایزنهاوەر بەمەبەستی لەناوبردنی پلانێکیان دارشت و پاش وەرگرتنی رەزامەندی ((کەنەدی)) لەئاپریلی١٩٦١ خراپە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. ژمارەیەك لەکوباییەکانی دانیشتووی ئەمریکا و نەیاری ((کاسترۆ)) ئامادەیی خۆیان بۆ گەڕاندنەوە بەرەو کوبا و بەپاکردنی شۆڕشێکی ناوخۆی دژ بەحکومەتی وڵاتەکەیان راگەیاند. بەڵام ئەم پلانە سەری نەگرت و لەکەنداوی ((خوکها))ی نزیك کەنارەکانی کوبا، شکستێکی قورسیان خوارد و پلانەکەشیان ئاشکرا کرا. ((کەنەدی)) دانی بەشکستەکەیدا ناو،لێپرسراویەتی پلانەکەی گرتە ئەستۆ:((سەرکەوتن بەسەدان باوکی هەیە بەڵام دۆڕان تەنهاوەتیوە...من لێپرسراوی دەوڵەتم ولێپرسراویەتی ئەم شکستە بەتەنهایی قەبوڵ دەکەم.))

کاتێك یەکیەتی سۆڤیەت فەرمانی ناردنی چەند موشەکێکی بەرەو کەنارەکانی کوبا دەرکرد، ((کەنەدی)) بەجەرگانە رووبەڕووی وەستایەوە. قەیرانی مووشەکەکان لەمانگی ئۆکتۆبەری ١٩٦٢، ئەگەری شەڕێکی دیکەی هێنایە ئاراوە. ((خرۆشچۆف)) کە لەوانەیە رکابەرە نوێیەکەی بەکەسێکی لاو بێ ئەزموون دانابێت،بەجێگیرکردنی مووشەکەکانی یەکیەتی سۆڤیەت لەووڵاتەکەی تاقیکردنەوەیەکی مەترسیداری ئەنجام دا. سوور بوونی ((کەنەدی)) وهەڕەشەکانی بۆبەرەنگاربوونەوەی سەربازی راستەوخۆ پاشەکشێ کردنی سۆڤیەت و هەلگرتنەوەی مووشەکەکانی لێکەوتەوە. لەگەڵ ئەو هەموو ململانێ مەترسیدارەی کەلەنێوان ئەمریکا و سۆڤیەتدا روویدا، بەڵام ((کەنەدی)) توانی بنچینەی سیاسەتی پێکەوە ژیان و ئاشتەوایی رەنگ رێژی بکات. ئەو بەتەواوەتی پێویستی لێك تێگەیشتن و هاوکاری نێوان هێزەکانی روون کردەوە و دانی بەوەدا نا کە: ((دەبێت دان بەو راستیەدا بنێت کە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەهێزترین وڵاتی جیهانی نیە ئێمە تەنها ٦٪ی تێکرای دانیشتوانی جیهان پێك دەهێنین و ناتوانین بۆچوون و ویستی خۆمان بەسەر لە٩٤٪ی دیەکەدا بسەپێنین. ئێمە ناتوانین هەر جۆرە هەڵەیەك چارەسەر بکەین و نەهەر جۆرە خراپە و ستەمێك لەناو ببەین. کەواتە ناتوانرێت رێگا چارەیەکی ئەمریکایی یان رووسی بۆ هەر جۆرە گرفتێکی جیهانی دابنرێت.))

کەنەدی زیاتر لەهەموو سەرۆك کۆمارەکانی تر بەلای وڵاتانی ئەمریکای لاتینیەوە خۆشەویست بوو. دامەزراندنی سوپای ئاشتی، جەختکردنەوە لەسەر ((رێکخراوی یەکیەتی بۆ پێشکەوتن)) لەگەڵ پرۆژەکانی یارمەتیە داراییەکانی وڵاتانی ئەمریکای باشوور پێشوازیەکی گەرمی لێکرا.

بەرەچاوکردنی ئەوەی کەیارمەتیە دارایەکانی ئەمریکا لەڕابردوودا زیاتر بۆ بەهێزکردنی حکومەتە سەربازیەکانی ئەمریکای لاتین تەرخان کرابوون، پلانی نوێ زیاتر گرنگی بەلادێکان و ژیانی چینی چەوساوەی کۆمەڵگە دەدا، تاوەکو پڕکردنی گیرفانی ژمارەیەك دەسەڵاتدار. لەم ڕووەوە، بەرقەرارکردنی پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ وڵاتە سەربازیە دیکتاتۆریەکانی ئەمریکای لاتین ڕەت دەکردەوە.
((کەنەدی)) لەحکومەتە هەزار ڕۆژیەکەیدا لەگەڵ هەموو ئەو گیروگرفتانەی کە لەسەرەتای ماوەی سەرۆکایەتیەکەی ڕوویەڕووی بوویەوە - وەکو قەیرانی کووبا - بیرۆکەی ڕێککەوتن و هاوکاریکردنی یەکیەتی سۆڤیەتی درێژە پێدا و تارادەیەکیش سیاسەتی جەنگی ساردی پشت ڕاست کردەوە.
گرنگیدان بەمەسەلەکانی جیهانی سێیەم ، سیاسەتی ئەو بەرامبەر بەبزووتنەوە نەتەوەییەکان، چارەسەرکردنی قەیرانی کۆنگۆ وای پیشان دەدا، کە بەبەردەوامبوونی سەرۆکایەتیەکەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا نەرمتر و واقیعی تر دەبێت، هەمان شێواز کەلەسەردەمی نیکسۆن و کی سینجەردا گیرایە بەر و بەرەو لێك تێگەیشتنی زیاتری لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات و چین لێکەوتەوە.

گرنگترین ئەو مەسەلانەی کەبوونە هۆی بەرزبوونەوەی دەنگی نارەزایی و ڕەق و قینی خودی ئەمریکاییەکان لەناوخۆیاندا، گرفتی نەژادی و تێکۆشان لەپێناو بەرجەستە کردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی بۆ ڕەشەکان، فراوانبونی جەنگی ڤێتنام و خۆپیشاندانی خەلکی دژ بەجەنگ لەئەمریکا، یاخی بوونی لاوان لەژێر کاریگەری دیاردەی جیاوازی نەژادی و جەنگی ڤێتنام، لەکۆتایشدا ڕاپەڕینی ئازادی ئافرەتان بوو.

گەرمتی مافی شارستانی و دادپەروەری کۆمەلایەتی بۆ ڕەشەکانی ئەمریکا لەگرنگترین مەسەلەکانی سالەکانی شەست هەژمار دەکرێت. هەولدان لەم پێناوە بۆ سالەکانی ناوەڕاستی پەنجا دەگەرێتەوە. لەسالی ١٩٥٤ دادگای بالای وولات ڕایگەیاند کەجیاکردنەوەی نەژادی قوتابیان لەقوتابخانەکان لەگەڵ قانوونی ئەساسیدا یەکانگیرنیە. قوتابخانە سەرەتایی ناوەندیەکان تائەو کاتە بەشێوەیەکی جوداو بەپێی نەژادەکان وانەیان تیا دەوترایەوە. ئەو دامەزراوانە لە بنچینەدا چیرۆکی نایەکسانی کۆمەلایەتیان دەگێڕایەوە و هۆکارێکیش بوون بۆ دابەزاندنی ئاستی خوێندەواری ڕەشەکان. بڕیاری دادگای بالا بەهەنگاوێکی شۆرشگێرانە لەنێوان پەیوەندیە نەژادیەکانی ئەمریکا و سیستەمی فێرکردنی وولات دەژمێررا. هەرچەندە ئەم بڕیارە تەنها قوتابخانەکانی دەگرتەوە، بەلام بەدلنیاییەوە ئەنجامێکی باشی بەدەست هێنا و کاریگەری لەسەر تێکرای یاساکانی جیاکردنەوەی ویلایەتەکانیش دەبێت. زۆرێك لەویلایەتەکان ناچار دەکران کە گۆڕانکاری لەسیاسەتی نەژادی خۆیان بکەن.

پراکتیککردنی ئەم بڕیارە کارێکی وەها ئاسان نەبوو، لەویلایەتەکانی باشوور بەرەنگاربوونەوە دژ بەتێکەلکردنی نەژادی بەشێوەیەکی هەمەچەشنە سەری هەلدا. یەکێك لەو شێوازانەی بەرەنگار

بوونەوە، داخستنی قوتابخانە گشتیەکان و یان ڕێگەگرتن لەناونوس کردنی قوتابی ڕەش پێست لەقوتابخانە بوو. لەساڵی ۱۹٥۷ چوونە ژوورەوەی نۆ قوتابی ڕەش پێست بۆ قوتابخانەیەکی ئامادەیی لە ((لیتل ڕاك))ی سەر بە ویلایەتی ئارکانزاس زنجیرەیەك ئاژاوە و پشێوی گەورەی لێکەوتەوە و دەوڵەتی فیدراڵی ناچار تەداخوولی کرد. یەکە سەربازیەکانی دەوڵەتی فیدراڵی بەمەبەستی ڕێگەگرتن لەپەرەسەندنی ئاڵۆزی و پشتیوانیکردنی قوتابیانی ڕەش پێست ڕەوانەی ناوچەکە کران و بەجێگیربوونی هێزەکان لەو شوێنانە، لەسەر قوتابخانەکان پێویست کرا کە بەبێ جیاوازی قوتابیە ڕەشەکانیش ناونوس بکەن. لەسەردەمی ((کەنەدی))یشدا بۆ جارێکی تر، هێزەکانی دەوڵەتی فیدراڵی بەمەبەستی پشتگیریکردنی قوتابیەکی ڕەش پێستی زانکۆی می سی سی پی ڕەوانەی ناوچەکە کران. بەم شێوەیە وورده وورده سیاسەتی بەرەنگاربوونەوەی سپی پێستەکان پشت ڕاست کرایەوە و ڕێگای بۆ ڕازیبوونی ڕێژەیی لەپێناو تێکەڵکردنی نەژادیدا خۆش کرد.

بڕیاری دادگای باڵا بۆ تێکەڵکردنی نەژادی قوتابخانەکان چوارچێوەیەکی فراوانتری بەخۆوە بینی و ململانێ و نەبەردی ڕەشەکانی لەپێناو بەرجەستە کردنی یەکسانیە کۆمەڵایەتیەکان تەوندوتۆڵتر کردەوە. ژمارەیەك ڕێکخراوی نوێ بۆ بەرگریکردنی گشتی، لەبەرامبەر جیاوازیە نەژادیەکان هاتنە ئاراوە، چەندەها شێوازی نوێتریش بەکار هێنرا و لەنێوانیاندا ڕابەرێکی ڕەش پێست بەناوی ((مارتین لۆتەر کینگ)) لەهەمووان زیاتر ناوبانگی دەرکرد. بەکارهێنانی ئامێرەکانی هاتووچۆ بەبێ جیاوازی وەك چالاکیەکی سەرەکی لەم قۆناغەوە دەستی پێکرد. لەساڵی ۱۹٥٥ لەشاری مۆنتگمری سەربە ویلایەتی ئالانا ئارەزاییان دژ بەم شێوازە دەربڕی و ((لۆتەر کینگ)) لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوڕێیانی ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ئارام و ڕەخنەگرانەیان دەست پێکرد، ڕەشەکانیش لەدانیشتن لەو شوێنە تایبەتیانەی کە لەنێوان باسەکان بۆیان دیاری کرابوو، خۆیان بەدوور گرت و ڕووداوەکە بەشێوەیەکی بەربلاو لەچاپەمەنیەکاندا بلاوکرایەوە و، ویژدانی سپی پێستەکانی بەخەبەر هێنایەوە و ژمارەیەك لەلاوە سپە پێستەکان لەویلایەتە جۆراو جۆرەکانەوە هاتن بەهانای ((کینگ))ەوە و پەیوەندیان بەڕاپەڕینی بەرگری ڕەشەکانەوە کرد.

لەساڵی ۱۹٥٦ دادگای باڵا بڕیاری نایاسایی بونی جیاکردنەوەی ڕەش و سپی بۆ بەکارهێنانی ئامێرە گشتیەکانی گواستنەوە پەسەند کرد و ئەم بڕیارە سەرکەوتنێکی دیکەی بۆ ڕاپەڕینی مافی شارستانی ڕەشەکان دەستەبەر کرد. لە ۱۹٦۰ پاش ئەوەی ژمارەیەك قوتابی ڕەش پێست لەکۆلێژێکی ویلایەتی کارولینای باکوور بەنیازبوون بچنە نێو چێشتخانەیەکەوە کە تایبەت بوو بەقوتابیانی سپی پێست، ڕێگەیان لێگیراو ئەوانیش لەبەرامبەردا دەستیان بەمانگرتن کرد. بەبلاوبوونەوەی ئەم هەواڵە، مانگرتنی ڕەش پێستەکان بۆ نێو زۆربەی چێشتخانەکانی قوتابخانە و شارەکان ـ کەتایبەت بوون

بەشێی پێستەکان ـ تەشمەنەی کرد و چەند ڕۆژێکیش بەردەوام بوو و تەنها بەبەکارهێنانی هێزی سەربازی، ویلایەتەکان دەیانتوانی مانگرتنەکان بڵاوە پێبکەن. بەڵام ئاکامەکەی هەر تێکەڵکردنی شوێنە گشتیەکان و ڕێستۆرانتەکان بوو. بەمەبەستی دابینکردنی مافی شارستانی و ئازادی و پیشە ڕێکخراوە جۆربەجۆرەکانی ڕەشەکان بڕیاریاندا ڕێپێوانێکی بەر فراوان بەرەو واشنگتۆن ساز بدەن. ژمارەیەکی زۆر لەسپی پێستەکان و ئەمریکیەکان پەیوەندیان بەراپەڕینەکەوە کرد. زیاتر لە دووسەد هەزار ئەمریکی، ڕەش و سپی، پیر و لاو کە هاوینی ١٩٦٣ بەرەو واشنگتۆن کەوتنە ڕێ و ڕێپێوانێکی بەرفراوانیان بەرپا کرد، ڕێپێوانێك کەوەکو ((کەنەدی)) دەڵێ ، ئەمریکا دەیتوانی شانازی پێوە بکات، چونکە ئامانج لەم ڕێپێوانە دووبارە جەخت کردنەوەی قانونی ئەساسی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی بوو،کە تیایدا دووپاتی کردەوە کە هەموو هاوڵاتیانی ئەمریکا لەبەرامبەر یاسادا یەکسانن. ئەم ڕێپێوانە هەوڵێك بوو لەپێناو دابینکردنی مافی شارستانی و ئاگادار کردنەوەیەکیش بوو بۆ کۆمەڵگەی ئەمریکا، کە چیتر ڕەشەکان نایانەوێ ساڵەهای ساڵ لەچاوەڕوانیدا بن، تاوەکو بەو مافانە بگەن کە لەقانونی ئەساسیدا دانیان پێدا نراوە. بەم شێوەیە کۆمەڵگەی ئەمریکی ناچار بوو دان بەئەرکەکانی خۆیدا بنێت و بەشێوەیەکی جدی لەپێناو دەستەبەرکردنی مافە سەرەکیەکانی ڕەشەکان هەنگاو بنێت.

بەدەست بەکاربوونی ((لیندۆن جانسۆن)) جێنشینی ((کەنەدی))، کۆمەڵێك نوسراوی تایبەت بەدیاریکردنی مافی شارستانی ڕەشەکان لەلایەن گۆنگرەی ئەمریکاوە بڕیاریان لەسەر درا. لەم نوسراوانەدا بابەتەکانی وەك هەڵبژاردن، شوێنی نیشتەجێ بوون، ئاسانکاری پیشەیی جەختیان لەسەر کراوەتەوە و هەر جۆرە کردارێکی ڕەگەز پەرستی یان ڕێگەکرتن لەمافی بەشداربوون لەهەڵبژاردنەکان، هەڵبژاردنی شوێنی نیشتەجێ بوون، یان جیاوازی کردن لەنێوان تاکەکان لەکاتی دامەزراندنیاندا لەبەر نەژاد یان ڕەگەز بەپێی ئەم یاسایە قەدەغەکرا و ئەنجامەکەشی بەنەمانی جیاوازی نەژاد لەشوێنە گشتیەکان و هێزەکانی هاتووچۆ لەسەرتاسەری وڵات کۆتایی هات. بەڵام سنووورداربونی جێبەجێکردنی یاسان بەئاشکرا هەستی پێدەکرا و ئەو گرفتانەی کەڕووبەڕووی سیستەمی فێرکردن، پیشە و یان نیشتەجێبوون لەناوچە و گەڕەکە ڕەش پێستەکان دەبوونەوە بەزەبری یاسا چارەسەر نەدەکران.

مانەوەی هەموو ئەم [کێشە] وناڕەزاییانە، ڕەشەکانی بەرەو دامەزراندنی گروپە یاخی بووەکان ڕاکێشا، یەکێك لەو گروپانە، کۆمەڵەی موسوڵمانانی ڕەش پێست بوو ، ئەم گروپە لەسەرەتاکانی دەیەی شە ستەوە بەسەرکردایەتی کەسێك ناسراو بە ((ئیلیجاە موحەمەد)) لەشیکاگۆ و ناوچەکانی دیکەی ئەمریکا دامەزرا، ئەو داوای جیاکردنەوەی بەتەواوەتی ڕەش و سپی دەکرد و باوەڕی وابوو

کەپێویستە لەڕووی ئابووریەوە تەنها پشت بەخۆ ببەستن. موسوڵمانانی ڕەش پێست، کار و کۆشش و زیادە ڕۆیی نەکردنیان کردە سەر مەشقی کارەکانیان. بەکێڵانی زەوی، کۆکردنەوەی بەروبووم، دروستکردنی دووکانی تایبەت بەخۆیان و ڕاکێشانی ژمارەیەکی زۆر لەبێ نەوایان بۆ لای خۆیان، سوود وەرگرتن لەتواناکانیان، لەپێناو گەیشتن بەخود کیفایی، هەنگاوی جددیان نا. باوەڕهێنانیان بەئاینی پیرۆزی ئیسلام لەبەر ئەوەبوو، کە ژمارەیەکی زۆر لەووڵاتانی کیشوەری ئەفریقا موسوڵمان بوون و [لەئیسلامدا] ڕەنگ و نەژاد لەبیروباوەڕی مەزهەبیدا هیچ کاریگەریەکی نیە. ئیسلام ئەو ڕووەوە شێوازێکی ئازادیخوازانەی بەخۆوە گرتبوو. یەکێکی تر لەڕابەرانی خاوەن پلە و پایە و هوشیاری ڕەشەکان ((مالکم ئیکس)) بوو، کەلەنێو شاری نیۆیۆرك و بەتایبەت گەڕەکی هارلم، لەڕووی بانگەوازی ئاینی ئیسلام و کۆکرنەوەی ڕەشەکانەوە ناوبانگی زۆری پەیدا کردبوو. ئەو بەهێمای ڕق و قینی ڕەشەکان دەژمێررا. ڕۆشن فکرە ڕەش پێستەکان و گروپەکانی تریش ڕێزێکی تایبەتیان بۆ دادەنا، بەڵام بەهۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی لەنێوان گروپی موسوڵمانانی ڕەش پێست لەنێو خۆیاندا، ((مالکم ئیکس)) گومانی خراپی خرایە پاڵ و ئەگەری پەرتەوازەیی و دووبەرەکی نێوان گروپەکەی ئەو و ((ئیلیجا موحەممەد)) بووە هۆی مردنی.

گروپەکەی ((مارتین لۆتەر کینگ))، کە باوەڕێکی تەواوی [بە پەیڕەوکردنی] شێوازێکی ئارام و ئاشتیخوازانە هەبوو، زۆرینەی ڕەشەکانی بۆلای خۆی ڕاکێشا. ئامانجی ئەم گروپە ئاشتیخوازە ئەوەبوو کەبەڕێگەی گفتوگۆ دەربڕینی ناڕەزایی بەبێ پەنابردنە بەر زەبر و توندوتیژی، ویژدانی کۆمەڵگەی سپی پێستی ئەمریکایی بەئاگا بهێنێتەوە و لەڕێگەی ئاشتیانە بەئامانجەکانی خۆی بگات.

هەستی خۆ بەگەورەزانینی نەژادی ڕەش پێست لەسەرەتاکانی دەیەی شەستەوە سەرچاوەی دەگرت. ئارێتە بوونی پایەبەرزی نەژادی ڕەش لەگەڵ بێ بەشکردنی لایەنی ئابووری، سەرهەڵدانی دروشمی ((هێزی ڕەش))ی بەدوادا هات، بۆ ئەوەی گروپە جۆراوجۆرەکانی نەژادی ڕەش وەك ئامێرێك بۆ باشتر کردنی ژیانی خۆیان و دەربڕینی ناڕەزایی خۆیان بەکاری بهێنن. ((هێزی ڕەش)) گرنگی بەڕەگ و ڕیشە فەرهەنگیەکانی نەتەوەی ڕەش و خوێندنەوەی مێژووی ئەفریقا، سەرکەوتنی ڕەشەکان لەوەرزش، مۆسیقا، ئەدەب و هونەرە نمایشیەکان دەدا و جەختی لەسەر چڕبوونەوەی دەسەڵات لەدەستی ڕەشەکان و وەلاخستنی ئەو سپی پێستانەی کەلەگەڵ ڕاپەڕینی شارستانیدان، دەکردەوە. بەردەوامبوون لەسەر گرنگیدان بە دروشمی ((هێزی ڕەش)) بەکاری گێرەشێوێنی و دامەزراندنی گروپە چەکدارەکانی وەك حیزبی ((پڵنگە ڕەشەکان)) گۆتایی پێهات. دروشمی ئەم گروپە نوێیە پەنابردنە بەر توندوتیژی و بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی بوو لە ((ڕێگەی دەمانچەوە.))

خرۆشی ڕەشەکان لەناوەڕاستی دەیەی شەستدا ئاژاوە و پشێویەکی زۆری نایەوە. لەگەرەکێکی ڕەش پێست نشینی شاری لوس ئانجلوس ناسراو بە ((واتس)) یاخی بووان شۆرشێکی خوێناویان بەرپاکرد کە دواتر سنووری شاری لوس ئانجلسی بەزاند و بەخێرایی شارەکانی تریشی گرتەوە. شۆرشە نەژادیەکان زیاتر دژ بەهێزی پۆلیس و دەمارگیریە نەژادیەکان بەرپا دەکران، کەهەندێ جار زەرەروو زیانێکی گیانی و مادی زۆریان لێدەکەوتەوە.

((کۆمیسیۆنی بەدوادا چوونی کارە توندوتیژیەکانی شارەکان)) کەلەلایەن ((جانسۆن))ەوە ئەرکی لێکۆڵینەوەی گێروگرفتی شارەکان و دیاردەی ڕەگەز پەرستیان پێ سپێردرابوو، پاش چەند مانگ دیراسەو لێکۆڵینەوە، ڕاپۆرتێکی لەم بارەیەوە بڵاو کردەوە کەسەرنجی زۆرێك لەخەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. بە پێی ڕاپۆرتی ئەم کۆمیتەیە دەمارگیری نەژادی کۆمەڵگەی سپی پێست کە بنچینەیەکی قوڵی مێژوویی و کۆمەلایەتی هەیە، هۆکاری سەرەکی یاخی بوونی ڕەشەکان و ڕاپەڕینی شارەکان بوو. لەواقیعیشدا ڕاپەڕینی ڕەشەکان زیاتر دژ بەهێماکانی دەسەلاتی کۆمەڵگەی سپی پێست بوو، تاوەکو خودی سپی پێستەکە. بەپێی ئەم ڕاپۆرتە، ئەو هۆکارانەی کەیارمەتی دەربوون بۆ سەرهەڵدانی شۆرشی نێو شارەکان بریتی بوون :لەتوندوتیژی هێزەکانی پۆلیس بەرامبەر بەو کێشانەی کەڕووبەڕووی ڕەشەکان دەبوونەوە، بێ کار و ئاڵۆزی دەستکەوتنی کار و پیشە، بارودۆخی نالەباری شوێنی نیشتەجێ بوون، نەبوونی پێداویستیەکانی فێرکردن یان گەشت و گوزار، پشت گوێخستنی داواکاری و سکالای ڕەشەکان لەلایەن دەسەلاتی دادوەریەوە، گرنگی نەدانی دەولەت بەباشکردنی ئاستی خۆشگوزەرانیان. کەواتە هەموو ئەم هۆکارانە ڕۆلی سەرەکیان لەسەرهەڵدانی بێ سەر و بەری و زیادبوونی هەژاری و پشێویدا دەگێرا. توندوتیژی و تاوان و بێ ڕەوشتی و بەکارهێنانی مادە بێ هۆشکەرەکان و پەرەسەندنی فەساد و تاوان لەشارەکانیش لەدایك بووی ئەم فاکتەرانە بوون. داواکاریە سەرەکیەکانی لێپرسراوانی لێکۆڵینەوە دەربارەی ڕق و یاخی بوونی ڕەشەکان، دیاریکردنی گوژمەیەکی تایبەت و فراوان بۆ ڕیشە کێش کردنی هەژاری، چاککردنی مەرجەکانی فێرکردن و شوێنی نیشتەجێبوون، ئەمە و جگە لەڕاهێنانی هێزەکانی پۆلیس و کارمەندە ئیداریەکان و ترسان لەکۆمەڵگەی ڕەش پێست پشت ڕاست بکەنەوە، جەختیان لەسەر کرایەوە.

بەدانانان بەو ڕاستیەی کە کۆمەڵگەی ئەمریکی، بەڕەش و سپی یەوە تەنها هوشیاری و هاوکاریەکی دوور لەدەمارگیری نەژادی، دەتوانێت ئەم ئەم گرفتە گەورەیە چارەسەر بکات، شێوازی ئاشتیانە و دووربینیان لەجیاتی کردەوە توندوتیژیەکان ـ کەڕێگا چارەیەکی کاتی بوو ـ پێشنیاز دەکرد.

لەگەرمەی ڕاپەڕینە یەك لەدوایەکەکانی نێو شارەکان و جۆش و خرۆشی ڕەشەکاندا، مەرگی ((مارتین لۆتەر کینگ)) کۆسپێکی گەورەی لەبەردەم دەستەبەرکردنی مافی یەکسانی ڕەشەکاندا درووست کرد و دژواریەکانی زیاتر کرد. ئەو لەمانگی ئاپریلی ساڵی ١٩٦٨داو لەشاری مەمفیس لەویلایەتی تەنسی ڕووبەڕووی هێرشێکی چەکداری بوویەوە و کوژرا. ئەم کارەساتە بۆ هەندێ کەس واتای بێ نرخ بوونی سیاسەتی خۆبەدوور گرتن لەبەکارهێنانی تۆبزی و فەلسەفەی نەبوونی توندوتیژی دەگەیاند، بەتایبەتی کەئەم کارەساتە لەکاتێکدا ڕوویدا کە تەنها دوو مانگ بەسەر کوژرانی ((رابێرت کەنەدی)) برای سەرۆك کۆماری پێشوودا تێپەڕی، کە ناوبراو لەلایەن ڕەش پێستەکانەوە لەرادەبەدەر خۆشەویست بوو.

کردەوە توندوتیژیەکان، پێکدادانی خوێناوی لەگەڵ هێزە سەربازیەکان و پشێوی نێو شارەکان، بەکۆتایی هاتنی دەیەی شەست کۆتاییان پێهات. بەڵام ئەو چالاکی و هەنگاوانەی کەلەپێناو بەدەست هێنانی یەکسانیە کۆمەڵایەتیەکان و دابین کردنی مافی شارستانیدا نران، ئەنجامێکی پۆزەتیف و بوونیاد نەرانەیان لێکەوتەوە. کۆمەڵگەی سپی پێستی ئەمریکا دانی بەو ڕاستیەدا نا کەدەمارگیری نەژادی تاچ ئەندازەیەك یارمەتی پەرەسەندنی ئەم گرفتە کۆمەڵایەتیە دەدات کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگە بووەتەوە. چەسپاندنی مافی شارستانی ڕەشەکان و هەنگاوە یاساییەکانی سەردەمی جانسۆن تارادەیەك گرێ کوێرەی ئەم گرفتەی کردەوە و ڕەشەکانی بەشێوەیەکی چالاکانە هێنایە نێو پرۆسە سیاسیەکانەوە.

بەپەرەسەندنی پێداویستیەکانی هەڵبژاردن، زیاتر لەپێشوو ڕەش پێست بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شارەکان، ژمارەیەکیش بۆ نوێنەرایەتی کۆنگرە و هەندێکی دیکەش وەك کارمەندی نیدلری، مافی بەشداریکردنیان لە کاروباری سیاسی پێدرا. دەرگای قوتابخانە و زانکۆکان بەڕووی ڕەشەکاندا کرانەوە، خوێندنی فەرهەنگی نەژادی ڕەش وەك بەشێکی گرنگ و وانەیەکی سەرەکی نێو زانکۆکان دەستنیشان کرا. لەساڵەکانی حەفتا، ژمارەیەکی زۆر لەرابەرانی ڕەش پێست گەیشتنە ئەو باوەڕەی کەپێویستە لەپێنا و چوونە نێو کۆمەڵگەی سپی پێست و بەدەستهێنانی دەسەڵات لە وڵات پشت بەڕێگای یاسایی ببەستن و خۆیان لە پەنابردنە بەرکاری تۆبزی و توندوتیژی بەدوور بگرن. فێرکردنی ڕەشەکان، پەرەسەندنی ئیمکاناتی ئابووری، چاکتربوونی شوێنی نیشتە جێبوون، لەو جۆرە پرۆژانە بوون کە سەرکەوتنێکی بەرچاویان بەدەست هێنا. هەرچەندە دیاردەی دەمارگیری بەتەواوەتی بنەبڕ نەکرا، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ ساڵەکانی ڕابردوو هوشیاری و چالاکی ڕەشەکان دەرفەتێکی باشتری بۆ بەدەست هێنانی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی بۆ ڕەشەکان و بەرقەرارکردنی تەفاهومێکی زیاتر ڕەخساند.

جەنگی ڤیێتنام، دەنگی نارەزایی ژمارەیەکی زۆری ئەمریکییەکانی دژ بەسیاسەتی دەوڵەتەکەیان بەرز کردەوە. ڤیێتنام کەمێشتر بەشێك لەهیند و چین و فەرەنسای پێك دەهێنا، بەشکانی هێزەکانی فەرەنسا بەرامبەر بەڤیێتنام لەساڵی ١٩٥٤ بۆ دوو وڵاتی جیاواز دابەشکرا. دوابەدوای کشانەوەی هێزەکانی فەرەنسا لەڤیێتنام شەڕ لەنێوان حکومەتی کۆمۆنیستی باکوور و حکومەتی باشووردا دەستی پێکرد. ئەوەبوو کەئەمریکای بۆ پشتیوانی کردن لەڤیێتنامی باشوور تارادەیەك دەستی لەنێو کاروباری چین و هیند وەردا، بەڵام تاسەردەمی ((کەنەدی)) هیچ جۆرە بەشداریەکی ڕاستەوخۆی هێزەکانی ئەمریکا لەجەنگی ناوخۆی ڤیێتنامدا نەسەلمێنراوە، تەنها ئەو گروپە نەبێت کەبەناوی ڕاوێژکاری سەربازی لەوێدا جێگیر کران. پاش کوژرانی ((دیم))، ڕژێمی سایگۆن ڕووبەڕووی قەیرانێکی ئاڵۆزتر بویەوە و وەك ((جانسۆن)) دەڵێ، لەسەر ویلایەتە یەکگرتوەکان پێویست بوو، لەپێناو پاراستنی سەربەخۆیی ڤیێتنامدا تێبکوشێ، کەچی پشتیوانیەکی تەواوی لەکۆماری ڤیێتنامی باشوور کرد. گیرۆدەبوونی ئەمریکا لەڤیێتنام بەخێرایی چوارچێوەیەکی فراوانتری بەخۆوە گرت. چارەنوس کەسێکی خستە نێو کۆشکی سپیەوە، کەلەساڵی ١٩٦٤ وەتی : سەرۆك کۆمارێك نابێت ئەگەر بهێڵێت ((ڤیێتنام بەرێگای چیندا بڕوات)). دەوڵەتی ((جانسۆن)) وای دەبینی کەپێویستە ڕێگە لەپەرەسەندنی دەسەڵاتی چین و یەکیەتی سۆڤیەت لەباشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بگرێت. لەهاوینی ١٩٦٤ لەدوای هێرشێکی هێزە سەربازیەکان ڤیێتنامی باکوور بۆ سەر کەشتیەکی جەنگی ئەمریکا لەکەنداوی ((تونکین)) لەنێو خاکی ڤیێتنام، ((جانسۆن)) داوایەکی پێشکەش بەکۆنگرە کرد بۆ ئەوەی بەدەرکردنی بڕیارێك ڕێگە بەدەسەڵاتی جێبەجێ کردن بدات کە بەهەر شێوەیەك بەباشی دەزانێت هێزە سەربازیەکانی ئەمریکا ڕەوانەی ڤیێتنام بکات. دەرکردنی ئەم بڕیارە، دەستی دەوڵەتی ((جانسۆن))ی بۆ هێرشی سەربازی لەڤیێتنام کردەوە. لەساڵی ١٩٦٦ ئەمریکا زیاتر لەدووسەد و پەنجا هەزار سەربازی ڕەوانەی ئەو وڵاتە کرد و لەساڵی ١٩٦٧ ئەم ژمارەیە گەیشتە نیو ملیۆن سەرباز و بوجەیەکی زۆریشی بۆ تەرخانکرد. بەناردنی ئەم هێزانە پێکدادانەکانی ئەمریکا لەڤیێتنام شێوازێکی فراوانتری بە خۆوە گرت، بەڵام پاش چوار ساڵ جەنگی بەردەوام، ئەمریکا نەتوانی ڕژێمەکەی ڤیێتنامی باکوور بڕوخێنێت، نەڕێگە لەهێرشی تۆپخانەکانی ((ویت کۆنگ)) بگرێت. ویت کۆنگەکان ژمارەیەك گوند نشینی ڤیێتنامی باشوور بوون کە لەپێناو خزمەتکردنی وڵاتەکەیان ئامادەی هەموو جۆرە فیداکاریەك بوون. زۆربەشیان جووتیارانی سادە و نەخوێندەوار بوون کە گیانی خۆیان بەهۆی خۆشەویستیان بۆ نیشتیمان بەخت دەکرد. شارەزای بیروباوەڕی کۆمۆنیستی نەبوون و تەنها فێری ئەوە کرابوون کەپێویستە دلێرانە و فیداکارانە لەپێناو ڕزگارکردنی وڵاتەکەیان بجەنگن و بکوژرێن. لێپرسراوانی واشنگتۆن بەدانانان بە یەکپارچەیی جیهانی کۆمۆنیزمدا، ئەگەری شۆڕشی میللی و بەرگری ناوخۆیان

ڕەت کردەوە و تۆبیاڵی ڕاپەڕینەکانی لادێکانی باشوور دەخستە پاڵ ڕژێمی هانۆی و دەوڵەتە زلهێزە کۆمۆنیستەکانی ئەو سەردەمە. هەر ئەندازەش کە لەهێنانەدی ئامانجەکانیاندا ڕووبەڕووی شکست بوونەوە، لەسەر پشتگیریکردنی ڕژێمی سایگۆن و ڕەوانەکردنی سەرباز و چەك و تەقەمەنی بەرەو ڤێتنام زیاتر پێداگیریان دەکرد. بەهۆی تۆپبارانکردنی ڤێتنامی باکوور و تەشەنەکردنی جەنگ بەرەو لادێکانی ڤێتنام، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی مەدەنی ئەو ناوچانە گیانیان لەدەستدا. لەسەردەمی سەرۆك کۆماری ((جانسۆن))دا ژمارەی کوژراوەکانی ئەمریکا گەیشتە بیست و هەشت هەزار سەرباز و لەو کاتەوە نارەزایی سەربازەکانیش دژ بەم باروودۆخە دەستی پێ کرد. شەڕێکی بێ سوود کەوادەردەکەوت هەرگیز کۆتایی نایەت، ئەمریکا لەنێو باروودۆخێکی ئاڵۆزدا ڕووبەڕووی گیروگرفتێکی زۆر کردەوە.

خەڵکی ئەمریکا بەهۆی درێژخایەنی شەڕەکەوە ڕۆژبەڕۆژ نیگەرانتر دەبوون. پەیمانە دارایییەکانی ئەمریکا و ئەو بوجە سەرسوڕهێنەرەی کەلەلایەن دەوڵەتەوە بۆ جەنگی ڤێتنام تەرخانکرا، کۆسپ و تەگەرەیەکی گەورەی لەبەردەم جێبەجێکردنی بەرنامە چاکسازیەکان ناوخۆی ئەمریکادا درووست کرد و شتێکی وەهای بۆ بەرەنگاربوونەوەی فەقیری و گیروگرفتە نەژادیەکان نەدەهێشتەوە. ئەو گوژمەیەی بۆ جەنگی ڤێتنام سەرفکرا، هەڵئاوسانێکی نابووری سەرنج ڕاکێشی بەدواداهات. کە سری بووجەی ئەمریکا کە بەهۆی سیاسەتە ڕووداو خوازیەکانی دەوڵەت لەباشوور و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و هەروەها سەرمایە گوزاریە گەرەو فراوانە دەرەکیەکانیەوە هاتبویە ئاراوە، دۆلاری ئەمریکای ڕووبەڕووی گیروگرفت کردەوە.

ژمارەیەك لەسیاسەتمەدارانی ئەمریکا، جەنگی ڤێتنامیان بەرووبەڕووبوونەوەیەکی بێ هودە دەزانی، کەدەسەڵاتی جێبەجێکردن بەوەرگرتنی ئیختیاراتی بێ سنوور پەرەی پێدا. ئەنجامەکەشی بریتی بوو لەو بەڵێنانەی کە ئەمریکا بە حکومەتی سایگۆنی داو، زیادبوونی ژمارەی کوژراوەکان بەبێ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکرا و مەترسی پڕ چەك بوونی بەرامبەر. سیناتۆر ((فولبرایت))یش یەکێك بوو لەو کەسانەی کەباوەڕی وابوو، ئەمریکا بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە بەرژەوەندیەکی نابووری یان سەربازی لەجەنگی ڤێتنامدا پاڵی پێوە بنێت، بەشداری لەجۆرێك لە خۆکوشتنی سیاسیدا کردوە. لەواقیعدا ڤێتنام وەك ((زەلکاوێکی شەیتانی و کاولکەر)) وابوو کە مۆرفەکان، پسپۆریەتیەکان، بووجەیەکی فراوانی قووت دەدا، لەم جەنگەدا ئەمریکای زلهێز وەك فیلێکی زەبەلاح وابوو لەبەرامبەر سوپایەك مێرووڵەدا کە بەهەموو توانایەوە نەیدەتوانی بەسەر ئەو گیاندارە ((وورد و عەجولانە))دا زاڵ بێت.

لەلایەکی تریشەوە دەنگی نارەزایی لاوانی ئامادە کرد بۆ خزمەتی سەربازی، دژ بەجەنگ بەرزبوویەوە. ئەوان زۆر ڕقیان لەسیستەمی خزمەتی سەربازی دەبوویەوە و خۆیان لەسەربازی بەدوور

گرت و کارتی ڕەوانەکردنیان بۆ شوێنی خزمەتەکانیان لەخۆپیشاندانەکانی دژ بەجەنگدا سوتاند. جەنگی ڤێتنام لەرێگەی کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە خۆی کرد بەماڵی هەموو خێزانێکی ئەمریکیدا. هەر تەلەفزیۆن بوو کە بەبڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی تایبەت بە ڤێتنام، کارەساتەکەی بۆ ناو خاکی ئەمریکا گواستەوە. خۆپیشاندانی گەورە و بەر فراوانی دژ بەجەنگ لەسەرتاسەری ئەمریکادا سەری هەڵدا، ژمارەیەکی زۆر لەئەندامانی چینی ناوەندی کۆمەڵگە بۆ یەکەمین جار ڕژانە سەر شەقامەکانی ئەمریکا. قوتابیانی زانکۆ لەویلایەتی کالیفۆرنیاوە تا نیویۆرك دەستیان بەخۆپیشاندان کرد، ئاشتیخوازان، پشتیوانانی مافی شارستانی ڕەشەکان، لایەنگرانی هەڵوەشانەوەی سیستەمی خزمەتی سەربازی، ئەوانیش [هاوەدەمی و هاوخەمی] خۆیان بۆ خۆپیشاندەران دەوپات کردەوە، لەسیاسەتی دەوڵەتەکەیان کەوتنە گومانەوە و ڕەخنەیان لەبەکارهێنانی هێزی سەربازی حکومەتیان لەپێناو سەپاندنی بیروباوەڕی خۆی بەسەر خەڵکی دیکەدا گرت.

کۆمەڵێکی تر لەلاوانی ئەمریکا، کەرق و قینیان لەبارودۆخی ناوخۆی وولات و پەرەسەندنی جەنگەکان گەیشتبوە بینەقاقە، ڕوویان لەئەمریتی کۆنی پشێوی نانەوە کردەوە. پێکەوە ژیان، گرنگی دان بە ئاینزاکانی ڕۆژهەلات، بەکارهێنانی داودەرمانی بێ هۆشکەر و ڕوو وەرگێران لە کۆمەڵگەی پڕ ناز و نیعمەتیان کردە پیشەی خۆیان.

دەیەی پڕ لەئاژاوە و هەوراز و نشێوی سەختی شەست، سەردەمی دەربڕینی ناڕەزایی بوو. ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر بەجەنگ، نایەکسانیە کۆمەلایەتیەکان، خۆشگوزەرانی مادی، پیس بوونی هەواو سەرچاوە سروشتیەکان، جیاوازی نەژادی و نایەکسانی لەنێوان هەردوو ڕەگەزی [نێر و مێ]، چوارچێوەیەکی فراوانتریان بەخۆ گرت و گۆڕانکاریەکی کەوریان هێنایە ئاراوە.

هەوڵەکانی ژنان لەپێناو یەکسانی کۆمەلایەتی و ئابووری، شێوەی ڕاپەڕینێکی سەرکەوتووی بە خۆوە گرت.

لەساڵەکانی ۱۹۲۰ ژنان بەمافە سیاسیەکانیان گەیشتن و مافی بەشداریکردنیان لەکاروباری وولات پێدرا، زۆربەشیان خۆیان بەئیش و کاری دەرەوەی ماڵ سەرقاڵ کرد. بەسەرهەڵدانی جەنگی دووەمی جیهانی چالاکی ژنان لەبواری کاروباری کۆمەلایەتیدا پەرەی سەند.پیاوان ڕوویان لەبەرەکانی جەنگ کرد و ژنانیش شوێنی ئەوانیان لە کاروبارەکاندا گرتەوە. پاش کۆتایی هاتنی جەنگ و گەڕانەوەی سەربازەکان بۆ سەر پیشەکانیان، چالاکیە کۆمەلایەتیەکانی ژنان تەسك تر بوویەوە و بە گەشەسەندنی باری ئابووری لە پەنجاکان، خۆشگوزەرانی مامناوەندی چینی مامناوەندی کۆمەڵگەش زیادی کردوو بەدابین کردنی دەرامەتی پێویست بۆ خێزانەکان، ژنان چیتر پێویستیان بەچالاکی کۆمەلایەتی نەدەبوو. ژنانی خۆشگوزەران، هیچ جۆرە ئیش و کارێکیان جگە لەماڵداری و

خۆڕازاندنەوە و بەشداریکردن لەدانیشتن و کۆبوونەوەی دۆستانەو گەشت و گوزار نەبوو. هاوکات لەگەڵ خۆشگوزەرانی مادی، گرنگیدان بەنارایشت و جوانی شوێن کەوتنی مۆدی نوێ زیادی کرد. جوانی و ژنیەتی، بوو بەیەکێك لەتایبەتمەندیە سەرەکیەکانی ڕەگەزی مێ لەو سەردەمەدا. قوتابخانە تایبەتیەکان بۆ فێرکردنی چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن دامەزران، شێوازی لەبەرکردنی جل و بەرگ و ئارایشت بایەخێکی ئێجگار زۆری پێدرا. چەندەها کتێبی جۆراوجۆر لەبوارەکانی ڕێو ڕەسمی ماڵداری و میوانداری و هاو سەر گرتن بڵاوکرانەوە. بەدەمەوە بوون و گرنگیدانی ژن بەهاوسەرەکەی بوو بەئەرکی سەرەکی ئافرەتان لەو سەردەمەدا.

ئەدەبیاتی ئەو سەردەمە، جگە لەگرنگیدان بەبێ تاوانی، پاکی و بێ گەردی و ڕوونی لە پیاهەڵدانی دیمەنی سەرنج ڕاکێشی ئافرەت کرد. لەئەنجامدا ژن وەکو بوونەوەرێکی لاواز و ناسکی لێهات کەدەبوو پشتیوانی لێبکرێ و ئەرکی سەرەکی زیاتر خۆ جوانکردن و خۆڕازاندنەوە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پیاوەکان بێت. خوێندنی باڵا لەبەشەکانی زانستی و لێکۆڵینەوەی بەرهەمە بەنرخەکان بۆ ژنان سنووردار کرا. فێرکردن تائەو ئەندازەیە بەپێویست دەژمێررا کە ژن وەك ﴿کانینیکی﴾ نەرم ونیان، دلۆڤان، خاوەن داب و نەریت و پەروەردەکراو پیشان بدات، بەگشتی باوەڕیان وابوو کە ئەگەر چی ژن کۆمەڵە زانیاریەکیش لەمێشکدا گەڵاڵە بووبێت، بەڵام نابێت لەبەرامبەر پیاودا ئەو بیروڕایەی خۆی ئاشکرا بکات، چونکە لەسەرنج ڕاکێشی و شانت و شکۆی کەم دەکاتەوە.

بڵاوبوونەوەی کتێبی ((ئەفسانەی ژنایەتی)) بەرهەمی ((بێتی فریدان)) لەساڵی ١٩٦٣ قەڵەمی بەتاڵبوونەوەی بەسەر هەموو ئەم بیروباوەڕانەدا هێناو کاریگەریەکی گەورەشی لەسەر بەئاگا هێنانەوەی ژنان و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی مافە کۆمەڵایەتیەکانیان درووست کرد. ئەم بەرهەمە سەرنجی تێکڕای ئافرەتانی بۆ نایەکسانیەکا ڕاکێشا. بەگوێرەی ئەو ئامارانەی کەبڵاوکرانەوە، ژمارە ئەو ژنانەی کە لەخوێندنی باڵادا وەردەگیران بەبەراورد لەگەڵ ساڵەکانی ١٩٢٠، تارادەیەك کەم بووبوونەوە، ژمارە ئەو ژنە خاوەن پیشانەی کە لەپیشەگرنگەکاندا بەئەرەی بەرز وەردەگیران بەپەنجەی دەست دەژمێران. بەڕێوەبردنی قوتابخانە و بڕیاردان لەسەر چۆنیەتی کاروبارەکانی فێرکردن لەچوارچێوەی دەسەڵاتی پیاواندا بوو، هەژاری و بێکاری بەتایبەت لەنێو ژنە ڕەش پێستەکاندا زیادی کرد، ئەو ژنانەی کەپیشەکەیان هاوشێوەی پیشەی پیاوان بوو موچەیەکی کەمتریان وەردەگرت. یاسا ویلایەتیەکانیش زۆرجار گیروگرفتیان لێدەکەوتەوە. لەهەندێك ویلایەت ئافرەتان نەیاندەتوانی وەك ئەندامێکی دەستەی تێهەڵچوونەوە (منصفه) لەدادگادا بەشداری بکەن، تەنانەت لەمۆرکردنی گرێبەستەکانی پەیوەندیدار بە کڕینی خانوو زەوی و ئۆتۆمبێل و زۆرێك لەئاڵوگۆڕە داراییەکان بێ بەش دەکران، هەندێك جاریش مافی خاوەندارێتی (مولکداری) خۆیان لێدەسەنرایەوە. ئەو ژنانەش

کەلەچالاکیە سیاسیەکاندا بەشداریان دەکرد زۆرجار ڕوبەڕووی گاڵتە پێکردن دەبوونەوە، پێیان دەوترا باشتر وایە سیاسەت بۆ پیاوان وازی لێبهێنن و خۆتان بەوانە ووتنەوە و فێرکردنەوە خەریك بکەن.

لەدەیەی شەستدا کۆمەڵە هۆکارێکی جۆراوجۆر کاریان بۆ سەرکەوتنی ژنان لەکاروباری کۆمەڵایەتیدا کرد. زیادبوونی هێزی کاری ژنان، بیرۆکەی هەوڵدان بۆ یەکسانی موچەی کارکردن و کۆتایی هێنان بەکرفتی پیشەیی لێکەوتەوە. بەرنامەکانی ڕێکخستنی خێزان و ڕێگەگرتن لە حەملی نەخوازراو، ژنانی لەزۆریەی کۆت و بەندەکان ڕزگارکرد. درووستکردنی دایەنگەو دام و دەزگاکانی تر کە هەلی بەخێوکردنی منداڵەکانی بەدرێژایی ڕۆژ دەستەبەر دەکرد، دەرفەتی کارکردنی بۆ ژمارەیەکی زۆر لەژنان ڕەخساند. ڕاپەڕینی مافی شارستانی ڕەشەکان و خۆپیشاندانی دژ بەجەنگی ڤێتنام، ئەزموونێکی پێویستی لەپێناو ڕێك و پێك کردنی چالاکیەکانی ژنان بەدەست خست. چالاکیەکانی ژنان زیاتر لایەنی فێرکردنی کۆمەڵایەتی و بەرجەستەکردنی یەکسانیان دەگرتەوە. بەرەنگاربوونەوەی بیروباوەڕی پڕوپوچ و دەمارگیریانە کە ژنانی بەئامراز یان کەرەستەیەکی یاریکردن دادەنا، گرنگیدان بەخوێندنەوەی مێژوو و فەرهەنگ ورۆڵی ژن لەکۆمەڵگە، تێکۆشان لەپێناو بەدەست هێنانی یەکسانیە کۆمەڵایەتیەکان، شکڵ و فۆرمێکی دیاریکراوی بەڕاپەڕینی ئازادی ئافرەتان بەخشی.

بڕگەی بیست و حەوتی قانوونی ئەساسی، لەسەر بنەمای یەکسانی تەواوی ژن و پیاو، کە چاوەڕوان دەکرا، لەلایەن کۆنگرەوە بڕیاری لەسەر بدرێت، بەسەرکەوتنێکی گەورە بۆ ڕاپەڕینی ئازادی بەخشی ژنان لەقەڵەم دەدرا.

هاوینی ١٩٦٨ لوتکەی خۆپیشاندانەکانی دژ بەجەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە نەژادیەکان بوو. جەنگی ڤێتنام کە ناڕەزاییە ناوخۆییەکانی خەلکی ئەمریکای بەدوادا هات بۆ خودی ((جانسۆن)) کارەساتێکی گەورەبوو. بەچڕکردنەوەی کردەوە سەربازیەکانی ئەمریکا لەڤێتنام، متمانەی خەلکی ئەمریکا بەسەرۆك ((جانسۆن)) کەمبوویەوە و لەئەنجامدا و لەکاتی نزیك بوونەوەی وادەی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦٨ کاتێك کەناویراو خۆی دەیزانی چانسی سەرکەوتنی دووبارەی زۆر کەمە، کەنارگیری خۆی لەکێبڕکێکانی هەڵبژاردن ڕاگەیاند. دیوکراتەکانیش ((هەمفری))یان ـ کەجێگری سەرۆك کۆمار بوو لەبەرامبەر پاڵێوراوی کۆماریخوازەکان ((ڕیچارد نیکسۆن)) ـ بۆ پۆستی سەرۆکایەتی کاندید کرد. بەکوژرانی ((کینگ)) لەبەهاری ١٩٦٨، شۆڕشی ڕەشەکان لەشارەکاندا زیاتر پەرەی سەند. لەم لاشەوە ((ڕابێرت کەنەدی))بەدرووشمی ئاشتی لێك تێگەیشتنی نەژادی، چالاکیە سیاسیەکانی خۆی بۆ بەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکان دەست پێکرد. بەڵام مەرگی لەناکاو بواری نەدا ـ پاش دوومانگ بەسەر کوژرانی کینگدا ـ لەکالیفۆڕنیا کوژراو، ئەم کارەساتەش لەکاتێکدا بوو کە چەندەها هەزار لاوی ئەمریکی بەتاسەوە چاویان بڕیبوویە ئەو ساتەی کەهەواڵی سەرکەوتنی کاندیدکراوەکەیان بدرێت

بەگوێیاندا. هەڵبەت ئەگەری سەرکەوتنیشی لەئارادا بوو. نیگەرانی لاوان، گروپە ئاشتیخوازەکان و ڕەشەکان زیادی کرد و پێکهێنانی کۆبوونەوەی حیزبی دیموکرات لەهاوینی ١٩٦٨ لەشیکاگۆ، شێوە پێکدادانێکی نێو شەقامەکانی بە خۆوە گرت. خۆپیشاندانە خوێناویەکەی شیکاگۆ بوژیانی دیموکراتەکان کۆتایی پێهات و سەرکەوتنی ((نیکسۆن))ی لەهەڵبژاردنەکان لێکەوتەوە.

سیاسەتی (نیکسۆن))، کۆتایی هێنان بەجەنگی سارد. یەکلایکردنەوەی مەسەلەی ڤێتنام بوو. هەروەها کەمکردنەوەی ژمارەی سەربازەکای ئەمریکا لەبەرەی ڤێتنام و پشتگیریکردنی دەوڵەتی سایگۆن بەمەبەستی درێژەدان بەوادەی جەنگ، بەرنامەی کاری داهاتووی حکومەتی پێك دەهێنا. هاوکات لەگەڵ بەردەوامبوونی گفتوگۆکان لەپاریس لەپێناو ڕاگرتنی جەنگ و ئاشتی ڤێتنام، ((هێنری کی سینجیر))ی وەك ڕاوێژکاری کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی، کاری نەخشە دارێژانی سیاسەتی دەوڵەتی پێسپێردرا. پلانەکەی ((کی سینجیر)) بۆ سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا واتای کۆتایی هێنان بەجەنگی ساردی دەگەیاند. گۆڕانی سیاسەتی نێو دەوڵەتی و گۆڕانکاریەکانی دیکەی ساڵەکانی شەست، زیاتر لەجاران پێویستی بەناسینی ڕاستیەکان هەبوو. لەدەیەی شەستدا سیناتۆر ((فولبرایت)) کەنەرکی سەرۆکایەتی کۆمیتەی پەیوەندیەکانی دەرەوەی سنای پێ سپێررابوو، زیاتر لەهەر کەسێکی تر لەهەوڵی بەدواداچوونی هۆکارەکانی تێوەگلانی ئەمریکا لەجەنگی ڤێتنامیدا، بەرەخنەگرتن لەسیاسەتی دەرەوەی وولاتەکەی، ئەوپەڕی خزمەتی لەپێناو هۆشیارکردنەوەی میللەتەکەی لەسەر ڕاستیەکانی جەنگ پێشکەش کرد.

((فولبرایت)) هەمیشە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ((پێویستە لەگەڵ ڕاستیە جیهانیەکاندا ڕووبەڕوو ببنەوە، کە ئەمەش دەری دەخات کەهیچ شتێك بەشێوەیەکی باش یان خراپی ڕەها، بوونی نیە.)) بیرۆکەی یەکپارچەیی دونیای کۆمۆنیزم، پێشنیازی پلانی نێو دەوڵەتی بۆ دەست بەسەرداگرتنی جیهانی بەبیرۆکەیەکی بەتاڵ زانی و، باوەڕی وابوو کەدونیا کۆمۆنیزم لەزۆربەی لایەنەکانەوە دابەش بووە، لەبەر ئەوەی زۆربەی میللەتەکانیش لەپێناو گەیشتن بەبەرژەوەندیەکانیان تێدەکۆشان و دانیان بە ڕابەرایەتی مۆسکۆدا نەدەدا، ((فولبرایت)) ئامۆژگاری دەکرد کەپێویستە سوود لەبارودۆخەکە بۆ چاککردنی پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان وەربگرێت.

((کی سینجیر)) بەناوی دارێژەری سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاوە، دانی بەم ڕاستیانەدا نا : ((ئاشتی و ئارامی جیهانی پێویستی بەهاوکاری هەیە، ئەمریکا لەمەیدانی سیاسەتی دەرەوەدا، سەرکردایەتیەکی ڕەهای نیەو دەبێت لەڕێگەی گفتوگۆ و هاوکاریەوە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکان بدرێت)). لەسەفەرەکەی ((نیکسۆن)) بۆ چین لەساڵی ١٩٧٢ هەنگاوێکی گەورە بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی و کۆتایی هێنان بەگیروگرفتەکانی سەردەمی جەنگی سارد بوو. بەرقەرارکردنی پەیوەندیە

سیاسەکان لەگەڵ چین و وەرگرتنی ئەو وڵاتە لەنێو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان گەورەترین کۆسپەکانی سەر ئەم ڕێگایەی لابرد.

هاوکات لەگەڵ ئەم سیاسەتە نوێیە، کۆمەڵێك گۆڕانکاری نوێ لەئەورووپای ڕۆژئاوا، کاریگەریان لەسەر چەسپاندنی ئاشتی و نزیك کردنەوەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەبوو. ((ویلی برانت)) سەرۆك وەزیرانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بەسەفەر کردن بەرەو هەندێك لەووڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات، بەرەسمی دانیان نا بەحکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و بەرقەرارکردنی پەیوەندیە بازرگانیەکانی لەگەڵ بلۆکی ڕۆژهەڵاتدا، توانی لاری و ناکۆکیەکانی ئەوسای ناوچەکە پشت ڕاست بکاتەوە. لەم لاشەوە گەشتەکەی ((نیکسۆن)) بەرەو یەکیەتی سۆڤیەت، بەمەبەستی سنووردارکرنی چەکی نەتۆمی و کەمکردنەوەی کێبڕکێ سەربازیەکان، هاوکاری نێوان هەردوو لای زیاتر کرد.

دەوڵەتەکەی ((نیکسۆن)) لەڕووی سیاسەتی دەرەوەیدا زۆر سەرکەوتوانە کاری کرد. دانانی بەراستیەکان جیهانی پاش جەنگ، جەختکردنەوە لەسەر پێکەوە ژیانی ئاشتیانە، یەکلایکردنەوەی جەنگی ڤێتنام لەساڵی ١٩٧٣ ئەو ڕووداوانە بوون کە کۆتاییان بە سەردەمی جەنگی سارد هێنا.

هەرچەندە ((نیکسۆن)) لەڕووی بەڕێوەبردنی کاروباری ناوەوەی وولاتەکەیدا زۆر سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لەدەیەی حەفتادا، هەموو ئەو گێروگرفت و نارەزاییانەی کە سەرتا سەری ئەمریکایان گرتبوویەوە، پشت ڕاست کرانەوە. مافی شارستانی ڕەشەکان دانی پێدا نرا، کۆششی ژنان لەپێناو یەکسانیە کۆمەڵایەتیەکان جەختی لەسەر کرایەوە و پشتیوانی لێکرا و خۆپیشاندانەکانی دژ بەجەنگیش کۆتاییان پێهات. نارەزاییانی دەیەی شەست بۆیان دەرکەوت کەباشترین شێواز بۆ گۆڕینی ڕەوشی کۆمەڵایەتی هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری لەڕێگەی یاساوە و بەم میتۆدە تارادەیەك توانیان بەئەنجامێکی گونجاوتر بگەن. پێشکەوتنی بەرچاوی ڕەش پێستەکان لەکاروباری سیاسیدا، گروپە یاخیبووە ڕەش پێستەکانی خستە چوارچێوەیەکی تەسك ترەوە و بەگرنگیدان بەچاککردنی باری خانووبەرە و خۆشگوزەرانی گشتی، نارەزاییەکانی خەڵکی کەمتر بوویەوە.

گرفتی سەرەکی ((نیکسۆن)) لەبواری ناوخۆدا، ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کەسانە بوو کە ڕەخنەیان لەپەرسەندنی دەسەڵاتی دەزگای سەرۆك کۆماری و ئیختیاراتەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەگرت و ئەو شێوازەیان بەتەواوەتی بەپێچەوانەی قانوونی ئەساسی دەزانی. دەوڵەتی ((نیکسۆن))یش دروشمی ((ڕێسا و یاسا))ی وەك چەك و ئامرازێك بۆ دامرکاندنەوەی نەیارەکانی بەرز کردەوە و دەزگا سیخووڕیەکانی ئەمریکای بۆ بەدواداچوونی ئەو گومان لێکراوانە ئاراستە کرد و، بەڕێکخستنی پشك و بەناوی ((پێڕستی دوژمنان)) دژایەتی خۆی بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بەهەر شێوەیك دەیانەوێ

دژایەتی سیستەمە بەهێزەکەی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆی ئەمریکا بکەن، ڕاگەیاند. ((ڕێسا و یاسا))کەی ((نیکسۆن)) واتای کوژاندنەوەی نەیاران، نیشکار کردنی مافی شارستانی تاکەکان و لەواقیعدا پێشێلکردنی ئازادیە تاکەکەسیەکانی دەگەیاند. بەڕای ناوبراو، دەوڵەت دەسەڵاتێکی سنووورداری هەبوو، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە ئیختیارەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لەسەردەمی ئەودا زیادی کرد.

بەناوی پارێزەری ئاسایشی نەتەوەییەوە، سوئیستیفادەی لەدەسەڵاتەکەی کرد و کۆنگرێس و دەسەڵاتی دادوەری پشت گوێ خست. پاش ماوەیەك لەسەر ڕووداوەکەی ((واتر گیت)) لەساڵی ١٩٧٤ ناچار بەدەست لەکار کێشانەوە کرا و ئەمەش بۆ یەکەمین جاربوو لەمێژووی ئەمریکادا کە دەوڵەتێك بەو شێوەیە دەسەڵاتەکەی کۆتایی پێ بهێنرێت.

زۆرینەی خەڵکی ئەمریکا سیاسەتی دەرەوەی ((نیکسۆن))یان ڕێز لێدەگرت و بەپەسەندیان دەزانی. ئەو دووەمین دەورەی سەرۆکایەتیەکەی بەسەرکەوتنێکی ئاسان لەهەڵبژاردنەکاندا دەست پێکرد، بەڵام بەهۆی ئەو بارودۆخەی کە خۆی و هاوکارەکانی هێنایانە ئاراوە، ناچار بەوازهێنان لەکورسی دەسەڵات کرا. ژمارەیەك لە هاوکارەکانی ناوبراو کە لەنێو کۆمیتەی دووبارە هەڵبژاردنەوەی ناوبراوداکاریان دەکرد، بەمەبەستی کەشفکردنی بەرنامەکانی داهاتووی ڕکابەرەکەی، دەستێکیان لەسەنتەری حیزبی دیموکرات لەباڵەخانەی ((واتر گیت)) لەواشنگتۆن وەشاند. چۆنیەتی ڕووداوەکە لەلایەن پاسەوانی باڵەخانەکەوە ئاشکرا کرا و پاش بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەیەکی بەردەوامی دوو پەیامنێری ((واشنگتۆن پۆست)) ڕاستی و درووستی ڕووداوەکەیان ڕوون بوویەوە. دەرکەوت کەهەڵسوڕێنەرانی دەسەڵاتی سەرۆك کۆماری و پیاوانی کۆشکی سپی و خوودی نیکسۆنیش بەشداریان لەپەردەپۆشکردنی ڕووداوەکەی ((واتر گیت))دا کردووە. پاش ئەوەی ڕووداوەکە خرایە بەردەستی کۆنگرێس، بەشداربوونی ((نیکسۆن)) بەتەواوەتی سەلمێنرا و بەپێی قانوونی ئەساسی، کۆنگرێس بڕیاری دادگایی کردنی و لەسەر کار لابردنی ناوبراوی دەرکرد. لەژێر کاریگەری ئەم بارودۆخەدا، نیکسۆن دەستی لەکار کێشایەوە و جێگرەکەی ((جراڵد فۆرد)) بۆ تەواوکردنی ناوەندی سەرۆکایەتیەکەی شوێنی گرتەوە. گۆڕان و ئاڵوگۆڕکردنی دەسەڵات هیچ جۆرە ئاژاوە و یاخی بوونێکی بەدوادانەهات و ئاڵۆزی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بەو مەرجانەی کە لەقانوونە ئەساسیدا پێشبینی کرابوو، کۆتایی پێهات. ئەزموونی ((فۆرد)) چەند ساڵ خزمەتی دوورودرێژ بوو لەنێو ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکادا. ڕووبەڕووی دیاردەکانی وەك ڕەگەز پەرستی، بێکاری، نرخ هەڵئاوسان، قەیرانی ووزە و کێشەکانی دەرەوەی وولات بوویەوە و هەرچەند لەماوەی ئەو دووساڵەی سەرۆکایەتیەکەیدا نەیتوانی خۆی وەك سەرکردەیەکی بەهێز بەخەڵکی ئەمریکا بناسێنێت، بەڵام بەڕاستەوی و ڕاستگۆیی

خۆی، بیّ متمانەیی هاولاّتیانی بۆ دەسەلاّتی جێبەجێکردن کەمکردەوە، بەهاوکاری ((کی سینجێر))، سیاسەتی ڕابردووی حکومەت بۆ پاراستنی ڕەوشی هەنووکەیی وولاّت درێژەی پێدرا.

سالّی ۱۹۷٦ ڕوخسارێکی نویّ و بیّ ناونیشان لەمەیدانی سیاسەتی ئەمریکادا دەرکەوت. ئەو ((جیمی کارتەر)) حکومڕانی پێشووی ویلایەتی جۆرجیا. خەلّکی باشووردا، کە چالاکیەکی بەربلاّوی لەپێناو بەدەستهێنانی پێویستی سەرۆك کۆماری ئەنجام دا. سیاسەتی بەڕێوە بردنی حکومەتی لەسەر بنەمای ڕاستی، پاکی، بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خەلّك، جێبەجێکردنی پلانە چاکسازیەکان بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتە نەژادیەکان، بێکاری، هاوکاری نێوان زلهێزەکان لەڕووی سیاسەتی دەرەوەدا، ڕەنگ ڕێژی کرد.

دەیەی شەست ، سەردەمی گۆڕانکاریە کۆمەلاّیەتیەکان بوو. ئەزموونە تالّەکەی ڤێتنام و قەیرانە نێو ئەتەوەییەکان، بوو بەهۆی ئەوەی لەسیاسەتی هاوکاری و تەفاهومی نێوان زلهێزەکان، شوێنی سیاسەتی کێبرکێی سەردەمی جەنگی سارد بگرێتەوە. هەرچەندە لەدەیەی حەفتادا، ئەمریکا، گرفتە کۆمەلاّیەتیەکانی قەیرانی ووزە و نەبوونی سەرکردەیەکی لێهاتوویی تەجروبە کرد. بەلاّم پێکهاتە سەرەکیەکانی کۆمەلّگە، بەرووداني جەنگی ڤێتنام، کوژرانی سەرۆك کۆمار، زیادەڕۆیی کردنی دەسەلاّتی جێبەجێکردن لەبەکارهێنانی هێز و ئیختیارەکانی [وەك ناوی بیرێك کە هەرگیز ڕەشەبا شەپۆلی تێدا درووست ناکات] بەهێز و بتەوبیانەوە. بەپێچەوانەوە، ئەم ئەزموونانە، کۆمەلّگەی ئەمریکای هۆشیارتر کردەوە، بۆ ئەوە واقیعبینانەتر سەیری گۆڕانکاریەکانی جیهان بکەن. ((کارتەر)) سەرۆك کۆماری دیموکراتی ئەمریکا لەسالّی ۱۹۷۷ بەدواوە ئەرکی سەرۆکایەتی کۆماری گرتە ئەستۆ، پێناسەی ئەم روحیە نویّ یەیە: بەرێزگرتن لەبەها کۆمەلاّیەتیەکان، هاوکات لەگەلّ پابەندبوون بە سنووردارپوونی دەسەلاّت، سوور بوو لەسەر پاراستنی بنەماکانی دیموکراسی ئەمریکا و پابەندیش بوو بەبەرقەرارکردنی ئاشتی و ئارامیەوە لە جیهاندا. ((ڕینۆلّد نیبور)) فەیلەسوفی ئەمریکی جارێکیان ووتبووی : ((میللەتانی زیادە خواز، هەمیشە لەگەیشتن بەئامانجەکمیان بەجیّ دەمێنن.)) وا دەردەکەوێت کەئەم وولاّتە، بەو ئەزموونانەی کەلەم سالاّنەی کۆتاییدا بەدەستی هێناوە، ئەو ڕاستیەی بۆ سەلمابێت و بەتێڕوانینێکی نوێوە ڕووبەڕووی گرفتە جیهانیەکان بۆتەوە.

مارتین لۆتەر کینگ

جۆن کەنەدی لەکاتی دەست بەکاربوونیدا

# سەرچاوەکان

**ناوی ویلایەتەکگرتووەکان ئەمریکا بە پێی مێژووی دانپێدانانیان:**

١- ویلەر ١٧٨٧
٢- پەنسیلڤانیا ١٧٨٧
٣- نیو جێرسی ١٧٨٧
٤- جۆرجیا ١٧٨٨
٥- کنتیکت ١٧٨٨
٦- ماساچوسێتس ١٧٨٨
٧- مریلەند ١٧٨٨
٨- کارۆلینای باشوور ١٧٨٨
٩- نیوهەمپشایەر ١٧٨٨
١٠- ڤیرجینیا ١٧٨٨
١١- نیویۆرک ١٧٨٨
١٢- کارۆلینای باکوور ١٧٨٩
١٣- رۆدئایلەند ١٧٩٠
١٤- ڤێرمۆنت ١٧٩١
١٥- کنتاکی ١٧٩٦
١٦- تەنسی ١٧٩٦
١٧- ئۆهایۆ ١٨٠٣
١٨- لوئیزیانا ١٨١٢
١٩- ئیندیانا ١٨١٦
٢٠- می سی سیپی ١٨١٧
٢١- ئیلینویز ١٨١٨
٢٢- ئالاباما ١٨١٩
٢٣- مین ١٨٢٠
٢٤- میسۆری ١٨٢١
٢٥- ئارکانزاس ١٨٣٦
٢٦- میشیگان ١٨٣٧
٢٧- فلۆریدا ١٨٤٥
٢٨- تەکزاس ١٨٤٥
٢٩- ئایوا ١٨٤٦
٣٠- ویسکۆنسین ١٨٤٨
٣١- کالیفۆرنیا ١٨٥٠

٣٢- مینه سوتا ١٨٥٨
٣٣- ئۆرگۆن ١٨٥٩
٣٤- کانزاس ١٨٦١
٣٥- ڤیرجینیای رۆژئاوا ١٨٦٣
٣٦- نوادا ١٨٦٤
٣٧- نبراسکا ١٨٦٧
٣٨- کۆلۆراۆ ١٨٧٦
٣٩- داکۆتای باکوور ١٨٨٩
٤٠- داکۆتای باشوور ١٨٨٩
٤١- مۆنتانا ١٨٨٩
٤٢- واشنگتۆن ١٨٨٩
٤٣- ئایداهو ١٨٨٩
٤٤- ڤلیرمینگ ١٨٩٠
٤٥- یوتا ١٨٩٦
٤٦- ئەکلاهما ١٩٠٧
٤٧- نیومە کزیکۆ ١٨١٢
٤٨- ئاریزۆنا ١٩١٢
٤٩- ئالاسکا ١٩٥٩
٥٠- هاڤایی ١٩٥٩

**ناوی سەرۆك و جێگرەکانی کۆماری و ویلایەتەیەکگرتووەکان:**

١- جۆرج واشنگتۆن ١٧٨٩ – ١٧٩٧
جۆن ئادامز
٢- جۆن ئادامز ١٧٩٨ – ١٨٠١
تۆماس جفرسۆن
٣- تۆماس جفرسۆن ١٨٠١ - ١٨٠٩
ئاروون بار
جۆرج کلینتۆن
٤- جیفر مدیسۆن ١٨٠٩ – ١٨١٧
جۆرج کلینتۆن
ئیدریج گەری
٥- جیفر مۆنرۆ ١٨١٧ - ١٨٢٥
ئامپینکز
٦- جۆن کۆینسی ئادامز ١٨٢٥ – ١٨٢٩
جۆن کلهۆن
٧- ئاندرۆ جەکسۆن ١٨٢٩ – ١٨٣٧

جۆن کلهۆن

مارتین ڤان بورن

٨- مارتین ڤان بورن ١٨٣٧ – ١٨٤١

ریچارد جانسۆن

٩- ویلیام هارسیۆن ١٨٤١ – ١٨٤١

١٠- جۆن تیلەر ١٨٤١ – ١٨٤١

١١- جیمز پولك ١٨٤٥ – ١٨٤٩

جۆرج دالاس

١٢- زاخاری تیلەر ١٨٤٩ – ١٨٥٠

میلارو فیلمۆر

١٣- میلارو فلیمۆر ١٨٥٠ – ١٨٥٧

١٤- فرانکلین پیرس ١٨٥٣ – ١٨٥٧

ویلیام کینگ

١٥- جیمز بوکانان ١٨٥٧ -١٨٦١

جۆن برکریج

١٦- ئابراهام لینکلین ١٨٦١ – ١٨٦٥

هانیبال هاملین

ئەندرۆ جانسۆن

١٧- ئەندرۆ جانسۆن ١٨٦٥ – ١٨٦٩

ویلیام سی وارو

١٨- یوسیس گرانت ١٨٦٩ – ١٨٧٧

کلفاکس

هێنری ویلسۆن

١٩- راتفۆردهیز ١٨٧٧ – ١٨٨١

ویلیام ویلەر

٢٠- جیمز گارفیلد ١٨٨١ – ١٨٨١

چستەر ئارکوور

٢١- چستەر ئارکور ١٨٨١ – ١٨٨٥

٢٢- گرۆر کلیولەند ١٨٨٥ – ١٨٨٩

هەندریك

٢٣- بنجامین هاریسۆن ١٨٨٩ – ١٨٨٩

لوی مۆرتۆن

٢٤- گرۆر کلیولەند ١٨٩٣ – ١٨٩٧

ئدلای ئستیڤنسۆن

٢٥- ویلیام مەك کینلی ١٨٩٧ – ١٩٠١

گارت هوبارت

تیۆدۆر رۆزملت

٢٦- تیۆدۆر رۆزملت ١٩٠١ - ١٩٠٩

چارلز فەیر بنکس

٢٧- ویلیام تافت ١٩٠٩ - ١٩١٣

جیمز شرممن

٢٨- ڤدرۆ ویلسۆن ١٩١٣ — ١٩٢١

کوماس مارشال

٢٩- ڤارن هاردینگ ١٩٢١ — ١٩٢٣

کالوین کۆلیج

٣٠- کالوین کۆلیج ١٩٢١ — ١٩٢٩

چارلز داوز

٣١- هربرت هوور ١٩٢٩ - ١٩٣٣

چارلز کرتیس

٣٢- فرانکلین رۆزفلت ١٩٣٣ — ١٩٤٥

جۆن گارگانەر

هێنری ڤالاس هەری ترومن

٣٣- هەری کردمن ١٩٤٤ - ١٩٥٣

ئامن بارکلی

٣٤- دوایت ئایزنهاوەر ١٩٥٣ — ١٩٦٣

ریچاردنیکسۆن

٣٥- جۆن کەنەدی ١٩٦١ — ١٩٦٣

لینرۆن جانسۆن

٣٦- لینرۆن جانسۆن ١٩٦٣ — ١٩٦٣

هوبرت هنفری

٣٧- ریچاردنیکسۆن ١٩٦٩ — ١٩٧٧

ئسپرۆ ئاگونیو

جرالد فۆرد

٣٨- جرالد فۆرد

جۆن راکفلەر

٣٩- جیمی کارتەر ١٩٧٧

ڤالتەر ماندل

٤٠- رۆنالد ریگان

٤١- جۆرج بۆش (باوك)

٤٢- بیل کلنتۆن

٤٣- جۆرج بۆش (کوڕ)

٤٤- دیك چینی.

# پەراوێزە ئینگلیزییەکان


Aaron, Daniel. <u>Men of Good Hope</u>. New York, 1951.

Aaron, Daniel; Hofstadter, Richard; and Miller, William. <u>The Structure of American History</u>. 2nd ed., Englewood Cliffe, N. J., 1974.

Adams, Henry. <u>The Education of Henry Adams</u>. 3rd ed., Boston, 1961.

Alperovitz, Gar. <u>Atomic Diplomacy</u>. New York, 1965.

Andrews, C. M. <u>The Colonial Period of American History</u>. 4 vols, New York, 1934-38.

Arnold, Matthew. <u>Civilization in The United States</u>. Boston, [illegible].

Arnold, Thurman. <u>The Folklore of Capitalism</u>. New Haven, 1937.

Bailyn, Bernard. <u>The Ideological Origins of The American Revolution</u>. Cambridge, Mass., 1973.

---------------. <u>The Origin of American Politics</u>. New-York, 196[illegible].

Banner, James M., Jr; Bernstein, Barton; and Hackney, Sheldon. eds., <u>Understanding The American Experience</u>. 2 vols., New York, 197[illegible].

Beard, Charles. <u>An Economic Interpretation of The Constitution</u>. rev. ed., New York, 1962.

Beard, Charles and Mary. <u>The Rise of American Civilization</u>. 2 vols., New York, 1927.

Bell, Daniel. <u>The Coming of Post Industrial Society</u>. New York, [illegible].

-----------. ed., The Radical Right. New York, 1962.

Bellamy, Edward. <u>Looking Backward</u>. New York, 1888.

Blum, John M. et al. eds. The National Experience. 3rd ed., New York, 1973.

Boorstin,Daniel. The Americans. 2 vols., New York, 1953.

--------------.The Genius of American Politics.Chicago, 1953.

Borden,Martin. ed., America's Eleven Greatest Presidents. Chicago, 1971.

Boyd, Maurice; and Worcester D. American Civilization. 2nd ed., Boston, 1969.

Brogan, D. W. The American Character. New York, 1944.

Bryce, James. The American Commonwealth. 3rd ed.,2 vols., New York, 1901.

Chafe, William. The American Woman. New York, 1972.

Commager, Henry Steele. The American Mind. New Haven, 1950.

--------------------. and Nevins, Allen. A Short History of The United States. 5th ed., New York, 1966.

Cooke, Alistair. A Generation on Trial. New York, 1950.

Corey, Lewis. The House of Morgan. New York, 1930.

Curti, Merle. Growth of American Thought. New York,1943.

Daly, Charles, ed. Urban Violence. Chicago, 1969.

Davis, Allen F. Spearheads for Reform. New York, 1965.

-------------. and Woodman H. Conflict and Consensus in American History. 2 vols. 4th ed., Lexinton,Mass., 1976.

Davis, David Brion. The Problem of Slavery in The Age of Revolution 1770-1823. Ithaca, 1975.

----------------. The Problem of Slavery in Western

Culture. Ithaca, 1966.

Degler, Carl. Out of Our Past. Rev. ed., New York, 1970.

------------. et al. The Democratic Experience. 3rd ed., Glenview, Ill., 1973.

Diggins, John P. The American Left in The Twentieth Century. New York, 1973.

Dickens, Charles. American Notes. London, 1842.

Fine, Sidney, Brown G., eds. The American Past. 2 vols., New York, 1970.

Fitzgerald, Frances. Fire in The Lake. New York, 1972.

Flexner, Eleonor. Century of Struggle. Cambridge, Mass., 1959.

Foner, Eric. Tom Paine and Revolutionary America.Oxford, 1977.

Franklin, John Hope. From Slavery To Freedom. 3rd ed., New York, 1967.

Friedan, Betty. The Feminine Mystique. New York, 1963.

Friedel,Frank. The New Deal in Historical Perspective. Washington D. C . , 1953.

Gaddis, John Lewis. The United States and The Origin of The Cold War, 1941-47. New York. 1972.

Galbraith, John Kenneth. The Affluent Society. Boston, 1958.

-----------------------. The Great Crash, 1929.New York, 1953.

Genovese, Eugene D. The Political Economy of Slavery. New York, 1967.

------------------. Roll Jordan Roll, The World Slaves

Made. New York, 1976.

-------------. The World The Slaveholders Made. New York, 1971.

Glazer, Nathan, Moynihan D. P. Beyond The Melting Pot. Cambridge, Mass., 1963.

Goldman, Eric. Rendezvous With Destiny. New York, 1952.

Goodwin, Richard. The American Condition.New York,1975.

Graham, Otis L., Jr.ed; Perspectives on 20th Century America. New York, 1973.

Griffith, Robert. The Politics of Fear. New York, 1970.

Halberstam, David. The Best and The Brightest. New York, 1972.

Handlin, Oscar. The Uprooted. 2nd ed., Boston, 1973.

--------------. ed. This Was America. New York, 1964.

Hartz, Louis. The Liberal Tradition in America. New York, 1955.

Higham, John. Strangers in The Land. New York, 1955.

Hofstadter, Richard. Age of Reform. New York, 1956.

------------------. American Political Tradition.New ed., New York, 1973.

-------------------. "Turner and The Frontier Myth". American Scholar, XVIII (Fall, 1949), 433-43.

Hoopes, Townsend. The Devil and John Foster Dulles. Boston, 1973.

Josephson, Matthew. The Robber Barons. New York, 1934.

Kennan, George F. American Diplomacy,1906-1950.Chicago. 1953.

Kolko, Gabriel. Main Currents in Modern American His-

tory. New York, 1976.
----------.The Triumph of Conservatism: A Reinterpretation of American History 1900-1916. New York, 1963.
Labaree, Leonard W. Conservatism in Early American History. 6th ed., Ithaca, 1972.
LaFeber, Walter. The New Empire. Ithaca, 1971.
Laski, Harold J. The American Democracy. New York,1948.
Lasch, Christopher. The New Radicalism in America. New-York, 1965.
-----------------. The World of Nations. New York, 1974.
Lerner, Max. America as a Civilization. Vol. 1, 10th ed., New York, 1957.
Leuchtenburg, William. Franklin D. Roosevelt And The New Deal 1932-1940. New York, 1963.
--------------------. ed., The Unfinished Century: America Since 1900. Boston, 1973.
Link, Arthur. Wilson The Diplomatist. Baltimore, 1957.
Lukacs, John. A New History of The Cold War. New York, 1966.
Lynd, Robert and Helen. Middletown: A Study in Modern American Culture. New York, 1929.
May, Ernest R. The World War and American Isolation 1914-1917. Cambridge, Mass., 1959.
May. Henry. The Enlightenment in America. Oxford, 1976.
Mead, Margaret. And Keep Your Powder Dry: An Anthropologist Looks At America. New York, 1942.
Miller, J. C. The Federalist Era. New York, 1960.
Miller, Perry. Errand Into The Wilderness. Cambridge,

Mass, 1956.

-------------. The New England Mind: The Seventeenth Century. Cambridge, Mass., 1953.

Miller, William. A New History of The United States. 3rd ed., New York, 1968.

Moore, Laurence. ed., The Emergence of An American Left: Civil War To WWI. Ithaca, 1973.

Morgan, Edmund S. The Birth of The Republic. Chicago, 1956.

O'Neill, W., and Gardner L. Looking Backward, A Reintroduction to American History. New York, 1974.

Parrington, Vernon. Main Currents in American Thought. 3 vols., New York, 1927.

Patterson, James T. America in The Twentieth Century. New York, 1976.

Perkins, Frances. The Roosevelt I Knew. New York, 1946.

Perlman, Selig. A Theory of The Labor Movement. New York, 1956.

Perry, Ralph Barton. Characteristically American.Boston, 1949.

Peterson, Merrill. Thomas Jefferson and The New Nation: A Biography. New York, 1970.

Pierson, George. Tocqueville and Beaumont in America. New York, 1938.

Potter, David M. People of Plenty. Chicago, 1954.

Reich, Charles A. The Greening of America. New York,1971.

Reies, David. Korea: The Limited War. New York, 1964.

Report of The National Advisory Commission on Civil Dis-

order. Otto Kerner, Chairman. Washington, D.C. 1968.

Riesman, David. The Lonely Crowd: a Study of The Changing American Character. New Haven, 1950.

Rossiter, Clinton. The American Presidency. New York, 1956.

Ryan, Mary P. Womanhood in America. New York, 1975.

Schlesinger, Arthur M., Jr. Age of Jackson. Boston,1945.

------------------------. A Thousand Days: John F. Kennedy in The White House. New York, 1965.

------------------------. The Vital Center. New York, 1962.

------------------------. "Origins of The Cold War", Foreign Affairs, XLVI, (Oct., 1957),22-52.

Shannon, William V. "Eisenhower As President: A Critical Appraisal of The Record", Commentary, XXV, (Nov., 1958) 380-98.

Spanier, John. American Foreign Policy Since World War 11. 6th ed., New York, 1973.

Stampp, Kenneth. The Peculiar Institution. New York,1956.

Therstrom. Stephan. Poverty and Progress. Cambridge, Mass., 1964.

Tocqueville, Alexis, de .Democracy in America. 2 vols, New York, 1954.

Turner, Fredric Jackson, The Frontier in American History. New York, 1920.

Ulam, Adams. The Rivals: America and Russia Since WW11. New York, 1971.

Welter, Barbara. The Woman Question in American History.

Hillsdale, Ill., 1973.

White, Morton. Social Thought in America. New York,. 1949.

Williams, William Appleman. the Roots of the Modern American Empire. New York, 1970.

------------------------. the tragedy of American Diplomacy. New York, 1972.

Woodward C. Van. ed., The Comparative Approach To American History. New York, 1968.

---------------. Strange Career of Jim Crow. 2nd rev. ed., New York, 1966.

Zinn, Howard. ed., New Deal Thought. Indianapolis, 1966.

تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
سەرەتای دۆزینەوەی ئەمریکا لەلایەن
گەشتیارە ئەورووپییەکانی وەك
کریستۆف کۆلۆمبز، دواتر کۆچکردن و
نیشتەجێبوونی بەلێشاوی خەڵکە
ئەورووپییەکانی لێکەوتەوە، بەرەو ئەم
سەرزەوییە پان و بەرینە، جگە لە
پەیداکردنی سەروەت و سامان و
بەرژەوەندی، هەڵگری کۆمەڵێك بیر و
بۆچوون و ئایدیای نوێ و جیاواز بوون و
توانیان بە تێپەڕبوونی کات و زیادکردنی
ژمارەی دانیشتووانی و قەتلوعامکردنە
نەیتیڤەکانی (سووربێستەکان) و
پەیڕەوکردنی سیستەمی کۆمەڵایەتی.
شوێن پێی خۆیان بۆ بڵاوکردنەوەی
بۆچوونەکانیان پتەو کرد. بەم شێوەیە و
بە داڕشتنی کۆمەڵێك یاسا و ڕێسای
دیاریکراو و بەکارهێنانی عەقڵ و ژیری و
بە پشت بەستن بە ئایدیاکانی دەرەوە،
دواتر سەقامگیریی ئابووری و سیاسی و
گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی لێکەوتەوە و
بناغەی کۆمارێکی تازەبونیادیان داڕشت.
دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی
موکریانی
MUKIRYANI
Establishment for Research & Publication